بەیارمەتی کۆڕی زانیاریی کورد ئەم جزمە لەچاپدرا

جزمی سێهەم
لە

# فەرهەنگی خاڵ

نوسراوی
شێخ
محمدی خاڵ

١٣٩٦ هجری ـ ١٩٧٦ میلادی

به یارمەتی کۆڕی زانیاریی کورد لە چاپ درا

جزمی سێهەم
لە

# فەرهەنگی خاڵ

نوسراوی
شێخ
## محەمەدی خاڵ

١٣٩٤ ك ١٩٧٤ ز

چاپخانەی کامەرانی ــ سلێمانی

چاپی یەکەم



ئەمن ئەمرم بەڵام وێنەم ئەمێنێ
هیوام وایە کە خۆشی گەل ببینێ

محمدی خاڵ

# پێشکەشکردن

پێشکەش بێ بە پێشگاهی گەلی کورد بۆ هەموو هۆزو تیرەو، خێڵ و ئێڵ و بنەچەورەگەزو نەتەوەو بەرەیەکیەوە، وە بەپیاوو ژن و کوررو کچو گەورەو بچووکو خوێندەوارو نەخوێندەوارو مردو زیندویەوە نەخوازەلا خوێندەوارانی ئێمڕۆولاوانی پاشەڕۆژ کە هیوای هەموو لایەکمانن، هیوادارم کە بە دڵێکی پاك و گیانێکی ڕووناك و هەستێکی چاکەوە ئەم فەرهەنگەم بە دیارییەکی نۆبەرە لێوەربگرن.

- محەمەدی خاڵ -

# بە ناوی خوای گەورە

## پیتی قاف

## [ ق ]

( قاپ ) قاپ .

( قابـلەمە ) مەنجەڵۆکەیەکە کە سەروقنکی وەك یەك وابێ .

( قابلەمەکردن ) گرتنەوەی پشت بە کاڵای کۆنا ، گرتنی خشتی سوور بەپانی وە لەسەرشان بە ڕووی دیواری خشتی کاڵا .

( قابوور ) ز . بنەکوزەی شکاو.

( قاپ ) دەفری چێشت تێ کردن. قولەپێ . مێیچ . قەپاڵ . چوارچێوە [د] . سەری سەعات: قاپی سەعاتەکە داخە .

( قاپ ئاویژ ) قاپاویژ .

( قاپارکە ) قولەپێ .

( قاپان ) د . قاپێن .

( قاپانە ) قاپێن .

( قاپاویژ ) کەسێکە لە ڕۆیشتنا قولەپێی قاچی لە یەك بدا .

( قاپچی ) د . دەرکەوان .

( قاپقاپ ) پێڵاوێکی سەرپێیی دارینی بەرزە چەرمێکی باریکی بە سەرەوەیە پێی پیانەکرێ .

( قاپك ) د . ئاوسانی قولەپێ .

( قاپکزینە ) گیـایەکی بەهاریی کەڵا وورده بە کوڵاویی ئەخورێ .

( قاپکرتن ) بریتییە لە بەکژا-چوونی یەکێك بەیەکێکدا بەناڕەوا .

( قاپلۆخ ) د . قاپوورر .

( قاپۆرر ) قەواغی فیشەکی بۆش

( قاپوقاچاخ ) بە هەموو جـۆرە دەفرێکی ناومالی ئەووترێ .

( قاپووت ) سەربەرگێکی زستانیی ئەستووری ئاودامانە . فەرەنجـی ئاودامان .

( قاپووتکردن ) بریتییە لەگرتنی سەدو بیست [ سـایە ] لە یاریی

ئەسکەملدا .

( قاپوورر ) شتێکە ناوەکەی دەرهاتبێ و بە بۆشی مابێتەوە .

( قاپوولە ) قولەپێ .

( قاپ هاوێژ ) قاپاوێژ .

( قاپەررەقە ) قولەپێ .

( قاپەکەوەلە ) ھ . قەیتەران .

( قاپێن ) یاریی کردن بە هێچ .

( قاپێوان ) قاپییوان .

( قاپیی ) دەرکا .

( قاپییوان ) کەسێکە کە ئاکاداریی قاپی بکا بۆکردنەوەو داخستنی .

( قاپیەوان ) قاپییوان .

( قات ) نهۆمی خانوو: ئەمخانووە دوو یا سێ ( قات ) ە . توێ : ئەم بۆیە کارییە دوو ( قات ) ە . یاد : ئەم فاسۆنە دوو قاتە واتە دوو بادە . دەستێکی تەواو لە کالاّ یا نوێن : [ قات ] ێك بەرگم دروست کرد واتە دەستێك . شتێکە کە دەست نەکەوێ : ئیمسال برنج [ قات ] ە .

( قاتر ) ئیستر .

( قاترچی ) کەسێکە کە قاتر لێ بخورێ .

( قاتغ ) ز. شیر و ئەوشتانەی کە لە شیر دروست ئەکرێن .

( قاتقات ) زەمینی تەم تەم .

( قاتمە ) قانکلە .

( قاتوقرر ) کاتێکە کە دانەوێڵەی سالی کۆن نەمابێ و هی سالی تازەش پێنەگەیی بێ .

( قاتوقرریی ) نەمانی زەخیرەو خوار دەمەنیی .

( قاتوقەیماغ ) پەلوولەیەکی چەوری شیرینە بۆزەیستان ئەکرێ . جۆرە پەڵوویەکەئەخرێتە سەربرینو شوێنی بە ئێش .

( قاتۆڵیی ) دۆشاوی هەنار .

( قاتە ) قەڵداسی دارروجان .

( قاتە لێوە ) خاکە لێوە .

( قاتەو لێوە ) قاتە لێوە .

( قاتیی ) سالی کووری بێدەغڵو دان . ئاوێتە : قاتیی کە ، واتە تێکەلی کە .

( قاتیی و قرریی ) قاتوقرریی .

( قاچ ) پێ . بەرد [ز] . بەردێکە کە یاری قاچێنی پێئەکرێ .

•( قاچاخ ) شتێکه باجی دەوڵەتیی بەسەرەوە بێ‌ولەبەر ئەوە بە دزیی‌یەوە بفرۆشرێ . کامێشی سێ‌ساڵانە .
•( قاچاخچی ) کەسێکە کە شتی قاچاخ بکررێ و بفرۆشێ .
•( قاچـان ) مەردومی جرپنی بزێو . قاپێن .
( قاچاندن ) دەربازبوون : فیسار کەس [ قاچاند] ی واتە دەربازبوو .
•( قاچاو ) شوێنێکی بەرزە کە ئاوی پێوە ڕاناوەستێ .
( قاچك ) خێزەرە [ز] . قارچك.
( قاچوقول ) لەئەژنۆ بەرەوخواری مەردوم .
( قاچوقووچ ) دزیی بە فرروفێڵ، [ قاچو قووچکردن ] دزیی کردن بە فرروفێڵ .
( قاچێن ) هەلمەقۆ .
( قاچیی ) قەیچیی .
( قاچیین ) د. هەڵپاچیین بە قەمچیی .
( قاخ ) د . شتی چەوتاوە .
( قاخلیی ) کاخلیی .
( قادێ ) ز . مەیدان .
( قار ) . دەوی فەقێیان (ز) . قیین . مووچەیەکە هەموو ڕۆژ بدرێ بە هەژاران .
( قارپچۆك ) ز. مەردوومی زۆر لاواز .
( قارپۆز ) د . قەڵپووس .
( قارچ ) قارچك .
( قارچك ) شتێکی ناسکی نێرك داری سـەرپانی پەررە پەررەیە لە بەهارانـا هەڵ ئەتۆقێ لە دار و لە زەوییو لە گیا ، وە ئەخورێ .
( قارچکەکولانە ) قارچکەمارانە
( قارچکەمارانە ) جۆرەقارچکێکە ناخورێ .
( قاررراندن ) قاررە کردنی مەررو بزن .
( قاررگە ) سەرشار لە یاریی دا .
( قاررنان ) دەستەیەکە لەیاریی [ قەلەمرداریێ ] دا کە درەنگ تێ بکەوێ .
( قارروووفووررر ) قاررە قارری زۆر.
( قاررونە ) د. کرمی ناومیوەی ووشکەوە بوو .
( قاررە ) دەنگی بارەی بزن و

مەڕ ، [ قاررە قارر ] قاررەی یەك لە دوای یەك .
( قاررێن ) یاریی قەلەمرداریّ .
( قارژنگ ) د . قرژانـگ .
( قارس ) کەسـێکە لە شـتێك وەرس بێ : بە دووکەلی جکـەرە
[ قارس ] م . شـوێنێکە لە کالاّ کە هەلدراوێ بۆ کورت بوونەوەی .
( قارسبوون ) سەغلەت بوون .
( قارسکردن ) سەغلەتکردنی یەکێك . کورت کردنەوەی کالاّی درێژ بە نوشتاندنەوەو دروونی .
( قـارقار ) ز . دەنگی بەرزی کیاندار .
( قارقارۆك ) ز . قارپچۆك .
( قارنج ) د . بابۆلەپێچ .
( قارووشە ) ز . گەسکی پووش.
( قاروونە ) د . مۆرانە .
( قارەمـان ) مەردومی جوامێری ئازا .
( قارەوانە ) قەرەوانە .
( قاز ) مەلێکی گەورەی مل درێژی دەندووك پانی پێ پەرەداری مەلەوانە لە مراویی گەورەترە .

( قازاخ ) جوان . پاك .
( قازان ) مەنجەلی گەورە .
( قازانج ) سوودێکە لە کرریین و فرۆتنەوە دەست بکەویّ .
( قازانج [ بەنیوەیی ] کرریین و فرۆختنی دوو کەس یا زیاترە بەسەر مایەی هەر دوو لایانەوە بۆ ئەمەی کە قازانج بکەن بەدووبەش یازیاتر.
( قازانجکردن ) دەسـکەوتنی قازانج .
( قازانچە ) مەنجەلۆکە .
( قازانقولفی ) د . ئێرومێ یەکەکە یەخەی پێ دائەخریّ .
( قازانگ ) قازان .
( قازانە سەر ) د . مەلێکی چنکداری بەهێزە ، سەری مەلی تری پێ هەل ئەکەنێ .
( قازلاّخ ) د . قازلاّخیی .
( قازلاّخیی ) بالندەیەکی کێوییە لە چۆلەکە گەورەترە لە سەرەتای بەهارا دەرئەکەویّ .
( قـازم ) ز . بەنێکە کە لە کورك و خوریی ڕێسرابیّ .
( قازمانە ) هەلووژە .

( قازمەکیی ) جۆرێکە لە بەری دارمازوو وەك دەنکە تەزبیح وایە

( قازەوان ) شوانی قاز .

( قازیاخە ) گیایەکی بەهاریی کەڵا پانە بە کوڵاویی ئەخورێ .

( قازی قوڵنگ ) د. قوڵنگ .

( قاژ ) باڵندەیەکە وەك قەلەرەش بەڵام ئەم گۆشتی ئەخورێ . برۆ [ ل ] .

( قاژر ) د . کرێنۆك .

( قاژقاژە ) کەندەسمە .

( قاژوو ) قاژ .

( قاژە ) دەنگی قاژووی زۆر ، [ قاژە قاژ ] قاژەی زۆر . دەنگی کوللە [د] .

( قاژیی ) قاژوو .

( قاسپە ) دەنگی خوێندنی کەو [ قاسپە قاسپ ] قاسپەی یەك لە دوای یەك .

( قاسك ) لاسك .

( قاسناخ ) دەفرێکە لە تەختە دروست ئەکرێ و دانەوێڵەی پێ ئەپێورێ .

( قاش ) پارچەیەك لە مێوەی بە چەقۆ لەت کراو . شەقە مێو . بەردێکی بە نرخە کە لە زێرر یا لە زیو گیرابێ .

( قاشاخ ) جۆرە لەوەرێکە لە کەنگر ئەچێ [د] . بنجی کەنمەشامی یەکە کولەکەی لێ کرابێتەوە .

( قاشاو ) هێنانی پەرروێ زبری تەڕ بەسەر ئەندامی وولاخی یەك سما دوای ررنەك کردنی .

( قاشقاش ) شتی کووز کووز .

( قاشقونجی ) ئافرەتی جرپنی بێشەرم .

( قاشکردن ) لەتکردنی مێوە و هێندێ شتی تر بە قاش .

( قاشم ) ز . گیایەکی بۆنخۆشە .

( قاشنە ) جۆرە ماسی یەکە پوولەکەی زەردی رەقی پێوەیە .

( قاشۆ ) دارێکە کە یاریی [ قاشوان ]ی پێ ئەکرێ . شەقەمێو .

( قاشوان ) شەقێن .

( قاغەز ) کاغەز .

( قاغەنەك ) ل . فرۆ .

( قاف ) ناوی پیتێکە لەبیستو حەوت پیتەی کوردیی . هەل : لە

[ قاف ] داکرتم واتە لە هەلا .
( قافقلۆز ) ز . قاپ و قاچاخی کلیین .
( قافك ) ز . سواڵەت .
( قافکردن ) گرتنی مەردوم بۆ سەربازیی .
( قافلە ) کارولن .
( قافوو ) ز . دارێکە کە لافاو بیهێنێ .
( قاقەرەش ) ز . جۆرەکوولەکە یەکی رەش باوە .
( قاق ) د . ووشك .
( قاقا ) دەنگی پێکەنینی بەرز . کاکە [د] . ووتەیەکە منال بە خواردنی ئەڵێ [ با ] .
(قاقلە جنۆکە) هێلکە شەیتانۆکێ .
( قاقلە سۆنە ) قاقلە سوێنە .
( قاقلە سوێنە ) قەپانچەرە .
( قاقم ) سەمووری سپیی .
( قاقوم ) قاقم .
( قاقە ) د . قاقا .
( قاقەز ) شتێکی تەنکی سپی لووسە لە لۆکە یا پووش دروست ئەکرێ بو لێ نووسینی .

( قاقیشك ) ز . قاژوو .
( قاکەز ) کاغەز .
( قاڵ ) شتی پوخت بوو : ئەم رۆنە یا ئەم پیاوە ( قاڵ )ە ، واتە پوختە . قوولە [ د ] .
[ قالآخ ] ز . تەپاڵەیەکە لەپاش شێلان پانکرابێتە بۆ سووتەمەنی .
( قالآخیی ) د . کراسی رەش .
( قالآخیی پۆش ) د . رەشپۆش .
( قالان ) ز . شیربایی .
( قالانقۆزیلێ ) ه . کولێکی زۆر سووری بەهارییە لەکولەباخ ئەچێ بەڵام ئەم پچووکترە .
( قالآو ) قەلەرەش .
( قالآوە بوولیینە ) د . قەلەرەش .
( قالآیی ) د . قەلآیی .
( قالب ) جەستە . پارچە زەویی یەکە کە بە بەیار هێڵرابێتەوە بۆ داچەندنی مەرەزە . چوارچێوەیەکە شتی تیا دابرێژرێ وەك قالبی خشت .
( قالبوون ) پووخت بوون و دەرهاتنی مەردوم .
( قاڵتاخ ) قەڵتاغ .
( قاڵدرمە ) پێ پیلکە .

( قـالس ) مەردوومـی وەررس
[ قالسبوون ] وەررسبوون ،
[ قالسکردن ] وەررس کردن .
( قالسیی ) سەغلەتیی .
( قالك ) ز . توێکلی کوێزو شتی
تر . قاووغ .
( قالکردن ) پوختەوزرنگ کردنی
رۆن .
( قالماسك ) قۆچەقانی .
( قالۆ ) ز . خشتێکە لەسەرئاگر
دائەنرێ و نانی پێئەبرژێنرێ .
( قالۆچە ) قالۆنچە .
( قالۆر ) قاپوور . ساقی گیایەکە
کە کلۆربێ .
( قالۆرە ) لاسکی چاوبازە .
( قالۆنچە ) دەعبایەکی رەشی
چنگ چنگە کەلـێ جـۆری هەیە ،
هێندێکیان بالدارو هێندێکیان بێ بالن .
( قاله ) د . باررەی بزن .
( قاله ) قسەی زۆر لەگەل دەنگ
بەرز کردنەوەدا : فیسارکەس کردی
بە ” قاله ] یا بە [ قاله ] ی دەم
ترسـانی ( قاله قال ) قالەی یەك
لە دوای یەك .

( قاله قنگ ) د . کالاّ قنگ .
( قالیی ) ژێرەخەرێکی تەنراوی
تووکنی بە نرخە .
( قالییچە ) قالیی پچووك .
( قام ) مقام .
( قامچێ ) چەرمێکی هۆنراوەیە
لە مەردومی پێئەدرێ .
( قامك ) ئەموست .
( قـامییش ) گیایەکی رەقی
ئەستووری قەنقەفی ناو کولۆری
بالاّبەرزی کەلاّ پانە . بریتییە لە
چووکی ئادەمی .
( قامییش بەند ) رییزی قامییشی
رێکی چنراو .
( قامییشەلاّن ) شوێنێکە کە
قامییشی زۆری تیا رِوابێ .
( قامیشی شەکر ) جۆرە قامیشێکە
شەکری لێدروست ئەکرێ .
( قان ) شتێکە کە لەخوێنییە کێکا
بدرێ . پووتیی توور .
( قانتر ) ز . ئێستر .
( قانچە ) کوێسوانە .
( قانزاج ) قازانج .
( قانزاج بەنییوەیی ) قازانج بە

نیپوەیی .

( قانزاج کردن ) قازانج کردن .

( قانـگ ) خەربەنـگ [ د ] . پوویتی توور .

( قانگـدان ) دووکەڵ کردن بە کز شتێکا . جارێك یاریی کردنەوە لە کەل کەسێکا کە دۆرراندبێتی .

( قانکلە ) بەن و دەزوویەکە لە سەر پەنجە گەورە و پەنجە تووتەی دەست هەڵکرابی . دارێکی لووت دارە باخەوان لقی درەختی بەرداری پێ ڕائەکێشێتە خوارەوە .

(قانکە) خەندەق دانەوەی دیوارو شتی تر : قانکەی خانۆکەی داوەتەوە .

( قانکەڵە ) قانکلە .

( قانە ) قەدێکی قوماشە لە قەدی کارخانەی . یارد [ د ] .

( قاو ) پووشوو . دەنگ و باسێکە کە بڵاو بووبێتەوە .

( قاوتاندن ) ز . قاودان .

( قاو داخستن ) بڵاو کردنەوەی دەنـگ و باسێك .

( قاودان ) دەرکردن .

( قاوکردن ) بانـگ کردن بە دەنگی بەرز .

( قاولەمە ) د . قابلەمە .

( قاووت ) ئاردی دانەوێڵەی برژاو.

( قاوورر ) قاپوورر .

(قاوورمە) گۆشتی سوورەوە کراو بۆ هەڵگرتن .

( قاووغ ) قاپوورر .

( قاووقریشك ) قیژو هووررو دەنگە دەنـگ .

( قاوو قوو ) د . قاوە قاو .

( قاووقیژ ) قاوو قریشك .

(قاوە) بەری گیایەکی گەرمیانی بە دەنگی خڕ و سەوزە لە دوای برژاندنو کوتانی لێ ئەنرێ بۆ خواردنەوە .

( قاوەبرێژ ) د. دەفرێکی تایبەتی یە قاوەی تیا ئەبرژێنرێ .

( قاوەتوون ) قاوەلتیی .

( قـاوەتیی ) نان خـواردنی نیپوەڕوان .

( قاوەجاخ ) شوێنێکە کە قاوەی تیا لێ بنرێ .

( قاوە جۆش ) کومکومەی قاوە .

( قاوەچیی ) کەسێکە کە هەر قاوە لێ بنێ .
( قاوەخانە ) شوێنێکە کە قاوەی لێنراوی تیا بفرۆشرێ .
( قاوەدان ) تێکردنی قاوە بۆ خواردنەوەی .
( قاوەسینی ) سینییەکی تای بەتییەقاوەی لەسەر ئەگێررێ.
( قاوە قاو ) بانکە بانگ .
( قاوەڵتوون ) قاوەڵتیی .
. ( قاوەڵتی ) قاوەتیی .
( قاوەیی ) شتێکە کە رەنگی لە رەنگی قاوەی برژاو بچێ .
( قای ) ز . پیتی پرسیار .
( قایخ ) جۆرە بەلەمێکە لە ئاوا پێی ئەپەررنەوە .
( قایخەوان ) کەسێکە قایخ لێ بخوررێ .
( قایغ ) قایخ .
( قایغەوان ) قایخەوان .
( قایش ) چەرمی خۆشکراوی رەنگ کراوی کویرەکەو پارێن .
( قایم ) شتی بەهێز .
( قایمکار ) کەسێکە کە شت قایم و باش هەلگرێ .
(قایمکردن) توند کردنی شت . شاردنەوەی شت : شتەکانت [ قایم کە ] .
( قایم نوێژ ) کەسێکە نوێژی نەچێ .
( قایمە ) خۆکۆکردنەوەو ئامادە بوون بۆشتێك : فیسارکەس خەریکی [ قایمە ] یە . کاتی تەنگانە : زەخیرەکە هەلگرە بۆ [ قایمە ] . زوربەی شت: [قایمە]ی لە شەکرەکە هاتووە . یاساو دەستوورێکە لە یاریی‌دامەو شەترنجا کە هیچ لایەك نەی بەنەوە .
( قایمەکاریی ) هەلگرتن و قایم کردنی شت .
( قایمەکردن ) قایمەکاریی .
( قایمیی ) توندیی و بە هێزیی شت .
( قبراخ ) یەکێکە کە بکەوێتە ناوەندی دووکەسەوە بۆیەك خستنیان « واسطة » .
( قت ) فت : لە یاریی کۆرەوییی بازییدا ئەووترێ ئەم کۆرەوییی یە

[ قت ] ، [ قتبوون ] فت بـوون له یارییدا ، [ قتکردن ] فت کردن له یارییدا .
( قتاو ) د . کتێب .
( قتاوخانه ) د . قوتابخانه .
( قتوفت ) د . جووله جوول .
( قجیو ) کیایه‌کێ که‌لا ووردی هه‌میشه‌یی‌یه له قه‌دشاخی نم دار ئه‌رروێ، بنجه‌که‌ی زۆر به‌که‌لکه بۆ ژانی [ اێهاتن ] .
( قجییلك ) په‌نجه تووته .
( قجییله ) جۆره کوولله‌یه‌که .
( قخ ) ووته‌یه‌که منالی ساوای پێ ئه‌گێررێته‌وه له‌دەست بردن بۆ شتی پیس .
( قخه ) قخه .
( قخه ( قخ )
( قده قد ) قرته قرتی مریشك .
( قدبلکانی ) خووتووکه دان .
( قدبلکه ) قدیلکانی .
( قدبیك ) ز . دل ته‌نـگ بوونی مه‌ردووم .
( قدبیله ) قدیلکه .
( قر ) ز . زوقم

( قراج ) ز . زه‌وییه‌که کیای تیا نه‌ررواییێ یا تیا رروابێ‌و ئاژال خواردبێتی .
( قراقر ) ز . قرره قرر .
( قراش ) د . قاشـــی شـت ، [ قراش قراش ] شـتی قاش قاش .
( قربووز ) ز . که‌سێکه که ریشی ماش و برنج بووبێ .
( قرپ ) تالآن ، [ قرپکردن ] تالآن کردن . خه‌رج کردنی پاره‌و به‌کارهێـنانی خوارده‌مه‌نی زیاد له ئه‌ندازه: فیساره ژن ده‌ستی به‌قرپه .
قررقێنه . ده‌سکه‌نه کردن [ د ] .
لق و پـۆپ کردنی دار ( د ) .
قرمه‌ی داری شکاو (د) .
( قرپاندن ) هه‌لپاچیین .
( قرپنه ) خرپنه .
( قرپۆك ) مێووژی ووشکه‌ل. قرر بۆق .
( قرپۆل ) مێووژی ووشکه‌ل .
( قرپه ) د. ده‌نکی شکانی دار.
( قرپێنه ) قررقێنه .
( قرت ) د . مه‌ردومی جلفن .
( قرتاله ) قه‌رتاله .

( قرتان ) پچڕرانی شت بەهۆی لێکەوتنی شتێکەوە .

( قرتـاندن ) بڕینی شـت بە قەیچی یا بە شتێکی تر . شکاندنی قەزوان و دەنکە کوولەکە بە دان بۆ دەرهێنانی ناوکەکەی. قرتەقرتکردنی مریشك .

( قرتانن ) د . قرتاندن .

( قرتکردن ) بڕینی شتێك بە خشتیی وەك مووی ئەگرییجەوسەر. قرخ کردنی موو [د] .

( قرتکە ) د . پارچەیەکی پچوکە لە شتی قرتاو .

( قرتماخە ) د . قەتماغە .

( قرتە ) دەنگی مریشکە بە کرر. جۆرە دەنگێکە وەك دەنگی داخستنی قرتێنە ، [ قرتەقرت ] قرتەی یەك لە دوای یەك [ قرتوهوورر ] قرتە قرتی زۆر .

( قرتە لێبڕیـن ) بڕیتییە لە نەهێشتنی شتێك : وولاخەکە [ قرتەی لە ئالیکەکە بڕی ] .

( قرتیان ) د . قرتان .

( قرتێنکە ) قرتێنە . ئاوەخۆرەی مریشك و کەڵەشێر کە لە کاتی سەربڕینا چەقۆی پیا ئەهێنرێ .

( قرتێنە ) دوگمەیەکی نێرومێیە ، ئەچێ بەیەکاو قرتەی لێوە دێ . شتێکی رەقی تەنکە لە ڕەگی ووشکەوەبوو یا ئێسقان کە قەڵەمی قامیشی لەسەر ڕێك ئەکرێ .

( قرتییل ) پاشا خورر .

( قـرچ ) لێدانی تییل کەری دوو هەم لە دەسکەلای تییل کەری یەکەم لەیاریی [ مووشێـن ] دا کاتێ کە یەکەم مووشی نەخواردبێ. چرچ [د] . رۆنی قرچاو .

( قرچاندن ) داخکردنی رۆن لەسەر ئاگر .

( قرچانن ) د . قرچاندن .

( قرچاننەوە ) برژاندنەوەی بریین.

( قرچاو ) رۆنێکە لەسـەر ئاگر داخ کرابێ .

( قرچوبرێژ ) د . قرچوهووری شت لەسەر ئاگر .

( قرچۆك ) دارو بەن و دەزووی ناقایم . مەردومی چرووکی پیسکە.

( قرچۆل ) شتی ووشـکەوەبووی

چرچ بوو .

( قرچۆلە ) د . قرچۆل .

( قرچە ) دەنگێکە وەك دەنگی شکاندنی دارو برژاندنی برنشکە لە سەر ئاگر ، [ قرچە قرچ ] قرچەی یەك لە دوای یەك ، [قرچوهوورر] قرچە قرچی زۆر . گەنم و جۆی دروەوە .

( قرچە شکێن ) پەلخوردبوونی کرشەی خەرمان بە گێرە .

( قرچ هەلاتن ) چرچ هەلاتن .

( قرچیان ) د . هەلقرچان .

( قرح ) ز . نەنگی هەموشتێك.

( قرخ ) کۆزمو کووپەیەکە لەبەر ئاو زۆر تێکردنی لووس بووبێ . تووکی سەرو ریشێکە کە زۆر کورت کرابێتەوە . مەردومی لەررو لاوازی قرچۆل . ئاوی ویستاوی لیبخن .

( قرخاندن ) قرخەکردن .

( قرخکردن ) لە بنە کۆتەرە دانی مووی ئەندام .

( قرخن ) گیاندارێکە کە زۆر بقرخێنێ . قرخ (دد) .

( قرخنە ) قرخن .

( قرخۆل ) د . قرخن .

( قرخۆلە ) د . قرخن .

( قرخە ) دەنگێکە لە گەرووی گیاندارە وە دێ لەکاتێکا کەشتێکی تێ گیرابێ ، [قرخە قرخ] قرخەی یەك لە دوای یەك ، (قرخوهوورر) قرخە قرخی زۆر .

( قرخەمەرەسیی ) راکێشانی یەکێك بەزۆرو لە دوونەچوونی .

( قردیلە ) تیلمە تەنراوێکی جوانە کچان ئەیدەن لە مووی سەریان دوای داهێنانی بۆ ئەوەی تێك نەچێ .

( قرر ) مەرگی تێکڕرایی .

( قرراك ) قەلەرەش .

( قرراکە ) بالندەیەکی سەوزەبە قەد ( قژاکە ) یەك ئەبێ .

( قررالێ ) ه . گوێزێکی پووچەلە کە بە دارەوەبێ .

( قرران ) ناوە بۆجۆرە دراوێکی زیبوبین ، قرربوون .

( قرراندن ) قررەکردنی قەلەرەش. بریتی یە لە نوقلانەی خراپ: بۆمان

[ مەقررێنە ] وانە نوقلانەی خراپمان بۆ لێ مەدە .
( قررانن ) د . قرراندن .
( قررباق ) قرربۆق .
( قررۆق ) بۆق .
( قرر بزون ) مردنی گیاندار بە کۆمەڵیی و زۆریی .
( قررپۆك ) قرپۆك . قرربۆق .
( قررپۆل ) قرپۆل .
( قررتی خستن ) کوشتاری تێکرایی .
( قررتێکەفتن ) د . قررتێ کەوتن .
( قررتێکەوتن ) قررکەوتنە ناو گیاندارەوە .
( قررقرروۆك ) قوورقووراگە .
( قررقرره ) کندری بەکرە . چەرخی پچووك .
( قررقێنە ) بایەکە لە دەروونەوە هەڵ ئەقوڵێ و بە دەنگەوە لە دەم دێتە دەرەوە .
( قررك ) ز . قوورك .
( قرركردن ) قررتێخستن .
( قررناتە ) پارچەیەکە لە پارچەی مۆزیقە .
( قررنوو ) گەنە .
( قررنە ) قررنوو .
( قررنی ) قررنوو .
( قرروواق ) بۆق .
( قرروقەپ ) بێ دەنگی و قسە نەکردن .
( قرروقەپۆز ) ووتەیەکە لە رووی سووکی یەوە ئەووترێ بە دەم و پلی یەکێکی ناشیریین .
( قرروونیەمقرر ) کالایەکە ژنان ئەی پۆشن چیین چیینەوهەرچیینەی لە جۆرێکە .
( قرره ) هەراو دەنگە دەنگ . دەنگی قەل و بۆق ، [ قررەقرر ] قررەی یەك لە دوای یەك . دواهەمیین کەس کە سەرەی بێیە سەر .
( قررهاتن ) قررتێ کەوتن .
( قررێژ ) با . کررێش .
( قرژاڵ ) دەعبایەکی ئاویی چنگ چنگێ رەقی دووسەرە .
( قرژانگ ) قرژاڵ .
( قرژە ) جۆرێکە لە بەری دار مازوو دەباخی پێ ئەدرێ .
( قرسان ) تەخمیین .

( قرساندن ) ز . ترنجاندنی شتێك له ناو شتێکی‌ترا .

( قرش ) ز . پووشی هه‌ڵ وه‌ریو . لق و پۆپی دره‌خت که له خۆیه‌وه هه‌ڵوه‌ریی بێ .

( قرشه ) کرشه .

( قرقرتوك ) کرر کرراکه .

( قرك ) ز . قوررك . قه‌له‌ره‌ش .

( قرم ) د . مرخ : [ قرم ] ی لێ‌خۆشکردووه .

( قرماندن ) خوررین به ده‌نگی به‌رز له یه‌کێك : تێی قرماند .

•( قرمز ) تال .

•( قرمزیی ) شتێکه که ره‌نگی قرمزبێ .

( قرمژن ) ده‌نگی ته‌قوهووړری چه‌ك به زۆریی .

( قرمه ) ده‌نگێکه وه‌ك ده‌نگی شکانی داری گه‌وره به کرده‌بڕریی ، [ قرمه قرم ] قرمه‌ی یه‌ك له‌دوای یه‌ك [ قرموهوورر ] قه‌رمه قرمی زۆر .

( قرمچی ) با . شتێکه که‌سییس بووبێ .

( قرنجان ) رووشـان و برینه‌دار بوونی شت .

( قرنجاندن ) رووشـاندن و بڕیینه‌دار کردنی شت .

( قرنجانن ) قرنجاندن .

( قرنگه ) ده‌نگێکه وه‌ك ده‌نگی [ خرنگه ] [قرنگه قرنـگ] قرنگه‌ی یه‌ك له دوای یه‌ك [ قرنکوهوورر ] قرنکه قرنگی زۆر .

( قریپك ) با . سێ‌شه‌شی به‌هار .

( قریژ ) چلك . شتی چلکن[ز] .

( قریژاهیی ) ز . قریژ .

( قریشکه ) ده‌نگێکه له قییـژه گه‌وره‌تر ، [ قریشکه قریشك ] قریشکه‌ی یه‌ك له دوای یه‌ك ، [قریشکوهوورر] قریشکه قریشکی زۆر .

( قرین ) ز. جه‌نـگ‌ودەم قالیی .

( قرییواندن ) قرییوه‌کردن .

( قرییوانن ) قرییواندن .

( قرییوه ) ده‌نگێکی به‌رزه که له خۆشی‌یه‌وه په‌یا ببێ ، [ قرییوه قرییو ] قرییوه‌ی یه‌ك له‌دوای یه‌ك.

( قرییوه کردن ) قرییواندن .

( قزکە ) شوێنێکە یەکەم جار
کۆی [ شەقێن ] ی لێ دائەنێن و
بەدار لێ ی ئەدەن .
•( قزە ) ترسنۆك . ژنانی .
( قژ ) مووی درێژی سەر .
کەفی شت [د] .
( قژاکە ) باڵندەیەکی دەنوك
درێژی سەر رەشی بەرسنگ سپی یە
بە قەد کۆترە بارییکەیەك ئەبێ .
( قژاڵکە ) قژاکە .
( قژبەسەرە ) بریتی یە لەئافرەت .
( قژ قژ ) شتێکە لق و چڵی
زۆری لێ بووبێتەوە .
( قژقژاویی ) قژقژ .
( قژقژۆکە ) شتی قژقژاویی .
( قژقژە ) جۆرێکە لە بەری دار
مازوو ، وە قژقژاویی یە .
( قژگ ) ز . قەلەباچکە .
( قژکردن ) د . ترشانی دۆو
کەف کردنی .
( قژکە ) قژقژە .
( قژکە ) قژقژە .
( قژلاندن ) ز. تواندنەوەی رۆن
( قژن ) کەسێکە کە قژی بە

سەرەوەبێ .
( قژنەسەر ) سەرقژن .
( قژە ) د . کەف .
( قژەسەر ) قژێکە کە لە سەر
بووبێتەوە .
( قژەکردن ) د . ترشانی شت .
( قژیاك ) ز . قەلەرەش .
( قسر ) مێیینەیەکە کە ساڵێك
بەبێ ئاووسیی مابێتەوە . شتی بێ بەر
[د] .
( قسکل ) د . جۆرێکە لە بەری
دار مازوو .
( قسڵ ) شتێکی تیژی سووتێنەری
سپی یە لە سووتاندنی جۆرە بەردێك
پەیدا ئەبێ .
( قسن ) کەڵەکە بەردێکە کە
بە کردی گۆڕێکا کرابێ .
( قسنیی ) شتێکی ررەشباوە ،
وەك مێوی هەنگوین بۆنێکی
خۆشی هەیە .
( قسە ) گوفتوگۆ ) .
( قسە بردن ) گێررانەوەی قسەی
یەکێك بۆ یەکێکی تر .
( قسە برریین ) بررینی قسە لە

ناو قەدا بە یەکێك .
(قسەبررینەوە) دەنگ دابرریی یەکێك لەگەل یەکێکی تر لەبەر زویربوونی لێی .
( قسە بەر ) کەسێکە کە قسەی یەکێك ببا بۆ یەکێکی تر .
( قسە بەسەر قسە داهێنانەوە ) کورتێز کردن لە قسەدا بۆ سەر قسەیەکی تر . قسەبررین بەیەکێك .
( قسە تال ) کەسێکە قسەی ناخۆش بێ .
( قسەخواردنەوە ) قووتدانەوەی قسەو نەکردنی لەبەر شتێك .
( قسە خۆش ) کەسێکە گوفتوگۆی خۆش بێ .
( قسە دابررین ) دەنگ دابررین .
( قسە دروست ) کەسێکە کە قسەی رێك و پێك بێ و درۆی تیا نەبێ .
( قسە دۆزراندن ) دەر بررینی قسەیەکی نەهێنی . شکانی قسەی یەکێك لای یەکێك .
( قسە دەرهاوردن ) قسە دەر هێنان .
( قسە دەرهێنان ) دەرهێنانی قسەیەکی پەنهانی لە یەکێك بە فێل .
( قسەرراست ) کەسێکە لەقسەیا راست بێ .
( قسە ررەق ) کەسێکە کە قسەی قورس و ناخۆش بێ لەگەل مەردوما .
( قسەررەوا ) کەسێکە لە ناو کۆمەلە دا قسەی برربکا .
( قسە ررەوان ) کەسێکە لە قسەدا ، دانەمێنێ .
( قسەزان ) کەسێکە لە شوێنی خۆیا بزانێ قسە بکا .
( قسە زل ) کەسێکە کە قسەی لە خۆی زلتر بێ .
( قسە سارد ) بریتی‌یە لە کەسێك کە قسەی خۆش نەبێ .
( قسە شکاندن ) بە قسە نەکردنی یەکێك و لە فەرمان دەرچوونی .
( قسەقوت ) قسە نەستەق .
( قسە قووتدانەوە ) قسەخواردنەوە
( قسەکردن ) گوفتوگۆ کردن لە گەل یەکێکا .
(قسەکەر) کەسێکە گوفتوگۆبکا .
( قسە گێررانەوە ) گێررانەوەی

قسەی یەکێك بۆ یەکێکی تر .

( قسه له ڕروو ) کەسێکه که ئەموو قسەیەك له ڕووی مەردوما بکا با دلگیریش بێ .

( قسه لەسەرداکێشان ) قسه دەرهێنان له یەکێك به فێل .

( قسه لێ کردن ) دووان لەبابەت شتێکەوە .

( قسه نەستەق ) کەسێکه که قسەی خۆش و قوت بێ .

( قسەو باس ) دەنگوباس .

( قسه وەرگرتن ) له گوێ گرتنی قسەی یەکێك .

( قسه هەڵبەست ) کەسێکه قسەی درۆ هەڵبەستێ .

( قسه هەڵبەستن ) ریك خستنی قسەی درۆ .

( قسه هێنان ) هێنانی قسەی یەکێك بۆ یەکێکی تر .

( قسەی نەستەق ) قسەی بەرزی به کەڵك .

( قشپل ) پشقل .

( قشت ) قشتییلانه .

( قشتییلانه ) شتی پچکۆلانەی جوانکییله .

( قشتییله ) قشتییلانه .

( قشقەرره ) قەلەباچکه .

( قشکه ) جۆرێکه له بەری دار مازوو قژقژاوییه .

( قشلاخ ) هەواری زستانەی دەوارنشیین . ناوی دێیەکه له جوانرۆ .

( قفل ) ئاسنێکه دوای ئەلقەڕێز کردن ئەدرێ له دوولایی دەرکاو سندورق بۆ قایمی ، وه بەکلیل هەل ئەگیرێ .

( قفلدان ) داخستنی دەرکاو سندووق به قفل .

( قفه ) کۆکه .

( قفین ) کۆکین .

( قل ) دەنك : قلێك ترێ وانه دەنکێك .

( قلاخ ) کۆکای تەپاله .

( قلاشتن ) قلیشاندنی شت .

( قلاشکەریی ) داری ووشکی زەنگه قلییشه .

( قلاق ) ل . قەلەرەش .

( قلپاندنەوە ) قلپکردنەوە .

( قلپ بوونه‌وه ) رژان و ده‌مه‌و حواربوونه‌وه‌ی شت .

( قلپکردنه‌وه ) رژاندن و ده‌مه‌و خوارکردنه‌وه‌ی شت .

( قلپوقوپ ) ده‌نگی هێلنج له‌کاتی ررشانه‌وه‌دا ·

( قلپه ) ده‌نگی رژانی شت به زۆریی ، [ قلپه قلپ ] قلپه‌ی یه‌ك له دوای یه‌ك ، [ قلپوهوورر ] قلپه قلپی زۆر .

( قلخ ) ز . برنـك .

( قلغ ) د . رێخت‌و سوروشت .

( قلقل ) ل . به‌ری کیایه‌که له نیسك ئه‌چێ به‌برێشکه‌یی ئه‌خورێ.

( قلکه جه‌وت ) کلاوه به‌رروو.

( قلم بوونه‌وه ) د . قلپ‌بوونه‌وه

( قلمه ) د . قلپه .

( قله ) که‌شیی ئاکری پشکۆ که خالی ره‌شی تیا نه‌مێنێ : ئاکره‌که ( قله )ی دێ ، [قله‌قل] قله‌ی ئاکر به زۆریی .

( قلیان ) قه‌نکه .

( قلیان ئاویی ) نێرکه‌له .

( قلیاناویی ) قلیان ئاویی .

( قلیانخۆر ) که‌سێکه که قلیان بکێشێ .

( قلیاندار ) که‌سێکه هه‌ر قلیان تێ‌بکا بۆ یه‌کێکی‌تر .

( قلیان دێمیی ) د . قه‌نکه .

( قلیانکێش ) قلیانخۆر .

( قلیاو ) د . قلیه .

( قلێ بلێ ) قلی و بلیی .

( قلیچکه ) ه . کلك .

( قلێچه ) کیایه‌کی به هاریی که‌لاّ وورده گولێکی زه‌رد ده‌رئه‌کا.

( قلێزه‌نکیسی ) جۆره چێشتێکه له برنج‌و هه‌لووژه دروست ئه‌کرێ .

( قلێل ) ز . کونی هه‌موو شتێك.

( قلینچك ) د . کلێنچکه .

( قلینچك ) د . برای تووته .

( قلێنچکه ) د . قلینچك .

( قلیه ) کیایه‌کی تیێژه سابوونی پێ ئه‌کرێ . قلێزه‌نکی [د] ·

( قلیینج ) ز . په‌نجه تووته .

( قلیینچك ) قلیینج .

( قلییش ) درزی که‌وره‌ی شت .

( قلییشان ) درزبردنی شت .

( قلییشاندن ) له‌تکردنی داروشتی

تر بە تیىغ .
( قلیىشاندنەوە ) درز تێ کردنی شت بە تیىغ .
( قلیىشانەوە ) دەم دانەوەو درز تێبوونی شت .
( قلیىشاو ) شـتێکە کە قلیىشی تێبووبێ .
( قلیىشاوە ) قلیىشاو .
( قلیىشبردن ) قلیىشان .
( قلیىف ) د . کێلان .
(قلییك) ز . داخستنی شمشێرەی دەرگا .
( قلیىو بلیی ) قسە یا نووسیینی بێمەعنای شردم بررم .
( قم ) قوم .
(قمار ) قومار .
(قمارباز ) قومارباز .
( قمباو ) بەسەراکشانی ئاوە بە زۆربی بەسەر کشت و کاڵا .
( قمقمۆك ) ز. قوەقمۆکە .
( قمقمۆکە ) قوەقمۆکە .
( قملاخ ) خمخۆرکی زەویی .
( قمییش ) قومووش .
( قنج ) شتی قییت . شتی چاك [ با ] .
( قنجبوونەوە ) قوت بوونەوە .
( قنج کردنەوە ) قوت کردنەوە .
( قنجە قنج ) قوتە قوتکردن .
( قنچك ) لاسکی مییوەو هێندێ سەوزیی . کلێنچکە [ د ] .
( قنچکان ) د . چیچکان .
( قنچکە ) زیپکە .
( قنچکە سـلاو ) د . سیچکە سلاوە .
( قنچکە سلاوە ) قنچکە سلاو .
( قنچکە کرد ) دانیشتن بە چیچکانەوە .
( قنـك ) ز . کولانەی مریشك
(قنـگ) کونێکە لە ناوەندی هەر دووسمتی کیانـدارا پییسی ئیوە ئەکا .
( قنکانیسك ) د . ئانیشك .
( قنـکاو ) ئاوێکە کە لە خوار کشتو کالەوە دەربچێ .
( قنکاولە ) کیایەکی بەهارییە کەمێك بەرز ئەبێـتەوە کەلای لە کەلای بیی ئەچێ وە رەوانە
( قنچکاو ) د . قنچکی چاو .

(قنگدانه‌وه) بریتی‌یه له دانیشتنێکی که‌م .

( قنگده‌ر ) بریتی‌یه له‌مه‌ردومی حیز .

( قنگر ) کنگر .

( قنگرپاچ ) بنجی کنگر .

( قنگرتن ) بریتی‌یه له‌دانیشتنی منالی شیره‌خوره له سه‌ر قنگ به‌که‌م جار .

( قنگرواچ ) قنگرپاچ .

(قنگره‌زا) د . جۆره جه‌ویی‌یه‌که له کنگر په‌یدا ئه‌بیَ .

( قنگلاشک ) بنجه دررکی کنگری ووشکه‌وه بوو .

( قنگ لیَ که‌وتوو ) بریتی یه له مه‌ردوومی بیَ‌هۆش و گۆش که هه‌میشه شتی لیَ بکه‌ویَ .

( قنگه‌بان ) بانی خانوو له‌پشته‌وه که له زه‌ویی‌یه‌وه نزم بیَ .

( قنگه چنۆکه ) بریتی‌یه له‌شوێنی زۆر ته‌سک‌وترووسك و ته‌نکه به‌ر.

(قنگه جووریَ) قنگ قووچاندنی گیان‌دار به هێزی زۆر گووهاتنی یا هێلکه کردنیه‌وه .

( قنگه خشکیَ ) له‌سه‌ر قنگ خۆخشاندن .

( قنگه خلیسکیَ ) له‌سه‌ر قنگ هاتنه خواره‌وه له شوێنی سه‌ره‌و لیژه‌وه .

( قنگه خورزکه ) نه‌خۆشی‌یه‌که له هێندیَ گیانداردا قنگی دیته خوروو .

( قنگه خه‌و ) نوستن به قنگه‌وه.

( قنگه‌زه ) د . پشتی هۆز : فیسارکه‌س له قنگه‌زه‌ی بابانه ، واته له‌و نه‌ژاده‌یه .

( قنگه سووته‌که ) ده‌ردێکه دوو چاری منالی ساواو مه‌ره‌زه‌ی کۆرپه ئه‌بیَ .

( قنگه‌سووته‌کیَ ) قنگه سووته‌که

( قنگه شه‌رر ) شه‌رر کرد له که‌ل پیَ‌دزکێدا پاشه‌و پاش

( قنگه قنگ ) بریتی‌یه له دوا خستنی کار بو نه‌کردنی : فیسار که‌س له‌م کاره دا [ قنگه قنگ ) ئه‌کات .

( قنگه‌گاز ) برینێکه ) له‌سه‌ر کولۆکی وولاخ په‌یدا ئه‌بیَ به‌هۆی

کرتنی بار یا زیین یا کۆپانەوە .
( قنکەلاشك ) قنکلاشك .
( قنکەلتس ) قنکدانەوەیەکی کەم
بە چیچکانەوە .
( قنکەلفس ) قنکەلتس .
( قنکە نشیینکە ) منالێکە کە
تازە فێری دانیشتن بووبێ لە سەر
قنـك .
( قنکە نشیینە ) قنکە نشیینکە
( قنکەوتلوور ) پالکەوتن بە
جۆرێك کە قنـك دەرپەرێ .
( قنـك هەلتەکێنە ) د . کلك
هەل سەنکێنە .
( قنیات ) داکەوتن بەبەشی کەم ،
[ قنیات کردن ] داکەوتن بە بەشی
کەم .
( قوبا ) ز . ماسێی بزرکاو .
( قوبکە ) د کومەز . لوتکەی
شاخ .
( قوبوولکردن ) پەسەند کردن .
( قوبوولیی ) چێشتێکە وەك پلاو
بەلام ئەم ناپالێورێ .
( قۆپ ) ز . کەسێکە دەستی یا
قاچی شلە پەتە بێ .

( قوپان ) چالبوونو بەناواچوونی
هێندێ شت بەهۆی نێتمێکەوە .
( قوپاندن ) چالکردن و بە ناوا
بردنی هێندێ شت بە نهێم .
( قوپاو ) شتێکە چال بووبێ و
بە ناوا چووبێ .
( قۆپچە ) شتێکی بچکۆلانەی
کردە بەیەخەدا دانەدروێ بۆ داخستن
•جۆرێکە لە بەری دار مازوو .
( قۆپز ) د . ماشەو هووشە .
( قوپکە ) د . قوبکە .
( قوپۆز ) قەپۆز(د) . کرێیەکە
لە ناوەراستی ئیپلی جووتا .
(قوپەن) چەند پنجە سەوزی‌یەکە
لە ناو پەلەیەکا ، کە بەرزتروبە
هێزتربێ لە دەوروبەرەکەی .
( قوپیان ) د . قوپان .
( قۆپیی ) جێکایەکە ئاوی تیا
وەستا بێو کیای لێ‌روابێ . ناوی
شوێنێکی قێنکە لە شاخی قەرەداخ.
( قوت ) شتی تنج و قیت . شتی
کورت [ز] . هەرزەو بێ‌ژێیر (د).
قۆتیین .
( قوتـــابخانە ) جێکای دەرس

خوێندنی قوتابی .
( قوتابیی ) منالێکه چووبێته بەر خوێندن .
( قوتار ) رزگار ( قوتاربوون ) رزگار بوون ، [ قوتارکردن ] . رزگارکردن . چەن وولاخێکه بەرو دوا بەرێدا بڕۆن .
( قوتاسه ) خشلی زییوینی ژنانه .
( قوتان ) ز . کوتان .
( قۆتان ) هەرزالی .
( قوتاویی ) قوتابیی .
( قوتایی ) شوێنی قوت لەزەویی.
( قوتبوونەوه ) قنج بوونەوه .
(قۆترر) وولاخی پییری پەك کەوته.
( قوترمەپا ) ه . قولەپێ .
( قوتحه ) د . شتی زۆر چاك .
( قوتفیین ) ز . سرربوون له سەرمانا .
( قوتك ) با . سوخمه .
( قوتکردنەوه ) قنج کردنەوه .
( قوتکه ) سەر لووتی شاخ و شوێنی بەرز .
( قوتم ) ز. کورتمه دارێکه که له زەوییدا مابێتەوه دوای بڕینی.

( قوتوو ) شتێکی بۆشی سەر قاپ داره له تەنەکه یا شتیتر دروست ئەکرێ و شتی تێ ئەکرێ .
( قوتووله ) قوتوویەکی تەنەکەیه نەوتی تێ ئەکرێو پلیتەی تێهەل ئەکێشرێ و دائەگیرسێنرێ .
( قوته ) د . قوتابی . مەردومی قوت .
( قۆتەره ) کۆتەره . دۆلیانی ناش .
( قوته قـوت ) قنجه قنج و هەلپەررو داپەرر .
( قوتەك ) ز . کالآیەکی کورته لەسەر کراسەوه لەبەر ئەکرێ .
( قوتیی ) قوتوو .
( قۆتیی ) قۆتیین .
( قوتییله ) قوتووله .
( قۆتیین ) سەری رووت: فیسار کەس سەری [ قۆتیین ] ه .
( قۆجه ) د . جاوییز .
( قـۆچ ) قوربانیی . پررتـاوی دوو سـواره بۆ ئەوەی یەکتری بەجێ بهێلن : ئەو دوو سـواره [ قـۆچ ] ئەکەن . تەڵەیەکه که

دررندەی پێ بگیرێ [ز] . شاخی گیاندار : شەررەقۆچ .
( قۆچاخ ) مەردوومی خێرا .
( قۆچان ) پسوولەیەکە لە دەولەتەوە بدرێ بەیەکێك بەرامبەر بە باجێك .
( قۆچبە هدر ) ز . گیایەکە بنکێکی رەوانی هەیە .
(قۆچ تێهەلدان) شوق تێهەلدان .
( قۆچدار ) گیانداری شاخدار .
( قۆچدان ) قۆچ وەشاندن .
( قۆچقوچانێ ) شەررە قۆچ .
( قۆچك ) جۆرە قۆچکەیەکی رەشی چنراوە بە ئاوریشمی سوور ، ژنانی بلباس ئەیکەنە سەریان .
( قۆچکە ) جۆرە لەچکێکە ئەکرێ بە سەری منالی ساوادا . دەسمالی سەری ژنان .
( قۆچکەتاش ) قۆچی تاش .
( قۆچکە سۆرانی ) د . فەقیانە .
( قۆچ لێدان ) قۆچ وەشاندن .
( قۆچ وەشاندن ) شۆق وەشاندن .
( قۆچ وەشێن ) شۆق وەشێن .
( قۆچ هاویشتن ) شۆق هاویشتن .

( قۆچەقانیی ) شتێکی دوولیسپی هونراوەیە لە بەن یا دەزوودروست ئەکرێ ، ناوەڕاستەکەی تۆزێك پانە بەردی پێ ئەهاوێژرێ .
( قۆچێتاش ) رێنكخستنی مووی پێشی ناوچەوان بەگوێزان بۆجوانی .
( قۆخ ) میوەیەکی خرری مزری تووکنی سپاتی ناووك رەقە لەقەیسیی گەورەترە . قۆختە . شتی چەماوە . [د] . زییخ .
( قۆختە ) ژوورێکی پچووکی نزمە لەناوباخا ئەکرێ بۆباخەوان .
( قۆخدان ) د . چەمانەوە .
( قۆخل ) خانووی پچکۆلانە .
( قۆخە ) کۆکە ، ( قۆخە قۆخ ) کۆکە کۆك .
( قۆدك ) با . ئاوێنە .
( قۆدیی ) قوتوو .
( قۆدییلە ) قوتییلە .
( قۆر ) ز . گیانداری لاواز .
•( قورئان ) ئەو کتێبەیە کە بە سرووش بۆ پێغەمبەری ئیسلام هاتووە.
( قورئـان خواردن ) سوێند خواردن بە قورئان .

(قورتان‌دان) سوێندانی یەکێك بە قورتان .
( قورافتن ) ز . رنینی تـرێ و بررینی گولی دانەوێڵە .
( قوربان ) سەرگەرد . ووتەیەکە لە رووی‌گەورەیی‌یەوە ئەووترێ بەو کەسەی کە قسەی لەگەل ئەکەیت.
( قوربانیی ) مەرر و بزن یا حوشترو گایە کە لە چوار رۆژەی جەژنی قوربانا سەرئەبررێ بەناوی قۆچەوە .
( قوربانی کردن ) سەربرری‌ینی قوربـانیی لە چوار رۆژەی جەژنی قوربانا بە ناوی قۆچەوە .
( قورپ ) قررقێنە . هێڵنج [د] .
( قۆرت ) چەوتی و کێرریی لە هەموو شـتێکا ، [ قۆرت قۆرت ] شتێکە کە قۆرتی زۆری تیابێ .
چەپاڵەی رۆزگار : یاخوا هەرگیز قۆرت نەیەتە بەرت . چاڵ .
( قورتاندن ) هەڵقرچاندنی لچ .
( قورتانن ) د . قورتاندن .
( قۆرتقۆرتاویی ) شتی لق لق .
( قورتم ) قوررقورراکە .
( قۆرتم ) د . قورتم .
( قۆرتیی ) با . گۆترە .
( قۆرچ ) ز. توێکڵی سەوزی فەرییکە گوێز .
( قورچمیین ) هەڵپچررکاندنی گیا .
( قورخ ) ز. ئەستێرەی گەلاوێژ .
( قۆرخ ) قەدەغە ، [قۆرخ‌کردن] قەدەغە کردن .
( قۆرخانە ) گەنجینەی چەك .
٠( قۆردوون ) زرێیەکە ئەکرێتە سەعات و ئەکرێ بە بەرۆکا .
( قورر ) گڵێکە بە ئاو شـل بوو بێتەوە .
( قۆرر ) کەسێکە کە رێخۆڵەی رژابێتە ناوگونیەوە . زەنگی گەورەی ملی پێشەنـگ . بریتی یە لە شـتی هیچ و پووچ .
(قوورراچکە) د . قوررقورراچکە .
( قورراد ) بەربەسێل .
( قورراده )گیایەکی کێویی تووڵی بەهارییە وەك کەوەر وایە ئەکرێ بە کەلانە . مسی شکاو . جۆرە پیازێکە سەلکەکەی هەرگیز گەورەو خررنابێ .

( قووراڵە ) گیای قووراوە .
( قۆراندن ) قۆرە کردن .
( قووراو ) ئاوێکە بە هۆی قوورەوە لیڵ بووبێ . بەربەسڵ .
( قووراویلکە ) باڵندەیەکە وەك [ بۆرە جرە ] بەڵام ئەمگەورەترو قاچی درێژترە .
( قووراویی ) شتێکە کە قووری تێوەچووبێ .
( قووریاق ) بۆق .
( قوور بەسەر ) بریتییە لە لێقەوماوێکی بە سەزمان .
( قووربەسەریی ) لێقەوماویی و هەژاریی .
( قووربەست ) قوورێکە لە سەر شوێنێك رۆکرابێ بە ئەستووریی ، [ قوور بەست کردن ] رۆکردنی قوور بە ئەستووریی .
( قووربێوان ) قوورکردن بەسەرا بە هۆی خەفەت یا چورتمێکەوە .
( قووربێوەدان ) بریتییە لەوێران کردن یا تێکدانی شتێك .
( قوورتێکەر ) کرێکارێکە کە هەر قوور تێکا بۆ قوورکێش .

( قۆرخانە ) جبەخانە .
( قوور دادەر ) کرێکارێکە کە هەر قوور دابدا لە سەر چینی دیوار بۆ وەستا .
( قوورشێل ) کرێکارێکە کە قوور خۆشکا بەپێ .
(قوورقووراچکە) د . قوورقووراکە
( قوورقووراکە ) لوولەیەکە لە ملی کیاندارا هەناسەی لیوە ئەدا .
( قۆرقۆرە ) جۆرە مزراحێکە کونێك لە تەنیشتیەوەیەتی لە کاتی داکوتانیا قۆرەی لێوە دێ .
( قوورقوشم ) جۆرە کانێکە وەك زیو بەڵام ئەم نەرم و کەم نرخە.
( قوورقێنە ) قررقێنە .
( قۆررك ) ز . پشت مل .
( قوورکێش ) کرێکارێکە کە هەر قوور بکێشێ بۆ وەستا .
( قوور کێشان ) بردنی قوور بۆ وەستا .
( قوورکێشی ) قوورکێشان .
( قوورگ ) قوورقووراکە .
(قوورگدرراو) بریتی لە مەردومی دەنگ زلی چەنەباز . بریتی یە لە

مەردومی چاو برسیی زۆر خۆر .
(قوررگدرریاك) د . قوررگدرراو.
( قوررگرتنەوە ) کردنی گـل بە قورر بۆ کارکردنی .
•( قوررمساخ ) کەواد .
•( قوررمساغ ) قوررمساخ .
( قۆررن ) د . تاوانو گوناح .
( قوررنازك ) ئانیشك .
( قوررنانە سەرچاو ) بریتی یە لە داخ و خەفەت کردن بەدلی یەکێکا .
( قوررناویلکە ) دەعبایەکی درێژی پچکۆلەی ئاویی یە لەبەهارانا پەیدا ئەبێ و دەنگێکی زلی هەیە .
( قوررنە )کۆشەی ژووریا حەوش.
( قوررنەت ) با . قوررنە .
( قوررواق ) قوررباق .
( قورروقـل ) شتێکە ئەگیرێتەوە لە گلو قـل بۆ بەکار هێـنانی لە بناغەی دیوارا .
( قورروقوشم ) قوررقوشم .
( قورروقە ) د . بلاوبوونەوەی چەند سوارێ لەکاتی هێرشا .
( قورروقەپ ) قرروقەپ .
( قورروقەپۆز ) قرروقەپۆز .

( قوررۆل ) کولۆر .
( قوررۆلیی ) کولۆریی .
( قوررونچك ) نوقورچ .
( قوررروو ) قورك .
( قوررووك ) قوررك .
( قوررە ) ز. دۆشاوی بەرسییلە .
( قۆررە ) دەنگی رەشەوولاخ . جۆرە دەنگێکە وەك دەنگی قۆرر قۆررە ، [ قۆررە قۆرر ] قۆررەی یەك لەدوای یەك . دەردێکە تووشی رەشە وولاخ ئەبێ و ئەیکوژی .
( قوررە ررەش ) جۆرە قوررێکی رەشە بەنی پێ‌رەش ئەکرێ .
( قوررەسوور ) جۆرە قوررێکی سووری پاکە گلاویی پێ‌دەرئەکرێ وە بۆ لیپر ئەدرێ لە جەستە .
( قوورڕەکاریی ) خەریك بوون بە کاری قوررەوە .
( قووریانە ) د . گیاندارێکە کە پێی ئەلێن قۆرریی .
( قۆرریانە زەردە ) د . بزن مژ .
( قۆرریی ) دەعبـایەکـە وەك مارمێلکـە بەلام ئەم گەورەترە . بوونی مەردوم بە قۆرر. قۆریە[د].

( قۆررییجان ) د . کۆلنجان .
( قۆررییتان ) ووتەیەکی سووکە بە هێندێ ئافرەت ئەووترێ ،
( قوورریین ) شتێکە لە قورر دروست کرابێ .
( قورس ) شتێکە لە هەڵگرتنا گران بێ . کوێ‌یەکە بەگران شت ببیەت . بریتی‌یە لەمەردومی سەنگیین .
( قورسایی ) گرانی و سەنگیینی شت .
( قورسوقۆڵ ) د . شتی داررێژراوی قایم .
( قورسوقەمەر ) بریتی‌یە لە مەردومی سەنگیینو گران .
( قورسی کەمەر ) بەری گیایەکی گەرمیانی‌یە ئاوکێکی سپی هەیە بە کوتراویی ئەکرێ بەدەمی منالی ساوادا بۆ رەوانی .
( قورسی نەعنا ) نوقڵێکی پانی کردە لە شەکرو ئارەقی نەعنا دروست ئەکرێ .
( قورسیی ) قورسایی . بریتی‌یە لە سەنگیینی و گرانی مەردوم . کورسیی .

( قورعان ) قورئان .
( قۆرغ ) حەمامێکی تێکرراییە کە بۆ یەکێك یا خێزانێك تەرخان کرابێ .
( قۆرغ کردن ) تەرخان کردنی حەمامێکی تێکرراییی بۆ یەکێك یا بۆ خێزانێك .
( قۆرك ) ز . کلێنچکەی مەردوم .
( قورم ) با . بنکی درەخت .
( قورمیش ) کۆکی سەعات : سەعاتەکەم قورمیشە . دێ‌یەکە لە موکریان ، [ قورمیش کردن ] کۆك کردنی سەعات .
( قورنچك ) نوقورچ .
( قورۆ ) د . نوقم .
( قورواق ) بۆق .
( قورولن ) قوربان .
( قورولنی ) قوربانی .
( قورسکان ) نوسکانەوەی سەگ لە کاتی ئازار پێ گەیشتنیا .
( قورسکە ) دەنگی سەگ لەکاتی ئازار پێ گەیشتنیا ، [ قوروسکە قورسك ] قورسکەی یەك لە دوای یەك .

( قورۆك ) كولۆر . كورۆك .
( قورۆل ) كولۆر
( قورۆمە ) هەوجارر .
( قورووقـە ) د . راكردنی كۆمەڵێكو بڵاو بوونەوەیان .
( قۆرە ) بەرسییلە .
( قۆرە قۆر ) ز . قۆررەقۆرر .
( قۆریات ) جۆرە مقامێكە .
( قورینـگ ) قولنگ .
( قۆریە ) شتێكی دەسكو لوولە دارە لە شووشە یا لـە فافۆن چای تیا لێ ئەنرێ . ناوی گەررەكێكە لە شاری كەركوك .
( قۆریی ) قۆریەی چا .كادانێكە دروست ئەكرێ لە تەنشت ماڵانەوە بەكردیی لە تەیمان ، وە ناوەكەی پرر ئەكرێ لەكاو سـەرەكەی بەقۆقزیی سـواغ ئـەدرێ . لۆدەی گررە كیـا .
( قوز ) جێی میێزو زانی مێیینە.
( قوز ) شتی زۆرچاك .كیانداری شەنـگو شۆخ .
( قۆزاخە ) گوڵی بـەری پەمووە كە ناوەكەی پررە لەلۆكە . شتێكی خررە كرمی ئاوریشم هەڵی ئەپێچێ.
( قوز بررگە ) دووكلكە . بریتی یە لە چەقۆی پچووك . ملە .
( قۆزتنەوە ) گرتنەوەی شت بە دەستو بردیی .
( قۆزراوە ) شـتێكە كە بەپرر پیا كردن بەحەواوە بگیرێتەوە .
( قوززەلقورت ) جۆرە دەردێكە وەك سنەدان لە كیاندارو كاڵەك و شووتیو ترۆزیی ئـەدا . ووتەیەكە لـە رووی سوكی یەوە لـە وەزامی یەكێكا ئەووترێ .
( قۆزلاخ ) د . قۆزاخە .
( قۆزلاخە ) د . قۆزاخە .
(قۆزلەمیینە) چێشتی چەنسووتەكێ.
( قوزولقورت ) د. قوززرەلقورت.
( قۆزە ) كۆكـە [ قۆزە قۆز ] قۆزەی یەك لەدوای یەك .
( قۆزە رەشە ) د . كۆكە رەشە.
( قۆزە قورراواق ) د . قەوزە.
( قوزەسووتەكێ ) سـووتانەوە و سوورببوونەوەی زێی كچی منال .
( قوزەلقورت ) قوززەلقورت .
( قۆزێتیی ) كوررێتیو خۆ بەقۆز

نیشاندان .
( قۆزیتی ) قۆزیتی .
( قۆزیی ) قۆزیتیی .
( قۆزیین ) کۆکیین .
( قوژبن ) قوررنە .
( قۆژیانە ) د . سووسەار .
( قوس ) قوز .
( قۆستنەوە ) قۆزتنەوە .
( قوسسان ) ز . ئاوسان و کوترانی پێ لەبەر زۆر رۆیشتن .
( قوش ) ز . خەرمانێکە ئامادە کرابێ بۆ کوتان .
( قوشقن ) قایشێکە لە کلکی وولاخ هەل ئەکێشرێ و لەقەلتاخ قایم ئەکرێ .
( قوشقن بوون ) قوشقیی بوون .
( قوشقنە ) قوشقن .
( قوشقیی ) مەردومێکە کە توورە بوو بێ ، [ قوشقیی بون ] توورە بوون ، [ قوشقیی کردن ] توورە کردن .
( قۆشمە ) مەردومی گالتەچی .
( قۆشە ) دراوێکی کەم نرخی ئێرانی یە . گێژخواردنی مووی ناوچەوانی ئەسپ و ماین ، ئنجا ئەم مووە ئەگەر لە یەك لاوە بوو ئەوا باشە ، وە ئەگەر لە دوولاوە بوو ئەوا شوومە ، وە پێی ئەلێن : جووت قۆشە [د] .
( قۆشەن ) د . لەشکر .
( قۆشەنیان ) د . لنگدانی وولاخ: ئەم شوێنە مەیدانی قۆشەنیانە .
( قوفل ) د . قفل .
( قوفلیین ) ز . زۆر سەرمابوون. رەقبوونەوە لەسەرمانا .
( قوففە ) قایغ .
( قوفە ) قوففە .
( قوفەوان ) قایغەوان .
( قۆق ) ز . یەك سەر لە ئاژال.
( قۆقز ) شتی زەقو دەرپەرریو.
( قۆقزایی ) عاستی قۆقزیی شت.
( قۆقزیی ) قۆقزایی .
( قول ) مەردومی زۆر رەش . لە ئەژنۆ بەرەو خواری گیاندار تاقاپی . باقە : [ قول ] یك گیام دروو . کونی دیوارو شتی تر[ز]. باش ویستانی هەلووك بە جۆرێك کە ژێرەکەی بۆش بێ بۆ ئەوەی

کە بەدار هەلووك لێیەدا بساش بەرزبێتەوە .
( قول ) شتی کول . قولپی شمە لەسەر ئاگر . سەری تیێژی هێلکە .
( قزل ) قزل .
( قزل ) ناوەندی شانو ئانیشك .
ئیشکچی شەو کە بەناو ئاوایی‌دا ئەسوورێتەوە . دەستەیەك لە مەردوم : لەشکرە کە [ قزل‌قزل ] بوو..داری ئەم‌لاو ئەولای‌عەررەبانە. شتی ئەستوور [ە] . ناوچە : لە قزلی مەلکەندی .
( قولاپ ) درەوشێکی چقەداری تیێژە بە لووتەکەی چەرمی پێ کون ئەکرێ‌و بە چقەکەی دەزوو لەگەل خۆی ئەهێنێتەوە دەرەوە . ئاسنێکی لووت تیێژی چەوتاوەیە شتی پیا ئەکرێ . قولەپێ [د] .
( قولاپ دۆز ) د . کەسێکە بە قولاپ شت بدروێ .
( قولاپ دۆزیی ) دروونی شت بە قولاپ .
( قولاپە ) شتێکی لووت چەماوەی تیێژە ئەگیرێنرێتە هێندێ شت . قولەپێ .
( قولاچ ) د . قولانج .
( قزلاچ ) د . قولانج .
( قولاچە ) قالۆنچە .
( قولاخ ) جێگا دابەش کردنی ئاو بۆ مەرەزە لای سەروویەوە . پارچەیەك لە ئەندامی ئاژالەکە دررندە خواردبێتی یا مرداربووبێتەوە و شوان بە بەلگە هێنابێتیەوە بۆ خاوەنی . کەول و پێستی کیاندار [د] . مۆلبوونی ماسیی‌و ئاژال .
(قولاخە) مۆلبوونی ماسیی‌و ئاژال .
( قولاخەدان ) کۆمەل بوون‌و بەسەر یەکا کەوتنی ماسیی لە سەرمادا . کۆمەل بوونی کیاندار .
( قولانج ) ماوەی پانیی دەست لە سەری پەنجە گەورەوە تا سەری پەنجەی دۆشاومژە .
( قزلانج ) د . قولانج .
( قزلانچە ) قالۆنچە .
( قولب ) قولف .
( قولبوون ) ز . کون‌بوونی شت
( قزلبەست ) بەندیی‌یەکە لەپشتە

وە هەردوو قۆلی بەسترابێ ، [قۆل بەستکردن] بەستنی هەردوو قۆلی بەندیی لە پشتەوە بۆ ئەوەی کە رانەکا .
( قۆلبەن ) بازیی بەند [د] . قۆل بەست .
( قۆلبەند ) قۆلبەن .
( قولپ ) قولفی شت . بلقی شتی شل لەسەر ئاگر . بلقی ئاو لە کاتی هەل قولانیا . هەنسکی گریان .
( قولپدان ) بلقدانی ئاو لە کاتی هەل قولان یا کولانیا . هەنسکی گریان
( قولپن ) مەردومی خرپنەی قەلەو .
( قولپنە ) قولپن .
( قولپە ) دەنگی کوانینی شتی شل ، [ قولپە قولپ ] قولپەی یەك لە دوای یەك . قولفە .
( قولپەژێر ) ە . بەری کولەهێرۆ
( قۆلپێچ ) شتێکی درێژە نان پێوەدەر ئەی پێچێ بە قۆلیا بۆئەوەی قۆلی نەسووتێ .
( قۆلت ) قۆرت .
( قۆلترر ) ووتەیەکە لەسەرووی سووکییەوە ئەووترێ بە مەردومی پییری داکەوتوو .
( قولتە ) مەلێکی کەوەلەی خال و میل دارە لە ( دارکونکەرە ) بچووکترە بە شوێنی سەختەوە هێلانە ئەکا وەك هێلانەی پەررەسێلکە .
جۆرە دەنگێکە لە کاتی خواردنەوەی شتی شل لە گەرووی هێندێ کەسا پەیدا ئەبێ ( قولتە قولت ) قولتەی یەك لە دوای یەك . دەنگی نقوم بوونی شتێك لە ئاوا . قولپەی گەورەی شتی شل لەسەر ئاگر .
( قولتەخۆرە ) د . ژێردەریایی .
( قولتەش ) د . مەردومی بێشەرم .
( قولتەشە ) د . قولتەش .
( قولتیان ) د . قولتە کردن بۆ ژێر ئاو .
( قولچماخ ) ە . مەردومی قسە خۆشی ، قسە رەوان .
( قۆلچی ) کەسێکە باجی دەولەتیی بسێنێ .
( قۆلچیێتی ) بوونی مەردوم بە قۆلچی .
( قۆلداخ ) بازن .

( قولدر ) د . مەردومی بێشەرمی بێحەیا .
( قولغ ) جوان .
( قولف ) ز . قولب .
( قولف ) جێگا دەست لەهەموو شتێکا کە پێی هەڵ بگیرێ . قفل [د] . ئەڵقەیەکە ئەنرێ لە هێندێ شت .
( قولف لێنان ) بریتی یە لە سەنگین و گران راگرتنی یەکێك کە سەنگینو گران نەبێ . پیاکردنی قولفە بە هێندێ شتا .
( قولفە ) جۆرە گرێیەکە کە بە راکێشانی لایەکی بکرێتەوە . ئەڵقە یەکە ئەنرێ لە هێندێ شت .
( قولقولان ) جۆرە یارییەکی دوو دەستەیییە پەنجەی قاچی چەپ ئەگرن لە پشتەوە بە دەستی راست وە لە سەر پێی چەپ بە هەنگلە شەلێ ئەچن بۆ یەکتریی .
( قولقولانچکە ) د . قولقولانە .
( قولقولانە )د . بالیینە .
( قولقولە ) د . قولەقولی شت لەسەر ئاگر .
( قواکرن ) ز . کونکردن .

•( قوللە ) قەڵای بەرز .
( قولمە )کوللەی مەشکە دررە .
( قۆلمە ) د . لوولاق .
( قۆلنج ) کۆلنج .
( قولنـگ ) باڵنـدەیەکی قاچ و مل درێژە لە شێینە شـاهۆ ئەچێ . قولنکە .
( قولنکە ) پاچێکی کالك کورتی دەم خرری لووت تیژە
( قولۆر ) د . کلۆر ، شـتی نالەباری نارریك .
( قولزق ) کلکی کەنمەشامی .
( قولولولو ) د . چاوشارکێ .
( قولووج ) د . چاڵە قووتە .
( قولووچان ) د . جۆرە یارییەکە .
( قولووچ قولووچ ) شوێنی چاڵو چۆڵ .
•( قولە ) تەپلە سەری شـاخ و درەختی بەرز . قوللە .
( قولە ) سـەری تیژی هێلکە . ناوی دێیەکە لە سنووری خانەقیین . گیانداری کلك کورت .
( قۆلە ) د . قۆلانچە .
( قولەبازەڵە ) د . قەلەباچکە .

( قولەبانك ) با . بەرهەیوانێکە لە سەربان ئەکرێ نوێن و شتی‌تری تیا دائەنرێ .
( قولەبنە ) کولەبنە .
(قولەپسکێ) د . سستی لەرۆینا.
( قولەپە ) د . قولەپێ .
( قولەپێ ) ئێسقانێکی رەقەڵەی بەرزە بەم دیوو بەودیوی قاچەوە.
( قولەشێین ) کەروێشك .
( قولەفیسقە ) د . قولەپێ .
( قولەقاچ ) قولەپێ .
( قۆڵە قول ) کولەکولی شت لە سەر ئاکر .
( قولەك ) ز . گیایەکی کەلاپانە بە سەر زەویی دا پان ئەبێتەوە .
( قولەمشت ) قولی مشت .
( قولەمشتێ ) شتێکە بە پەنهانی بی‌خەیتە قولی مشتی یەکێکەوە .
( قولەنـگ ) قولنـگ .
( قولەنکە ) قولنکە .
( قۆڵە نەخشینە ) د . جــۆرە قالۆنچەیەکی ڕەنکاو ڕەنکە .
( قۆڵەوانە ) بازووبەند .
( قول هەڵ کراو ) کیـانداری بە قولی کورج و کۆل .
( قۆل هەلمالراو ) قۆل هەڵکراو.
( قولیان ) د . کزلان .
( قولی مست ) ناو بەری دەسـت بە قووچاویی .
( قولیك ) ز . بەندیخانە .
( قوم ) پرر بەکووپ لە ئاووشتی شل . لم . دییزەی دۆ [ز] . دەفرێکی گەورەیە ئاوی تێ ئەکرێ بۆ ئاژال [د] .
( قوماتە ) پارچە تەنراوێکە منالی تازەبووی پێ ئەپێچرێتەوە ، [ قوماتە کردن ] پێچانەوەوشەتەکدانی منالی تازەبوو لە مەرحەمە یا شتێکی‌ترا.
•( قومار ) چەن یاریی‌کردنێکی تای بەتی‌یە ئەکرێ لە سەر پارە بردنەوە . یاریی .
( قومارباز ) بریتی‌یە لەمەردومی فێل باز .
(قوماربازیی)بریتی‌یە لە فیلبازیی .
( قومارچیی ) کەسێکە یاریی قومار زۆر بکا .
( قومارخانە ) شوێنێکە کە هەر قوماری تیا بکرێ .

( قومارکردن ) خەریك بوون بە قومارەوە .

( قومارکەر ) قومارچی .

( قوماش ) کوتاڵ . ناوە بۆ جۆکە ئاوێك لە شارەزوور .

( قومام ) کیایەکی سەلك داری بەرزی قەفقەفی بەهاریی‌یە سەلکەکەی شیرین چکە گولی وەك کەنم وایە بەڵام ئەم شیرەی کەمە .

( قومـامە ) تەقەڵێکـی کەورەی ئەم دیبوو ئەو دیوە کە ناو بەناو لە دۆشەك ئەدرێ .

( قۆمان ) قەومان .

( قۆماندن ) بەرپا کردنی کارێکی کرنکی ناخۆش .

( قۆمانن ) قەوماندن .

( قومپارە ) د . کوللە تۆپێکە کە ساچمەی زۆری تیا بێ .

( قومپاژنە ) پاژنەی پێ .

( قومپانی ) قومپاژنە .

( قومریی ) باڵندەیەکی پلپلی بارییکی زۆر جوانی دەنـگ خۆشە لەکۆتر پچووکترە . قەررنابییت[د].

( قومقمۆك ) قومقومۆکە .

( قومقمۆکە ) قومقومۆکە .

(قومقومۆکە) دەعبایەکی پچکۆلەیە وەك مارمێلکە . کۆزەڵەیەکی مل بارییکی بەرزە ناوملەکەی کون کونە لە کاتی ئاو لێ‌ڕۆکردنیا بلقە بلقی لێوە دێ .

( قومقومە ) دەفرێکـی مسیینی قولفداری مل بارییکی بن پانە .

(قوملاخ) قوررێکی ملی ئەستوورە کە پەیدا بووبێ لە باران یا لە ئاوی ترەوە .

( قوملێدان ) وەرگرتن‌وهەلمژیینی شتی شـل بە دەم بۆ خواردنەوە . مژدان لە جکەرەو سەبییل .

( قوموش ) قومووش .

( قوموش‌لێدان ) د . قومووش لێ‌دان .

(قومووش) زەوییەکی هەڵدرراوی قوولە لەباری درێژی لەژێرزەوییدا.

( قومووش‌لێدان ) هەڵکەندنی قومووش لە زەویی بەیەخە درریی .

( قومەزە ) د . زۆڵ .

( قۆمیان ) قەومان .

( قۆمیین ) قەومان .

( قۆناخ ) قوناغ .
( قۆناخە ) قۆناغە .
( قۆناخە پێچ ) قۆناغە پێچ .
( قونار ) لقی ووردی مێو کە بەری نەبێ وە لقە بەردارەکانی بێ‌هێز بکات ، [ قونار ردن ] کردنەوەی قونار لە مێو .
( قۆناغ ) دیواخان: مالی فیسار کەس [ قۆنـاغ ] یکی گەورەیە .
رۆژەررێ یەك : ئێرەوکەرکوك سێ [قۆناغ] ە . لای خوارووی تفەنگ کە دارێکی پانە .
( قۆناغە ) منالێکە لەناومەرحەمە یەکا پێچرابێتەوەو قوماتە کرابێ [ قۆناغە کردن ] شەتەکدانی منال و قوماتەکردنی .
( قۆناغە پێچ ) پارچە تەنراوێکە منالی پێ‌قۆناغە ئەکرێ .
( قونتـاخ ) ز . قۆناغی تفەنـگ .
( قونتك ) ز . یاپراخ .
( قونجك ) ز . قوژبن .
( قونجررکە ) پەیکول .
(قونچررك) چررنووك ، نوقورچ .
(قونچك) قنچك ، ئەغزەجکەرە .

( قونچکە ) قنچکە ، [ قونچکە کردن ] قنچکە کردن .
( قوندا ) ز . قنکدەر .
( قۆنداخ ) قۆناغەی تفەنگ .
( قۆنداخە ) قۆنداخ .
( قوندە ) گیانداریکە کە کلکی زۆر کول بێ .
( قۆندەرە ) جۆرە پێلاوێکی پاژنە دارە لەچەرم دروست ئەکرێ .
( قۆندەرەچی ) کەسێکە هەر قۆندەرە دروست بکات .
( قۆندەرەچێتی ) خەریبك بوون بە دروست‌کردنی قۆندەرەوە .
( قۆندەرەکردن ) بەرزبوونەوەی ئاوی خورر لە ناو چەم و رووبارا بە هۆی خررە بەردی ناوی‌یەوە .
(قۆنکرە) شوێنی بەرز بۆچاودێری شتێك .
(قونە) جۆرە رۆینێکە کەبەهەنگاو نەبێ : چۆلەکە بە [قونە] ئەرروا، [ قـونە کردن ] رۆینی بە قونە ، [ قونە قون ] قونەی یەك لە دوای یەك .
( قۆنە قۆن ) رۆیشتن بەهەنسکە بررکێ و تەکە تەك : فیسارکەس

بە [ قۆنە قۆن ] هات .
•(قۆنیاغ) جۆرە خواردنەوەیەکی گران مایەیە کە سەرخۆشیی ئەدا .
( قونێر ) دومەل .
( قونیك ) قولەپێ .
(قوو) بالندەیەکە گۆشتی ئەخورێو تووکی زۆر نەرمو شلە ئەکرێ بە سەرین . قوولەو هەرا [ د ] .
( قیواش ) ز . قوشقن .
( قیولقوو ) د . قلوە قلو .
(قووپك) بەرزی‌یەکە لەناوەڕاستی تەختاتی‌یەکدا . پشتی دەرپەڕرییو.
( قووتچوون ) چوونە خوارەوەی شت بە ناو شتێکی‌ترا : پاروەکە [ قووت چوو ] یا زەلامەکە لە ناوەکەدا [ قووت چوو ] .
( قووتدان ) بردنە خوارەوەی خواردەمەنی لە دەمەوە بۆ ناوسك.
( قووتکردن ) قووتدان . رووت کردن . نوقوم کردن .
( قووتە ) رووتەل . نوقوم بوون.
( قووتەل ) رووتەل .
( قووتەڵە ) قووتەل .
( قووتیی ) ز . قوتوو .
( قووجانن ) د . قووچاندن .
( قووچ ) شتی بەرزی کەڵەکەت.
( قووچان ) لێك نراویی دەست و دەمو چاو .
( قووچاندن ) لێکنانی دەست و دەم و چاو .
( قووچانن ) قووچاندن .
( قووچاو ) دەستو دەمو چاوی لێکنراو .
( قووچەك ) چەند شتێکە لەسەر یەك دابنرێ بە قووچی .
(قووچەکە) ئەموستیلەی درووهان
( قووڕراندن ) هاوار کردنی سەك و تانجی لە کاتی ئازار پێ‌گەیشتنیانا .
( قوورانن ) قووڕراندن .
( قووڕرە ) دەنگی سەكو تانجی لە کاتێکا کە ئازاریان پێ بکا بە رەنگێك کە لە (قوروسکە) گەورەتر بێ ، ( قووڕرە قووڕر ) قووڕرەی یەك لە دوای یەك .
( قووریی ) ل . قۆریەی چا .
( قووزە ) قووڕرە ، [قووزەقووز] قووڕرە قووڕر .

( قووس ) با . جۆرە کولێرەیەکی بێ ڕۆنە .

( قووقاندن ) تێهەڵکردنی کەڵەشێر بە خوێندن .

( قووقانن ) قووقاندن .

(قووقە) دەنگی خوێندنی کەڵەشێر ، [ قووقە قووق ] قـــووقەی یەك لە دوای یەك .

( قوول ) قوول .

( قوول ) شوێنی زۆر چاڵ .

( قوولاندن ) بانگەوازی یەکێك لە دوورەوە : تێی قوولاند .

( قوولانن ) قوولاندن .

( قووڵایی ) عاستی قووڵیی شت .

( قووڵك ) چاڵی پچووك .

( قووڵکردنەوە ) بریتی‌یە لە زۆر ووردکردنەوەی قسەیەك .

( قووڵکە ) قووڵك . چاڵێکە لە تەنیشت دۆڵیانی ئاشەوە ئاردەبارەی ئاشەوانی تێ ئەکرێ . ئاکردان [د]

( قووله ) جۆرە دەنگێکی بەرزی درێژە مەردوومی لە دوور پێ بانگ ئەکرێ ، [ قووله قوول ] قوولەی یەك لە دوای یەك . ناوی دێیەکە لە ناوچەی سەنگاو .

(قووله‌کردن) قوولاندن . بریتی‌یە لە پێ‌هەڵبڕین لە هەموو کردار و گوفتارێکا .

( قووڵیی ) قووڵایی .

( قووڵیینە ) دەفرێکی شووڵیینی قووڵی دەم واڵە .

( قوون ) قنـگ .

(قوونار) قونار ، [ قوونارکردن ] قونار کردن .

(قووندان) قنگدان . سمتەجۆڵەی مریشك و کەڵەشێر .

( قووندەر ) قنگدەر .

( قوونەبان ) قنگەبان .

( قوونەوتلوور ) قنگەوتلوور .

( قوونێـــر ) دومەڵێکە کە لە دەورو بەری کۆم پەیدا ئەبێ .

( قووڵیی ) چێشتی قـوبووڵیی .

( قوێخا ) کوێخا .

( قوێخایانە ) مووچەیەکە ئەدرێ بە کوێخا .

( قوێیل ) قوول .

( قوێیلە ) د . قووڵە .

( قوێین ) قنـگ .

( قەب ) ز . زۆران بازیی .

( قەبا ) ز . قەبە .

( قەباخ ) بەرگی رەقی شت .

( قەبارە ) بارستایی شت .

( قەبالە ) ز . قەبالە .

( قەبالە ) نوسراوێکی مۆر کراوە لەخرییدوفرۆختنا ئەدرێ بەیەکتریی.

•( قەبر ) گۆرر .

•( قەبران )گۆرستان .

•( قەبراوقەبرکردن ) ناشتنی مردوویەکی تازە بەسەر مردوویەکی کۆنا لە قەبرێکا .

•( قەبرسان ) قەبرستان .

• ( قەبرستان ) گۆررستان .

( قەبرخە ) قەبرغە .

( قەبرغە ) کەلەکە .

•( قەبر هەڵبەستن ) هەڵبەستن و چنینی قەبر بە بەرد یا بە خشتی سوور .

[ قەبر هەڵکەن ) کەسێکە کە هەر گۆرر بۆ مردوو هەڵبکەنێ .

•( قەبر هەڵکەندن ) هەڵکەندنی گۆرر بۆ مردوو .

•( قەبر ) کەسێکە کە رەوان نەبێ . مەردومی دل تەنـگ .

( قەبزە ) قەوزەی ناو ئاو .

( قەبزە نوشتە ) شتێکە کە بە سێ سووچیی نوشتێنرابێتەوە .

( قەبزی پابز ) ناوەڕاستی پایز.

( قەبزیی ) دل تەنگی . بـوونی گیاندار بەجۆرێك کە رەوان نەبێ

( قەبقاب ) قاپقاپ .

( قەبقەبۆك ) جۆرە گیایەکە بەرێکی خرری ووردی سـوور ئەکرێ .

( قەبلاندن ) ئەنـدازە دانان بۆ شـتێك لە بـــابەت نرخییەوە یا چەندێتییەوە .

( قەبلیین ) ز . پێ گەیشتـن و بەخۆدا هاتنی کشتو کال .

( قەبۆقەبۆ ) قەبووقەبوو .

( قەبووقەبوو ) ز . ووتەیەکە ئەووترێ لەکاتی داواکردنی زۆران بازیی و جەنگا ، واتە وەرە مەیدان.

( قەبە ) شتی زلی ناشیرین .

( قەبەدایی ) مـەردوومی قەبەی درشت .

( قەبەیی ) زلی و ناشیرینی .
( قەپ ) قەپال .
( قەپاتکردن ) داخستنی هەموو شتێك .
( قەپاخ ) قاپۆرری شت .
( قەپال ) قەپکرتن لە شتێك پرر بە دەم .
( قەپالکرتن ) پرر بە دەم دان گیر کردن لە شتێك .
( قەپان ) شتێکە وەك ترازوو بەڵام ئەم شتی قورسی پێ ئەکێشرێ .
( قەپانجەرە ) باڵیینە .
( قەپانچیی ) کەسێکە کە شت لە قەپان بدا .
( قەپاندنەوە ) خواردنی هێندێ شت بە لەوێچ وەك قاووت و برێشکە
( قەپانکردن ) لەقەپاندانی شت. هەلچنینەوەی رووی دیواری رووخاو.
( قەپان ) د . فرراندن .
(قەپانی) مزی شت لە قەپاندان.
( قەپداکرتن ) بریتی یە لە داوا کردنی ئەندازەیەکی زۆر لە نرخی شتێکا .
( قەپرخە ) قەبرغە .

( قەپکرتن ) گازگرتن .
( قەپڵاخ ) جۆرە کلاوێکی تووکنە لە پێستی بەرخ دروست ئەکرێ .
( قەپوبرر ) د . قاتوقرر .
( قەپوچك ) پاروە نان کە وەك کەوچکی لێ بکرێ و ماست و شتی شلی پێ هەلکێشرێ بۆ خواردن .
(قەپوچکە) قەپوچك . بەرزبوونەوەی ئاو لە کاتی لێکەوتنی دلۆپی باران بە لێزمە .
( قەپۆز ) دەم و لووتی هێندێ گیاندار .
( قەپوقرر ) کش و مات : منالەکان هەموو[ قەپوقرر ] دانیشتبوون .
( قەپۆل ) قەپۆلە .
( قەپولکە ) ترۆزیی و خەیار و باینجانێ هەلکۆلراوە کە لە هاوینا ووشك ئەکرێتەوە بۆ پاپراخی زستان.
( قەپۆلە ) مەردوومی ناشیرینی دەم و چاو نالەبارە .
( قەپوو ) چەمۆلە . قاووغ : قەپووی ئەو بەرروەوە فرریدە .
( قەپووك ) قرر پۆل .

( قەپوولك ) پاشقول .
( قەپێلك ) قاووغی رەق . پێلوو .
•( قەت ) ووتەیەکە هەرلەنەبوونی کارێکا بەکار دێنرێ ، وەك ووتەی « هەرگیز » .
( قەتار ) جۆرە نقامێکی خۆشی کوردییە . چەن ووڵاخێکی بارییە کە بەرودوا بڕرۆن . هۆدەی شەمەندەفەری یەك لەدوای یەك .
( قەتاربەستن ) ریزبوونی گیاندار بەرودوا .
( قەتارچی ) کەسێکە کە ئاگاداریی قەتاری ووڵاخ بکات .
( قەتارکردن ) ریزکردنی شت .
( قەتارە ) شتی بەرریز وەستاو .
(قەتارەبەستن) ریزبوونی گیاندار.
( قەتارەکردن ) ریزکردنی شت.
( قەتاندن ) با . قرتاندن : سەرێ وی بقەتینە واتە بی قرتێنە.
( قەتران ) تیێژاوێکی زۆررەشە.
( قەتك ) خەیاری دیمیی [ز] . پارچەیەك لە شتێك [با] .
( قەتماخە ) قەتماغە .
( قەتماغە ) توێژی سەربرینیں .
( قەتمەر ) مۆری تیر .
( قەتێ ) کورر کورر .
( قەتیە ) قەتێ .
( قەتییز ) د . قەتییس .
( قەتییس ) کەسێکە کە لەسەر کارێك داما بێ ، [ قەتییس بوون ] دامان لەسەر کارێك ، [ قەتییس کردن ] بەندکردنو دەستەوسان کردنی یەکێك لەسەر کارێك .
( قەچەریی ) جۆرە کۆپانێکە .
( قاچاغ ) با . قاچاخ .
( قەچاغچی ) با . قاچاخچی .
( قەحبك ) قەحبە .
•( قەحبە ) ئافرەتی سۆزانی .
•( قەحبەچیی ) کەسێکە کە قەحبەی بێ .
•( قەحبەخانە ) شوێنێکە کە هەر قەحبەی تیابێ .
( قەحفك ) ز . دەفری گڵیین .
(قەد) تەنیشتی شت : خەنجەرەکە بکە بە [ قەد ] تا . باڵا : فیسار کەس [ قەد ] ێکی بەرزی هەیە . چەن دێراوێکە کە [ ئاوبرر ] یان

لە یەك جۆگەوەبێ . دەق : لەسەر [ قەد ] ی خۆی دای نێ . ئەندازە : ئەمە بە [قەد] ئەوە . چیین : ئەمە [ قەد قەد ] ە واتە چیین چیینە . هەرگیز : قەد درۆ ناکەم واتە هەرگیز .

( قەدبرر ) نزیکترین ڕێگایە کە بۆشوێنێك کە چەن ڕێگایەکی تریشی بۆ بچێت .

( قەد بەن ) د . قەدبەند .

( قەدبەند ) د . پشتێن .

( قەدپال ) لاپالی کردوشاخ .

( قەدرە ) کچێك یا کوڕێکە کە تۆزێك بە ساڵا چووبێ .

( قەدکردن ) نوشتاندنەوەی شت بە ڕێکیی . بڕینەوەی دار : ئەو دارە [قەدقەدکە] واتە بیبڕەرەوە بە چەند پارچەیەك .

( قەدەح ) کوڵی پرتەقاڵو لیمۆ.

( قەدەخە ) د . قەدەغە .

( قەدەغە ) دارستان یا پووش و پاوەندێکە کە خاوەنی نەیەڵێ لێی ببرێ ، [ قەدەغە کردن ] نەهێشتنی توخن کەوتنی یەکێك

بەلای شێیکا .

( قەدەك ) قوماشێکی ئێرانی ڕەنگ کراوە ئەکرێ بە کەوا .

( قەدەم خێر ) کەسێکە کە هاتنی بەخێر بگەڕرێ .

( قەدەم شەڕر ) کەسێکە کە هاتنی بەخێر نەگەڕرێ .

( قەدیفك ) با . خاولی .

( قەدییفە ) قەیفە .

( قەر ) با . قەرد .

( قەراج ) قەرەقاج . ناوچەیەکە لە لیوای هەولێر .

( قەراخ ) قەراغ .

( قەراردان ) بڕیاردان .

( قەرارگا ) جێگایەکە کە لەشکر لێیهەڵ دابێت .

( قەراغ ) کەناری شت .

( قەراغگرتن ) گرتنی شتێك بە لێواری شتێکی ترا بە تەقەڵ .

( قەراغەگرتن ) قەراغگرتن .

( قەرافل ) ز . لووتەوانەی ژنان .

( قەرام ) ز . پارچە چەرمێکە ئەخرێتە سەر دەمی گۆزەو ڕەفری تر بۆ ئەوەی شتی تێنەکەوێ .

( قەران ) قرانی دراو .
( قەراو ) د . شەونم .
( قەربوونە ) بەرو وورگی خررو پرر .
( قەرپال ) ز. بەرگی زۆر پیناویی.
( قەرپۆز ) قەرپووز .
( قەرپۆس ) قەرپووز .
( قەرپووز ) شتێکی بەرزە لە زیین ، ئەکەوێتە بەردەمی سوار .
( قەرپووس ) قەرپووز .
( قەرتاڵە ) بەرچنۆکە . سەبەتە.
( قەرتماخە ) قەرتماغە .
( قەرتماغە ) قەتماغە .
•( قەرد ) قەرز .
•( قەردار ) قەرزار .
•(قەرازە) زنجیرێکە کوێ درێژی پێ ئەبەسترێتەوە .
•( قەررال ) پاشا .
•( قەرراڵییچە ) ژنی قەرراڵ .
( قەرران ) شوێنێکی پانی تەختە کە چەن سوارێك تاوی تیا بدەن بۆ تاقی کردنەوەی خێرایی وولاخەکان .
( قەرقەشە ) د . کیچەڵ .
( قەررەم ) نەیجوول .
•( قەرز ) دراوو هێندێ شتی ترە کە بۆ ماوەیەك بدرێ بە یەکێك .
( قەرزار ) کەسێکە کە قەرزی لەسەربێ .
•( قەرزاریی ) بوونی مەردوم بە قەرزار .
•( قەرزدار ) قەرزار .
•(قەرزدان) داتی قەرز بەیەکێك .
( قەرزدانەوە ) دانەوەی قەرز بە خاوەنی .
•( قەرزکردن ) سەندنی شت بە قەرز لە یەکێك .
•( قەرزکوێر ) کەسێکە کە قەرز درەنگ بداتەوە بە خاوەنی .
( قەرراسە ) قەررازە .
( قەرزکوێریی ) بوونی قەرزار بە رەنگێك کە قەرز بەگران بداتەوە .
( قەرزوقۆلە ) قەرزێکی زۆرە کە بت بێ بەسەر ئەموئەوەوە .
( قەرژنگ ) ل . قرژاڵ .
( قەرساندن ) با . بەستنومەیین.
( قەرسەقول ) قەرسەقول .
( قەرسەقول تلەوەکەر ) د . کوو

خلێنکە .

( قەرسییل ) کەڵاولاسکی کەنمو جۆی سەوز .

( قەرسیین ) ز . بەستن لەسەر مانا .

( قەرفیـین ) ز . شـکانی دار لە خۆیەوە .

( قەرقاش ) ز . مەرری سـپی چاو ررەش .

( قەرقاوول ) د . مریشکە کێوی .

( قەرقەش ) قەرقەشە .

( قەرقەشە ) گێرەوکێشە .

( قەرقەمێ ) ه . مەشکە کۆنێکە کە مێیوەی ووشکی تێ کرابێ .

( قەرمیچیـین ) ز . چرچ بوونی پێستی ئەندام یا کاڵا .

(قەرمیین)ز . قەرسیین . رەق بوونی ئەندام لەبەر ماندویەتی یا سەرمـا یا باداریی .

( قەرواش ) ز . کارەکەر .

( قەرواقە ) ل . بۆق .

(قەرە) دارەت: خۆی لەو[قەرە] یە نادا ، واتە خـۆی لەودارەتە نادا ، توخن . گۆبەنـگو برر و بیانوو : ئـەم شـتەی بـۆ [ قەرە ] داناوە ، واتە بۆنەوەی کە بیـکا بە گۆبەنـگ .

( قەرەباغیی ) جۆرە نقامێکە .

( قەرەبالغ ) جەماوەرو جەنجالی زۆر .

( قەرەبرووت ) شتێکە ئەوەندە سووتابێ رەش هەڵ گەررابێ .

( قەرەبوو ) شتێکە کە بدرێ لە تۆڵەی شتێکی ترا .

( قەرەبووکردنەوە ) دانی شتێك بە کەسێك لە تۆڵەی شتێکا .

(قەرەبوون) د . دەم چەشت بوون .

( قەرەبەشە ) جۆرێکە لەمراویی .

( قەرەبینا ) جۆرە دەمانچەیەکی کۆنە لە دەمیەوە دائەگیرێتەوە .

( قەرەج ) تیرەیەکی کۆچەریین بێژنـگ و هێڵەك دروست ئەکەن .

( قەرەچ ) قەرەج .

(قەرەچناخ) مەردومی چەنە بازی بێ شەرمی روو هەڵماڵراو .

( قەرەچۆل ) رەگەز و بنە چەی هۆزێك یا کەسێك : (قەرەچۆل) ی نەما ، واتە رەگەزی نەما .

( قەرەچەناخ ) قەرەچناخ .
( قەرەچیی ) قەرەچ .
( قەرەخەرمان ) کەنمێکە بە سەوزیی سووتێنرابێ .
( قەرەداشیی ) جۆرە هەڵپەڕرکێ یەکە .
(قەرەزاخ) د . گرینۆك . هەرزە بێژ .
(قەرەسەوە) د . جۆرەکومکومەیەکی مسیینی مل درێژە ئاوی تێ ئەکرێ .
( قەرەقاچ ) دارێکی پچووکە کرمی کەژ هەر بەوەوە قوزاخە ئەکا ، وە لە تووڵەکانی بەرچنەو سەبەتەی لێ دروست ئەکرێ .
( قەرەقاژ ) د . گرینۆك .
( قەرەقوش ) د . دەردێکە لە بن دەست یا پێی ئەسپ پەیا ئەبێ .
( قەرە کردن ) بەدیی کردنی شتێکی دوور .
( قەرە قەرە ) یاریی چاوشارکێ.
( قەرە کەوتن ) توخن کەوتن .
( قەرەمینا ) قەرەبینا .
( قەرەنتوو ) تارمایی .
٠( قەرەوول ) پێش‌رەوی لەشکر.

نیشانەی تفەنگ .
( قەرەوونە ) کرمێکی رەشی پچکۆلەیە لە کەشك پەیا ئەبێ .
( قەرەوێڵە ) چارپایە .
( قەرەیی ) کاڵەکی قەرەیی .
قەرەبوو [د] .
( قەرەیی ) جۆرە کاڵەکێکی گۆشت ئەستووری خۆشە .
( قەزاتمە ) جۆرە گۆشتاوێکە پیازو لەتکە نۆکی تێ ناکرێ .
( قەزانە ) رۆژنامە .
٠( قەزاز ) کەسێکە کە قەراغی چەفتەومشکی هەڵبەستێ بە سورمە . جۆرە نقامێکە .
( قەزازیی ) هەڵبەستنی قەراغی جەفتە و مشکی بە سورمە
[ قەزازیی کردن ] قەزازیی .
( قەزان ) ل . مەنجەڵ .
( قەزاوەگێرر ) شتێکە کە قەزا لە یەکێك بگێررێتەوە .
( قەزخوان ) د . قەزوان .
( قەزقان ) قەزوان .
( قەزقوان ) قەزوان .
( قەزقەوان ) قەزوان .

( قەزك ) با . داری قەرەقاچ .
( قەزكوان ) قەزوان .
( قەزوان ) بەری دارەبەن .
( قەزوان سم ) درەوشێكی تایبەتی یە قەزوانی پێ ئەسمرێ بۆ تەزبیح .
( قەزەب ) ز . جگەر .
( قەژەكردك ) د . شتی ترشاو
•( قەساب ) كەسێكە ئاژاڵ سەرببرێ بۆ فرۆشتنی گۆشتەكەی .
( قەسابخانە ) كوشتارخانەی ئاژاڵ .
•(قەسابیی) سەربڕینی ئاژاڵ و شەق و پەق كردنی گۆشتەكەی ، [ قەسابیی كردن ] قەسابیی .
•( قەساو ) قەساب .
•( ئەساوخانە ) قەسابخانە .
( قەساویی ) قەسابیی .
( قەسپ ) جۆرێكە لە خورما .
( قەسپەتوو ) جۆرە توویەكی شیرینی دەنك گەورەی سپی یە .
( قەستۆر ) جۆرە تەزراوێكی تووكنی ئەستوورە .
( قەستەقول ) قەرسەقول .
( قەستیی ) گوفتار یاكردكارێكە بە تایبەتی بكرێ : تۆ بە قەستیی ئەو قسەیەت كرد .
( قەسخوان ) قەزوان .
( قەسران )كەسیرە بوون لە سەرمانا .
( قەسریك ) با . تەنەكەیەكە ئەخرێتە بێشكەی منالەوە بۆ میز تێ كردنی .
( قەسریین ) قەسران .
( قەسسان ) ز . قوسسان .
( قەسفاندن ) ز . پارچە پارچە كردنی گۆشت بۆ فرۆشتن .
( قەسفیین ) ز . قەسریین لە سەرمانا .
( قەسقان ) قەزوان .
( قەسقەوان ) قەزوان .
( قەسكان ) قەزوان .
( قەسكوان ) قەزوان .
( قەسناخ ) قاسناخ .
( قەسناغە ) قاسناغ .
( قەسنیی ) شتێكە وەك بەرەمێو بۆنی زۆر خۆشە .
( قەسوان ) قەزوان .

(قەسەتۆرە) تییغێکە وەك شمشێر بەڵام ئەم کورتەو دەمەکەی پانە .
( قەسەڵیی ) جۆرە تفەنگێکە .
( قەسیان ) د . هەژاری لات .
( قەسییل ) د . قەرسییل .
( قەسییلە ) کەوچك .
( قەش ) گیانداری چوار پێی ناو چەوان سپی . نەکبەت .
( قەشا ) ز . سەهۆل .
( قەشان ) بزنی ناوچەوان سپی . ناوە بۆ دێیەك لە ناوچەی ماوەت. گیانداری کولۆلی بەدبەخت .
( قەشاووش ) قاشاو .
( قەشقە ) کولۆلی بەدبەخت .
( قەشمەر ) مەردومی کاڵتەچی . بەچکەی مەیموون [د] .
( قەشمەریی ) کاڵتەکردن .
( قەشە ) پیاوی پێشەوای ئاییینی کاوران .
( قەشەنـگ ) شتی زۆر چاك .
(قەشەنگیی) چاکی‌وجوانی شت .
( قەشەم ) ز . قەشا .
( قەشتیین ) ز . رۆینی یەکێك کە حەز لە مانەوەی نەکەیت .

( قەف ) چەماوەی گۆچان . لوولەی قامیـش و حەیـزەران [ قەف قەف ] قەفی یەك لە سەر یەك . قاپی مەردوم [د]. کەوورك [ز] .
( قەفانجەرە ) ماشـەی توولیینی ماسیی‌گرتن . باڵیینەیەکی توولیینە لە ژێر دییزەو شتی قۆقزا دائەنرێ بۆویستانی . قەپانچەرە .
( قەفت ) با . چەپکێك لە گیا یا لە کول .
( قەفش ) ز . لەوەرری کەم .
(قەفلك) ز. ملوانکەی مەرجان و کارەبا .
( قەفوکول ) کاتێکە کـە دەغڵ بە تەواویی قەفی کردبێ و کەم‌کەم گولیشی کردبێ .
•( قەفەز ) قەفەس .
( قەفەزە ) جۆرە دۆڵابێکەکتێب و هێندێ شتی تێ ئەخرێ . قەفەزێکی گەورەیە لەسەرهێندێ گۆرر دائەنرێ بۆ پاسی گۆررەکە
( قەفەزەی سنـگ ) بۆشایی ناو سنگە بە پەراسۆکانەوە کە دەورەیان

داوه .

•( قەفەس ) شتێکی پەنجەرەداره لە دار یا لە ئاسن دروست ئەکرێ بۆ تێ‌خستنی هێندێ باڵدار .

( قەفەنکێو ) چەند شیشە تووتنێکە کە لەسەر یەك دانرابێ بۆ کەیین و رزیی بێ .

( قەڤد ) ز . مشتووی خەنجەر.

( قەقنەس ) ئەڵێن گوایە باڵندە یەکی زۆر دەنـگ خۆشە بە سۆزی خۆی ئەسووتێ .

( قەل ) باڵندەیەکی زۆر رەشـە بە قەد مریشکێك ئەبێ. عەلی‌شیش . بزن و مەرێکە کە تاقەگوێ‌یەکی برابێ . یەکێکە کە چاوێکی کوێرو پووچ بێ . قەفێك لە قـامیش . بریتی‌یە لە مەردومی زبانـدار : فیـسارکەس زۆر ( قەل ) ە واتە بە زبانە . سەرشار لە یاریی [قەلە مرداری ] دا .

( قەلا ) خانوویەکـی قایمە بە شوێنێکی بەرزەوە . قەڵایی . قەل [ل] .

( قەلانیکچی ] ز . کەسـێکە کە دەفرێ مسـیین بە قەڵایی سپی بکاتەوە .

( قەڵا پەچن ) دەفرێکە کە پرر کرابێ لەشتێك بە جۆرێ کە بەرز بووبێتەوە .

( قەڵات ) قەڵای بەرز .

( قەڵاتە ) قایشێکە ئەکرێتە ملی تانجی بۆ ررست کردنی .

( قەڵاچن ) قەڵاپەچن .

( قەلاچۆ ) قررانی‌کیاندار : ئەم سال ئاژاڵە کەم [ قەلاچۆ ] ی تێ‌کەوت [ قەلاچـۆ کردن ] قرر تێ‌خستن .

(قەڵاخی) د . شتی زۆر رەش .

( قەڵادۆشان ) د . قەڵاندۆشکان .

( قاالاس ) قەڵداس . کیایەکی بەهاریی‌یە وەك کەرخنکێنە وایە .

( قەڵاش ) قلییش .

( قەلاشبوون ) نابووتبوون .

( قەڵاشتن ) قلیشاندن .

( قەڵاشدن ) قەڵاشتن .

( قەڵاشکـەریی ) داری زەنکە قلییشە .

( قەڵاشـکێن ) تۆپێکی بە هێزە

قوللەو قەلا ئەرروو خێنێ . بریتی یە لە مەردوومی بەهێز .

( قەلافەت ) قەدو بالای گیاندار .

( قەلا قەلا ) ووتەیەکە لە یاریی [ چاوشارکێ ] دا وەستا ئەی لێ .

( قەلا کردن ) پرر کردنی شتێك لە شتێك بەجۆرێك کە بەرز بێتەوە

( قەلاکە ) قەلانـك .

( قەلان ) ز . هەلکەندنی گیا .

( قەلانچە ) قەلەباچکە .

(قەلاندن) ز . قەلان . کولاندنی چێشت .

( قەلاندۆش ) قەلاندۆشکان .

( قەلاندۆشکان ) هەردوسەرشانی مەردووم لە کاتێکا کە منالێکو بخرێتە سەرو هەردو قاچی بەم لاو بەولای ملیا شۆرر بوو بێتەوە .

( قەلانقۆچ ) قەلاندۆشکان .

( قەلانکردن ) دابوون و سەربە ناوا بردن لە یاریی [ سنکەوباز ] و [ یەکەو حەیزەران ] دا .

( قەلانـك ) دارێکی درێـــژی لووت چەماوەیە مازووی پێ دائەکیرێ.

( قەلای ) ل . قەلایی .

( قەلایی ) شتێکە وەك زیبو لەحییمی پێ ئەکرێ ودەفری مسیینی پێ سپی ئەکرێتەرە .

( قەلب ) دراوێکە کە نەچێ . گیانداری بێ فەرر .

( قەلباز ) د . قەلەمباز .

( قەلبە ) سەرەلووتێکی تییژە بە دارو دییوارو ئاسنەوە لە هەرچی بکەوێ برییین داری ئەکا . جێگەیە کە لە کالا یا لە جەستە کە [ قەلبە ] لێی دابێ .

( قەلبەز ) رییزە بەردیکی زلە لە کرد یا لەشاخ کە ژێری هەلول بێ . قۆندرە کردنی ئاو .

( قەلبـەزە ) قۆنـدەرە کردنی ئاو . ناوی دێیەکە لە سـنووری سەنکاو .

( قەلبەزەن ) کەسێکە کەدراوی قەلب لێبدا .

( قەلبەژەن ) قەلبەزەن .

( قەلبەن ) د . پشتێن .

( قەلبییر ) د . قەلبییر .

( قەلبییر ) شتێکی کون کونە لە بێژنـك شـاش ترە ، دانەوێلەی

پێ ئەبێژرێتەوە .
( قەڵبێیرە ) د . قەڵبێیر .
( قەڵپ ) قەڵب .
( قەڵپاخ ) قەپڵاخ .
( قەڵپ و قولاپ ) شتی خراپ .
خوارو خێچ .
( قەڵپووت ) چاوێکە کە کلێنەی
نەمابێ . کوێرێکە کە بەدارەوە
ناوەکەی خورابێ .
( قەڵپووز ) قەرپووز .
( قەڵپووس ) قەڵپووز .
( قەڵپە ) د . قەڵپ .
( قەڵپاخ ) قەڵتاخ .
( قەڵتاخ ) قەڵتاغ .
( قەڵتاخەکۆن ) بەریتی یە لە
مەردومی پیری رزیو .
( قەڵتاغ ) چوارداره به چەرمی
خاو دائەبەسترێ و ئەخرێتە سەر
[ ئەکەڵتووی ] زین .
(قەڵتاغلێدان) زین کردنی وولاخ .
( قەڵتاندن ) دەرکردن و
رراررفاندن .
( قەڵتە ) د . قوررمساخ .
( قەڵتەبان ) د . مەردوومی نەفام .

( قەڵخ ) پێستەی گیاندار .
( قەڵخان ) قەڵغان .
( قەڵداس ) قەڵڵاس .
( قەڵداسوو ) قەڵڵاس .
( قەڵس ) گیانداری لاواز [ز] .
چرووك [با] .
( قەڵس ) قالس ، [قەڵسبوون] .
قالسبوون ، [ قەڵسکردن ] قالس
کردن .
( قەڵسۆك ) ز . لاوازی بێ هێز .
( قەڵسی ) قالسی و سەغلەتی .
( قەڵش ) قلیش .
( قەڵشان ) قەڵشین .
( قەڵشاندن ) قلیشاندن .
( قەڵشین ) لەت بوونی دار لە
سەرباری درێژیی .
( قەڵغان ) شتێکی گردی پانە
لە چەرمی ئەستوور دروست ئەکرێ و
لەکاتی جەنگا ئەکرێ بەبەرهەڵستی
شیرو تیری دوژمن .
( قەڵغان بازیی ) بەکار هێنان و
هەڵسووڕراندنی قەڵغان زۆر بەباشی .
( قەڵغانە ) نەقشێکە لە وێنەی
[قەڵغان] دروست ئەکرێ لەچیتا .

( قەلفرکردن ) بریتی یە لە دەربازبوونی یەکێك .

( قەلفەز ) تاڤگە .

(قەلقولە) ز . لووتەوانەی دەرگا.

( قەلقیشك ) با . قەلەباچکە .

( قەلکردن ) هەلپاچیین و قرخ کردنی موو . کەلکردن [د] .

( قەللاس ) پرژی گولی گەنم و جۆو برنج .

( قەللاش ) د . بێ ئابرروو .

( قەلماسك ) قۆچەقانی .

( قەلماسن ) قەلماسك .

( قەلماسە ) قەلماسن .

( قەلماسەنگ ) قەلماسك .

( قەلمراو ) باڵندەیەکی ررەشی مەلەوانی ماسی خۆرە .

( قەلنە ) قەنگە .

( قەلوبەرد ) بریتی یە لە دەست تەنگ بوونی یەکێك بەجۆرێك کە دەستی بە پوولێکەوە بلەرزێ: فلان کەس کەوتۆتە قەلوبەرد .

( قەلودەل ) قسە زانی بە دەم .

( قەلۆکە ) پۆلکە .

( قولولوولوو ) د . چاوشارکێ .

( قەلوون ) قەنگە .

( قەلوەز ) قۆندەرەکردنی ئاو .

( قەلوەزە ) قەلبەزە .

(قەلەباچکە ) باڵندەیەکی رەش و سپی کلك درێژە بە قونە ئەرروا.

( قەلەبازەلە ) قەلەباچکە .

( قەلەپرر ) ژەکێکە کە کرابێتە ناو لووالە قامیشێك و بە ئاگر گەرم کرابێ تا بووبێ بە فرۆ .

( قەلەخەرمان ) قەرەخەرمان .

( قەلەررەش ) باڵندەیەکی گەورەی رەشی یەك لەتی دەشتی یە .

( قەلەژارە ) قەلەباچکە .

( قەلەساوونیی ) جۆرە قەلێکی دەنگ ناخۆشی بۆرەلووکە .

( قەلەش ) قلیش .

( قەلەشان ) قلیشان .

( قەلەشاندن ) قلیشاندن .

( قەلەش بردن ) قلیش بردن .

( قەلەشت ) قلیش .

( قەلەشتن ) قلیشاندن .

( قەلەفرر ) قەلەپرر .

( قەلەم ) شتێکی درێژی لووتدارە پێی ئەنووسرێ . پارچە پۆلایەکی

لووت درێـژە ئەخرێتە نـاو لووتی
[ قەڵەمگیـــیر ] ە وەو بیـیرازی
پێ ئەکرێ . لقێکی بێ ریشەیە لە
چنارو گوڵەباخو هێندێ درەختی تر
کە وەك قەڵەم دائەدرێو ئەرروێنرێ.
ئەندازەیەك لە شتــێك : ئیمررۆ
[قەڵەم] یێك تووتن یاگۆشتم کرریی
واتە ئەندازەیەك .
( قەڵەمان ) قەڵەمدان .
(قەڵەمانێـــن ) جۆرە یارییەکە
بەقەڵەمدان ئەکرێ ، بەم رەنگە لە
هەر ررووبەکی ژمارەیەك ئەنووسرێو
وەك مۆرەی تاولە هەڵ ئەدرێ ، ئنجا
ژمارەی هەرکامیان زۆرتربێ ئەوەندە
دار یا گورز لەوی تر ئەدا ،
( قەڵەمباز ) قەڵەمبازد .
( قەڵەمبازد ) بـازدانی گەورەی
بەگورر .
(قەڵەمبرر) جۆرە چەقۆیەکی تیژە
قەڵەمی پێ دائەدرێ .
( قەڵەمتاش ) قەڵەمبرر .
( قەڵەمتراش ) قەڵەمتەراش .
( قەڵەمتەراش ) قەڵەمبرر .
( قەڵەمچیی ) کەسێکە هەرخرییدو
فرۆختنی تووتن بکا .
( قەڵەمدادان ) دادانی قەڵەم بە
جۆرێك کە پێی بنوسرێ .
( قەڵەمدان ) شتێکی درێژکۆڵەی
ناو بۆشە، قەڵەمی تێ ئەخرێ .
(قەڵەمردارێ) جۆرە یارییەکی
دوو دەستەییە بە تۆپ ئەکرێ .
( قەڵەمررەو ) ناوچەیەکە کە
دەسەڵاتی کاربەدەستێك بیگاتێ .
(قەڵەمکردن) تاشینی سەروژێری
ریش بەرێکیی . پەیوەند کردنی
درەختێك لەدرەختێکی تر . بررینی
سەر لقی دارو درەخت .
( قەڵەمگیر ) چەکوشێکی لووت
کلۆرە قەڵەمی بیرازی تێ ئەبرێ .
( قەڵەموون ) بۆقلەموون .
( قەڵەموونە ) قەڵەموون .
(قەڵەندەر) کەسێکە کە دەربەستی
جیهان و خواردن و پۆشیین و
دەستوورو باوی مەردوم نەبێ .
( قەڵەندەریی ) بوونی مەردوم بە
قەڵەندەر .
( قەڵەنـگ ) قەڵاتە .
( قەڵەو ) گیانداری گۆشتن .

(قەلەوبوون) گۆشت گرتنی گیاندار.
( قەلەوەز ) د . قەلبەزەی ئاو.
( قەلەویی ) گۆشتنی .
( قەلێته ) قەلاتە .
( قەلیسـیل ) ز . گۆشتێکی برژاوە کە ماست و سیری کرابێ بەسەرا .
( قەلینجەك ) پەنجە تووتە .
( قەلیین ) با . قەلوون .
( قەم ) لەوح یا تەنەکە یا دارێکی درێژی هەڵکۆلراوە کە لە بەرزیی یەکەوە بۆ بەرزیی یەکی تر ئاوی پیا بپەڕرێنرێتەوە . کۆتە دارێکی گەورەی ناو هەڵکۆلراوە ئاوی تێ ئەکرێ یا تـرێی تیا هەڵ ئەگوشرێ . پووتیی توور: ئەم توورە قەمە ، واتە پووتە .
( قەمار ) قومار .
( قەماندن ) با . ووشك کردنەوەی داری تەرر بۆ سووتاندنی .
( قەمت ) ز. دووگوێـزە کە بە یەکەوە نووسابن .
( قەمتار ) د . کەمتیار .
( قەمتەر ) ئاسنێکە وەك لغاو ئەکرێتە دەمی ئێسترو مەیموونەوە .
( قەمتەربوون ) بریتی یە لە زۆر رژدیی یەکێك بە جۆرێ کە دلی نەیەت هیچ بخوات .
( قەمتەرکردن ) قەمتەر خستنە ناودەمی ئێسترو مەیموون . بریتی یە لە دەم کوتکردنی یەکێك .
( قەمتەرە ) بەرگرتنی جـۆگەلە ئاوە بەقات قات بەبەردوکەلاوگیا ، وە پلوسـك دانانە لەهەموو قاتێکیا بـۆ ئەوەی ئاوەکە بە هێواشـی داررژێتە خـوارەوە ، تازەوی یەکە دانەددرێ .
(قەمتەریی) بریتی یە لە مەردومی زۆر رژدی هیچ بە دەما نەچوو .
( قەمچ ) پێچ و کێیر : پارەکەم کەوتە [ قەمچ ] ی فیسارکەسەوە . لە ویچ [ ز ] .
( قەمچان ) ل . هەلمەتۆ .
( قەمچاندن ) پێچدان .
( قەمچك ) ز . کالێنچکەی بزن.
( قەمچکردن ) د . هەلپاچینی موو بەمەقەست .
( قەمچیـین ) چەرمێکی درێژی

هۆنراوەیە وولاخی پێ لێ ئەخورر رێ.
( قەمزە ) غەمرە .
( قەمزە نوشتە ) قەبزە نوشتە .
( قەمك ) د . دزی چالاك .
( قەمکە ) د . قەمك .
( قەموور ) مەردومی پشـتدەر پەرریبوی مل بەناوا چوو .
( قەمە ) تیغێکی دەم پانێ درێژە نانوشتێتەوە .
( قەمەرێی ) دراوێکی کەم نرخە.
( قەمەزەن ) فێلبازی بێ نامووس [د] . شیعەیە کە لە شینی دەی محرما قەمە لە خۆی بدات .
( قەمییش ) قامییش .
( قەن ) د . قەند .
( قەنارە ) دارێکی بەرزی درێژە مەردومی پیـا هەڵ ئەواسـرێ بۆ خنکاندن . دارێکە چەن قولاپێکی پێوەیە گۆشت فرۆش گۆشتی پیـا هەڵ ئەواسێ .
( قەنارێی ) د . مەلێکی پچووکی دەنـگ خۆشە .
( قەناس ) د . قەنکاس .
( قەنج ) ز . شتی باش .
( قەند ) شەکری کەللە یا کولۆ.
( قەنداخ )شەکرو ئاوی لەکوڵ .
( قەنداغ ) قەنداخ .
( قەندان ) شەکردان .
( قەنداو ) قەنداغ .
( قەند شکێن ) شەکر شکێن .
( قەندە ) قەنگە .
( قەندی ئاویی ) نێرکەلە .
( قـەندەدار ) کەسێکە کە هەر قەنگە بۆ یەکێك تێ بکا .
( قەندەرێژ ) تووتنی هەڵتەکاوی پوختەکراو .
( قەندەکێش ) قەنگەکێش .
( قەندەهارێی ) جۆرە گەنمێکی دەنك ووردی بەپێزە .
( قەندییلە ) نۆکی کوڵاو .قوتییلە.
( قەنکاس ) ژووریا جێگـایەکە کەسەرێکی پانو سەرێکی تەسك بێ.
( قەنگە ) سـەبیلێکی دارینی کلك درێژە تووتنی پێ ئەکێشرێ .
( قەنگەدار ) قەندەدار .
( قەنگەررێژ ) قەندەررێژە .
( قەنگەکێش ) کەسێکە کەهەر قەنگە بکێشێ .

( قەنکەلاشك ) دررکی کەنکرە دوای ووشك بوونی .
( قەنکەهاریی ) قەندەهاریی .
( قەنکییلە ) قەندییلە .
( قەننە ) د . قەنکە .
( قەنەفلێ ) ه . کوریسی تەنکەی کۆپان .
( قەنەفە ) کورسی‌یەکی تەسکی درێژی تەنشتو پاڵپشت دارە لە سەری دائەنیشن .
(قەنەواچە) تەنراوێکی کەمێك رەقە ئەخرێتە ناو دوو تـوێی کالاوە بۆ جوان ویستانی .
( قەنەوز ) تەنراوێکی ئاوریشمیینی جوانی ئووس و پووسـی تەنکـی بریقەدارە .
(قەیتی) کیسکی مابووتی پایزەزێ . هەموو گیانداریکی پچکۆلانە .
( قەنییلە ) قەندییلە .
( قەواخ ) د . قاووغی شت .
( قەوارۆك ) ز . کاکلەی فەرییکە گویز .
( قەوارە ) قەبارە .
( قەواش ) ز . کەوگیر .

( قـەواق ) ز . کەسێکە کە گۆزەو دیزە دروست بکا .
( قەواڵە ) قەباڵە .
•( قەوان ) شتێکی تەنکی گردی پانە ئەخرێتە سەر سندوقی گۆرانیو پێی لێ ئەدرێ . قاپووری فیشەك . بریتی‌یە لەدەنگو باسی هەڵبەستراو: ئەمە قەوانی ئەمرۆیە .
( قەوانچە ) د . حەوانچە .
( قەوانچەدان ) د . حەوانچەدان .
( قەوتیی ) ز . چاودێریی و سەرپەرشتیی شـت « وصـایة » ، [ قەوتیی کردن ] وەصییەت کردن .
( قەوچە ) دەم بەیەکا دانی کەر ، [ قاوچە قەوچ ] قەوچەی یەك لە دوای یەك .
( قەوچەبوون ) بریتی‌یە لـە کەوشەك بوون .
( قەوچـە کردن ) بریتی‌یە لـە کەوشەك کردنی یەکێك . دەم بەیەکادانی کەر .
•( قەور ) قەبر .
•( قەوران ) گۆررستان .
( قەورخە ) د . قەبرغە .

•( قەورسان ) قەبرستان .
•( قەورکەن ) قەبر هەل کەن .
•( قەورکەنە ) گۆرر هەل کەنە .
( قەورە ) ل . برربەند .
( قەوزە ) جۆرە ملتەیەکی سەوزە لە ناو ئاوا پەیدا ئەبێ .
•( قەولاَنن ) قەبلاَندن .
•( قەولوبرر ) پەیمان بەستن لەگەل یەکێکا بۆ کردنی کارێك .
•( قەولوبررێ ) قەولوبرر .
( قەولەق ) ز . کلتور .
( قەومـان ) رووداني شتێکی ناخۆش .
( قەوماندن ) بەرپـا کردنی کارێکی گرنگی ناخۆش .
( قەوماو ) کارێکی ناخۆشـی گرنگ کە رووی‌دابێ .
( قەومە ) د . رووداوێکی ناخۆشە کە رووبدا « کارثة » لە قەومانەوە وەرگیراوە .
( قەومیان ) قەومان .
( قەومیین ) قەومان .
( قەویی ) . بەهێز .
( قەوبین ) قەویی .

( قەهبك ) یا . قەحبە .
( قەی ) ترس : قـەی ناکات ، واتە ترسیی تیا نی‌یە .
( قەیاخ ) گیایەکی بـەهارییە وەك گەنم وایە لەکەلاَو بالاَدا ، بۆ ئاژال زۆر باشە . قەیاغ .
( قەیاخەوان ) کەسـێکە کە قەیاغی ئاویی لێ بخوررێ .
( قەیار ) زیادەی سمی وولاَخی یەك سم . پێنج [ز] .
( قەیارە ) قەمە .
( قەیاسـە ) پارچە کەژوویەکی پانە ، سـەری پارچە کوریسێك یا قایشێکی تێ هەل ئەکێشرێ ، سەرەکەی تری ئەلقەیەکی پێوەیە لەسەر بارەوە تەنگەی وولاَخی پێ ئەدرێ .
( قەیاغ ) جۆرە کەلەکێکە ئەم بەرو ئەوبەری ئاوی پێ ئەکرێ .
( قەیاغەوان ) قەیاخەوان .
( قەیتان ) چەن تـاوە دەزوویـا ئاوریشمێکی هۆنراوەیە ئەگیرێ بە لیواری هێندێ کالاَدا .
( قەیتەران ) گیایەکە ، گەلاَی وەك گەلاَی کەرەووز وایە لاسکەکەی

وەك موو بارییك و رەشە ، بەقەد شاخێکە وە سەوز ئەبێ کە ئاوی پیابێتە خوارەوە ، بۆدەردی گورچیلە زۆر باشە .

( قەیچیی ) مەقەست .

( قەید ) ئاسنێکی تەنکی پانی درێژە ، فەردەی کووتاڵی پێ قایم ئەکرێ . قەی : قەیدی نی یە ، وانە قەی ناکات .

( قەیدك ) ز . ناوەندی قاپ و سمی وولاخ .

( قەیران ) ماوەیەکە لە کات کە لە لایەن پەزیشکە وە دائەنرێ بۆ مردن یا رزگاربوونی کەسێك کە زۆر نەخۆش بێ .

( قەیرە ) قەدرە .

( قەیسەرقووکردن ) بریتی یە لە چاوەروانیی کردنی یەکێك لەشوێنێك بە تەنهایی .

( قەیسەریی ) چەن دوکانێکە کە سەریان بە تاق گیرابێ .

( قەیسیی ) میوەیەکی خرری زەردی مزری ناووك رەقە وەك قۆخ وایە بەلاّم ئەم پچووکترە .

( قەیسیوورۆن ) خواردەمەنی یەکە لە قەیسیی و رۆنی داخکراو دروست ئەکرێ .

( قەیفە ) پارچە ئەنراوێکی لووس و پووسی تووکنە .

( قەیفەیی ) شتێکە رەنگی وەك رەنگی قەیفە وابێ .

( قەیلۆك ) داهۆل .

( قەیماخ ) قەیماغ .

( قەیماغ ) چەن توێژاڵێکی شیرە ئەدرێ بەسەر یەکا . پەلّوولە یەکی چەورە ئەکرێ بۆ زەیستان .

( قەیناغ ) ز . دەسکێشی سەپان .

•( قیبلە ) خانەی خوا لە شاری مەککە کە هەموو مۆسلمانێك لە نوێژا رووی تێ ئەکا .

•( قیبلەنما ) شتێکە وەك سەعات قیبلەی پێ ئەدۆزێتەوە .

( قیتکە ) پارچە گۆشتێکی زیادە لە ناو زێی ئافرەتا .

( قیچ ) کێچ .

( قیخا ) ز . کوێخا .

( قیدقید ) ز . قرتەقرتی مریشك .

( قیز ) هەلّشێوانی دل لەشتێك.

( قیزشێوانەوە ) دڵ هەڵشێوان .
( قیزشێویانەوە ) د . قیزشێوانەوە .
( قیـزکردنەوە ) دڵ هەڵشێوان لە شتێك .
( قیزەوون ) د . شتێکە کە دڵی لێ هەڵ بشێوێتەوە .
( قیسب ) لقەدارێکی باریك و درێژە ئەکرێ بەخێـزەرەی خانوو. قۆرتو چورتم [ د ] .
( قیست ) توولە زەررە .
( قیفال ) رەگێکە لە ئەندامـا ، لە هێندێ نەخۆشـی دا خوێنی بەر ئەدرێ .
( قیلکە ) د . چیلکە .
( قیلومك ) ز . کـررژبوونی ئەندام .
( قیلیـچ ) با . توێکلی گوێز و بادام و قەزوان .
( قیپت ) شـتی قوت . رۆنێکە کە بە [ دۆخە ] وەرکیرێ [ز] .
( قیپتك ) ز . قولی مەردوم .
( قیپتە قیپتکردن ) مل قوت کردنەوەوتەماشاکردنی یەك لەدوای یەك .

( قیپتەڵ ) کیانـداری قـوتی پچکۆلەی نەشمیلە .
( قیپتەڵە ) قیپتەڵ .
( قیپچ ) شتی قنج . خێل‌وخوار . شتی کەم : [قیپچ] ێکم ئاوبدەرێ واتە کەمێك .
( قیپچك ) ز . قیپتك .
( قیپچکردنەوە ) تەماشاکردن بە نیوە قووچاندنی‌چاوێك لەرووی کالتە پێ کردنەوە .
( قیر ) جۆرەکانێکی رەشی شلە رێکای پێ‌قیرتاو ئەکرێ .
( قیراخکردن ) ز. خۆکۆکردنەوەو داوێن‌کردن بە لادا بۆ رێ رۆین.
( قیر بە قەرەس ) قیروسیا .
( قیرپاچ ) قەمچی .
( قیرتاو ) شوێن یا شتێکە کە قیری تێ‌هەڵسوورابێ .
( قیرتاوکردن ) هەڵسوونی قیر لە شتێك .
(قیرتەبەق) سەلەیەکی پووشینە کە قیرتاو کرابێ .
( قیرر ) قیر . ژاری سەبیل‌و قەنکە .

(قیرراندن) قیررە کردنی گیاندار

( قیررانن ) قیرراندن .

( قیررە ) دەنگی قەبەی بەرزی ناساز ، [ قیررەقیرر ] قیـررەی یەك لەدوای یەك ، [قیررۆهوورر] قیررەقیرری زۆر. مەردومی قۆرر: ئەوەندەی هاوارکرد [قیررە] بوو.

( قیررەبوون ) بریتی‌یە لەدەنـگ دەرهاتن لە بەر زۆر قیـرراندن . قۆرربوون .

( قیررە کردن ) قیرراندن .

(قیررەکەر) بریتی‌یە لەگیانداریك کە لە باریابێ بقیررێنێ .

( قیررەگون ) کەسێکە لەبەر زۆرقیرراندن قۆرربووبێ .

( قیرسیا ) قیروسیا .

( قیرسیچم ) قیرسیچمە .

( قیرسیچمە ) مەردومێکە کە لە کاروبارا لاساروبەگیرو گرفت بێ .

( قیرقاج ) د . قیرقاچ .

( قیرقاچ ) وەرگەررانەوەی سوار بە هەموو لایەکیا لە کاتی تاوا بۆ تفەنـگ تەقاندن .

(قیروسیا) ووتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتێکا کە کارێکی خراپ ئەومابێ و تـۆش رقت هەڵسابێ و لە رقانـا ئەو کارە خـراپەت لەلا مەبەست نەبێ .

( قیروقاچ ) قیرقاچ .

( قیرەتاو ) قیرتاو .

( قیریی ) شتێکە لە رەنگا وەك قیرواِبێ .

( قیریین ) شتێکە لەقیر دروست کرابێ .

( قیزشێویانەوە ) د . قیزکردنەوە.

( قیزەوون ) د . قیزەوون .

( قیژاندن ) قیژە کردن .

( قیژانن ) قیژاندن .

( قیژۆك ) ز . باڵندەیەکی سەوزە ئەقیژێنێ .

( قیژو واژ ) د . قیژو هوورر.

( قیژە ) جۆرە دەنگێکی بەرزی بارییکی ناسازی گیاندار. ، [ قیژە قیژ ] قیژەی یەك لە دوای یەك، [ قیژوهوورر ] قیژەقیژی زۆر.

( قیژەکردن ) قیژاندن .

( قیسکە تەنـگ ) مەردومی کەم چیکڵدانە .

(قییقار) ز. کیایەکی درڕکاریی یە کەر زۆری حەز لیّ ئەکات .
( قییق بوون ) ز . لاوازبوون .
( قییقیی ) ز . دارکون کەرە .
( قییقیداوکە ) زییقاوالە .
( قییلکە ) د . چیلکە .
( قییمە ) گۆشتی کوتراو .
( قییمە قییمە ) شتی لەت لەتی ئەنجن ئەنجن .
( قییمەکردن ) و وردکردنی گۆشت و کردنی بە قییمە .
( قییمەکیش ) ئاسنێکی دەمپانی تییژە گۆشتی پیّ قییمە ئەکریّ .
( قیین ) رق .
(قییناویی) کەسێکە رقی ئەستوربیّ،
( قیین ئەستوور ) کەسێکە کە رقی هەستا درەنگ دابمرێتەوە .
(قیین جواندن) د. رق هەستاندن.
( قیین جویین ) رق هەستان .
( قیینخواردنەوە ) رق خواردنەوە .
( قیین کیشان ) رق هەڵگرتن لە یەکیێك .
( قیین لە دل ) قیین لە سك .
(قیین لەسك) مەردومی قییناویی .
( قیینوون ) د . قییناویی .
( قیینەبەریی ) رقە بەریی .
( قیینە قیینەدان ) قیین هەستاندنی یەکیێك .
( قیینەکیشان ) رقەکیشان .
( قیینە وون ) د . رق ئەستوور.
( قیین هەستان ) رق هەستان .
( قیین هەستاندن ) رقهەستاندن .
( قیین هەڵسان ) قیین هەستان .
( قیین هەڵساندن ) قیینهەستاندن.
( قیین هەڵگرتن ) رق هەڵگرتن .

# پیـــتی کـــاف

# [ ك ]

( کا ) لاسکی ووشکەوەبووی گەنم و جۆو گزن و گەڵێ شتی تر.

· کاك : [ کا ] محمد . کوانێ [ز] بکا : بە نەرییمان بڵێین زوو [کا] واتە زوو بکا .

( کائین ) ز . کاوێژی ووشتر و گیانداری تر .

( کاب ) با . مێیچ .

( کابان ) کەی بانوو .

( کابانیی ) با . مێیچێن .

( کابرا ) بریتی‌یە لە کەسێك کە نەتەوێت ناوی بەرییت یا نەی ناسییت.

·( کابە ) خانەی خوا لە شاری مەککە کە لەنوێژا رووی تێ ئەکرێ.

( کاپان ) ز . رێگای تەسك و تەنگە بەر .

( کاپك ) ز . پارچە گوریس .

( کاپۆخ ) ز . کەسێکە کە بە کرێ گیرابێ بۆ کۆکردنەوەی گیای درووێنە کراووکردنی بەخەرمان بۆ گزرە .

( کاپۆل ) ز . کایەکە کە زۆر وورد بووبێ‌و خۆڵی تێکەڵ بووبێ .

( کاپۆل ) د . کەپوو .

( کاپۆلك ) د . کاپۆڵ .

( کاپێچ ) ژانێکە دووچاری ئاژال ئەبێ لە زۆر خواردنی کاوە .

( کات ) دەمێکی کەم . گەنم و جۆیەکە کە لە جارری پێشووی رووابێتەوە .

( کانار ) ز . پۆپنەی کەڵەشێر.

( کات ژمێر ) سەعاتێکە کە کات ئەژمێرێ .

( کاتە ) با . وەچ .

( کاخلیی ) گیایەکی بـەهاریی بەرزەگوڵێکی زەرد دەرئەکا ، ئەدرێ لە رووی کالکالیی بـۆ زەردیی و جوانیی .

( کادان ) کاپەن .

( کادز ) ز . کێرری کاکە شان لە ئاسمان .

( کادوو ) دووکەلی کا .

( کادە ) با . کولیچە .

( کادێن ) کایەن .

( کادیی ) با . کادوو .

( کادیین ) ز . کادان .

( کادیین مێشی ) ز . ژوورێکی پچکۆلەیە پوورەی هەنگی تیادائەنرێ .

( کار ) ساوای بزنە تا دوو سێ مانگانە . ئیش و فرمان . پیتێکە بە هەر ناوێکەوە نـرا ئەی کا بە ئیش کەر [ فاعل ] : کرێکار ، بەد [ کار ] .

( کاراك ) ز . کانی ئاسن .

( کارامە ) مەردومی دەرهاتووی کارزان .

( کارامەد ) کارامە .

( کارامەیی ) ووریایی و ئامادەیی یەکێك لە کارێکا .

( کاربرر ) د . بریتی یە لەیەکێك کە کاروباری مەردوم ببررێتەوە ، وەك قازیی و حاکم .

( کاربەدەس ) کاربەدەست .

( کاربەدەست ) کەسێکە لەکارو بارا هەر خۆی حل بێ .

( کارپێ سپاردن ) سپاردنی کارێك بە یەکێك .

( کارپێ سپێرراو ) کەسێکە کە کارێکی پێ سپێررابێ .

( کارت ) سەوزایی یەکە لە چارری پێشووی رواییتەوە . پارچە نوسراوێکی چاپ کراوە بە ناوی یەکێکی تایبەتی یەوە .

( کارتموك ) ز . گولێکی زەردە پێی ئەلێن چاوەکا .

( کارتە ) کارتی سەوزایی . وە چی تووتن .

( کارتێ ) هەسان .

(کارتێ کەوتن) حەوە جەتێ کەوتنی یەکێك بە یەکێك لە کارێکا .

( کارتێنك ) د . پەسپە سەکۆلە .

( کارتێنە ) د . کارتێنك .

( کارتیخ ) جـۆرە برربەندێکی ووردە .

( کارتییغ ) کارتییخ .

( کارتییك ) ز . کارتییغ .

( کارچیین ) ز . جۆرە هەرمێ

یەکی زۆر خۆشە .

( کارخانە ) شوێنێکە کە وەستاو شاگرد هەمیشە کاری تیا بکەن وەك کارخانەی شەکرو جگەرە . بریتی‌یە لە قەحبەخانە .

( کارخانەچیی ) بریتی یە لە کەسێك کە خاوەنی قەحبەخانە بێ .

( کارخستن ) خستنەکاری شتێك : بررۆ بەکارخستنی‌خۆتەوە خەریك بە .

( کارد ) چەقۆ ( ه ) . کێرد .

(کاردانەوە) کردار یا گوفتارێکە کە لە یەکێکەوە دەرچێ لەوەرامی کردار یا گوفتاری یەکێکی ترا کە بە عەرەبی پێی ئەڵێن: « ردالفعل »

( کاردروست ) کەسێکی ژیری زانای دانای ووردی تێبیین .

( کاردۆژە ) د . کاردەوەژە .

( کاردوو ) گیایەکی بەهاریی یە کەڵایەکی لاسك درێژی هەیە بە کاڵیی زۆر تیژو بررندەیە لە پاش زەرد کردنی ئەخورێ .

( کاردووپەنیر ) د . بریتی‌یە لە دوو شت کە هەرگیز کۆنەبنەوە .

( کاردووەرەشە ) جۆرە کاردوو یەکی کەڵاپانە ئەکرێ بەیاپراخ .

( کاردووەکورانە ) جۆرە کاردوویەکە .

(کاردووەمارانە)جۆرە کاردوویە کە ناخورێ .

( کاردەپەلە ) د . مەلێکە پێی ئەڵێن تەررنە ئەبابیلە . زبر بوونی ئەندام لە سەرمانا .

( کاردەوەژە ) هەڵکۆلینی شت بە چەقۆ . بریتی‌یە لە مڵو مووش‌و زۆر خواردن لە شتێك : ئەمەندە لەم خواردنە [کاردەوەژە] مەکە . فەرییکە گوێز [ه] .

( کاردیی ) کاردوو .

( کاررك ) میوەی کاڵ و نەگەییو .

( کارروش ) گیایەکە لە هەرزن ئەچێ بەڵام ئەم تووەکەی رەشەو باڵای بەرزترە .

( کارزان ) کارامە .

( کارزۆرەکیی ) د . بێکاریی .

(کارژۆلە) بەچکەی ساوای بزن .

( کارژەلە ) کارژۆلە .

( کارژێلە ) کارژۆلە .

( کارس ) ز . هەرزن .

( کارساز ) ناوی خوایە : ئەی کە ریمی کارساز .

( کارك ) کارگ . کاڵە [ با ] . کارژەلە [ز] .

( کارکردن ) جێ گیر بوونی قسەیەك لە دڵا : قسەی پیاوی راست ( کارئەکا ) . تأسیر کردنی دەرمانێك یا خواردنێك لە جەستە بە چاکی یا بە خراپی .

(کارکردە) کەسێکە لە پیشەیەکا شارەزابێ .

( کارکەنار ) کەسێکە بە پێی تەمەن ماوەی فەرمانی دەوڵەتیی تەواو کردبێ و لێخرابێ « متقاعد » .

( کارکەناریی ) لێ کەوتن لە کارێك .

( کارگ ) قارچك .

( کارگا ) د . کارکە .

(کارگوزار) کەسێکە کەکارێکی پێ سپێردرابێ « ساعی » کەسێکە ئەو کارەی کە پێی بسپێررێ باشی بکا .

( کارگوزاریی ) بەجێ هێنانی کار بە باشی .

( کارگە ) کارخانەی پیشەسازیی .

(کارگەچێ)کەسێک، کە فەرەنجی و لباد دروست بکا .

(کارگەر)کەسێکە کە لە[کارگە] دا پیشەسازیی بکا .

( کارماخ ) ز بێژنگی گەورە .

( کارناس ) کەسێکە لەباسێکی زانستیدا بکۆڵێتەوە « باحث » .

(کارنامە)د . دەفتەرێکی تایبەتی یە کە کارو بارێکی تایبەتی تیا ئەنوسرێ.

( کاروا ) د . کارەبا .

( کاروان ) چەن ووڵاخ و بارو زەلامێکە لە جێگایەکەوە بچن بۆ جێگایەکی تر .

( کاروان ئاشیی ) چێشتی هێلکاو

( کاروانچی ) کەسێکە کە کاروان ای بخوررێ .

(کاروان سەرا)خانوویەکی گەورەیە کە کاروان تیا بخا .

( کاروان قرران ) کاروان کوژە .

( کاروانکوژ ) د . کاروان کوژە .

( کاروان کوژە ) ئەستێرەیەکی گەشە هێندێ جار زۆر لە پێش بەیاندا هەڵدێو کاروان چی بە ئەستێرەی بەیانی ئەزانێوبارئەکات.

(کاروانە) د . جۆرە باڵندەیەکی دەنووك درێـژە بە قەد مراوی یەك ئەبێ .

( کاروانەکردن ) بریتی‌یە لەزۆر ھاتوچۆکردنی شوێنێك .

( کاروانیی ) کەسێکە لەگەل کاروانا بێ .

( کاروبا ) د . کارەبا .

( کاروبار ) ئیش‌و کار .

( کارووس ) ز . گیایەکی بۆن خۆشە تێکەڵی ھێندێ خواردن ئەکرێ

( کارووش ) ز . کارروش .

( کارەبا ) شتێکی زەرد یا رەشە دانەی تەزبیحی لێ دروست ئەکرێ وە پووش‌و کا رائەکێشێ . ھێزێکە لە گەلێ شتا ھەیە وە بە مەکینەی تایبەتی وەرئەگیرێ ئنجا یا ژووری پێ رووناك ئەکرێتەوە بەگوڵوپ ، وە یا مەکینەی پێ ئەخرێتەکار ، ھەر وەك گەلێ شتی تریشی پێ ئەکرێ .

( کارەررەھات ) پەرێشانیی بە ھۆی زۆر لێدان یا زۆر جنێودان یا زیان پێگەیاندن یا سەرنانە سەرەوە .

( کارەسات ) کارە ررەھات ، لە عەرەبی‌یەوە وەرگیراوە

( کارە کەر ) ئافرەتی بێگانەی بەردەستی ئیش‌کەر لە ماڵا .

( کارەکەو ) ز . راوکردنی کەو بە کۆمەل .

( کارەکا ) د . کارکا .

( کارەوا ) د . کارەبا .

( کارەوان ) شوانی کار .

( کارپێچ ) ز . شەن .

( کارێز ) ئاوێکە کە لە بیر و لەغەم لێدانی زەویی پەیدا بووبێ . شوێنی فێنك [ز] .

( کارێزاو ) ئاوێکە لەکارێزبێتە دەرەوە .

( کارێزکەن ) کەسێکە کەکارێز لێبدا .

( کارێزلێدان ) ھەڵکەندنی کارێز .

(کارێزەبازارر) سەرکانی‌و ئاوێکە کە دێھاتیی ئەچن شتی تیا ئەکررن‌و ئەفرۆشن .

( کاریی ) دەردی کاریی‌کەر : دەردە کەم [ کاریی ] یە . کاردوو [با] . جۆرە گیایەکی ئاویی‌یە [ز] .

دووکەل [با] .
( کارییتە ) نیرگەی خانوو .
( کارییکەر ) وەستایەکە لەکاری خۆیا شارەزاوئیشکەربێ. دەرمانێکە کە کار بکا لە جەستەدا بە چاکیی یا بەخراپی .
( کارییلە ) کارژۆلە .
( کارییین ) ز . توانیین .
( کازیوە ) کازییوە .
( کازییوە ) بەرەبەیان .
(کاژ) تونکلێکی تەنکە لە پێستی هێندێ گیانـدار ئەبێـتەوە . داری سنەوبەر [با] . بەکرەی کندر[ز].
(کاژاویی) جۆرە ترێ یەکی رەشی بزمارکوتی مزرە .
( کاژمررە ) کاژەلە .
( کاژەلاك ) کاژەلە .
( کاژەلە ) کاسەی سەر .
( کاژیرر ) دەلاقەی ناودیوار . شەوییلە . کۆشەوسووچ .
( کاژیلە ) د . کاخلی .
( کاس ) گیانداری وورروگێژ . کەرر [ل] . شتی کولۆروبۆش .
( کاسالاشینکە ) کەندەسمە .
( کاسبوون ) وورروگێژبوون .
•( کاسبیی ) خەریك بوون بە کسب و کارەوە .
( کاسك ) سەوزی مەیلەو زەرد . کلێنە [ز] .
( کاسمە ) نانێکی تیریی یە کە رۆن کرابێتە هەوییرەکەیەوە .
( کاسنیی ) د . گیای چەقچەقە .
( کاسۆ ) قاشۆ .
( کاسە ) جۆرە دەفرێکی دارییینە .
( کاسە ئاوسێ ) دوودراوسێن کە ناو بە ناو چێشت بۆ یەکتریی بنێرن .
( کاسەسفرە ) چێشتێکە کەبنێررێ یەکەم جار بۆدراوسێ یەکی تازە .
( کاسەسەر ) ئێسقانێکی گەورەی خررە مێشکی گیانداریێ تیایە .
( کاسە سم ) کاسەی سمی وولاخی دووسم .
( کاسە شۆر ) گیایەکی کەلاپانی ئەستووری زبرە .
( کاسەشـەن ) جۆرێکە لە بێلە دارییینە بەلام ئەم دەمی درێـــژە، خەلەی پێ ئەم دییو ئەودییو ئەکرێ .

( کاسەلیس ) بریتی‌یە لە مەردومی پاش ماوە خۆر .
( کاسەلیسی ) خەریك بوون بە خواردنی پاشماوەوە .
( کاسەمەن ) جۆرە کاسەیەکە هەرشتی پێ‌ئەپێورێ .
( کاسەی ئەژنۆ ) چالاییەکە لەسەری خوارووی ئیسقانی رانا کە سەری ژووروی لوولاقی تیائەجوولێ .
( کاسەی سمت ) چالاییەکە لە لای راستوچەپی ئیسقانی سمتەوە کە ئیسقانی رانی تیا ئەبزوێ .
( کاسەی سەر ) کەللەی سەر .
( کاسەی فەقیران ) د . سفرەی فەقیران .
( کاسەی هەتیوان ) د . کاسەی فەقیران .
( کاسیی ) کیژیی و ووریی .
( کاش ) شیشی گۆشت برژاندن . کیلانی زەویی [د] . تەپۆلکە [ز] .
( کاشخانك ) با . بن میچ .
( کاشکای ) کاشکی .
( کاشکایە ) کاشکی .
( کاشکایەکوو ) کاشکی .
( کاشکایەکی ) کاشکایەکوو .
( کاشکرن ) ز. راکێشانی شت لەبەرزی‌یەوە بۆ نزمی .
( کاشکی ) بریا .
( کاشمە ) گیایەکی کوێستانی بەهاریی بۆن‌خۆشە بەسوورەوە کراویی ئەخورێ ، وە ئەکرێتە ناو کەشكو سوێرەکەوە .
( کاشوانێ ) با . شەقێن .
( کاشوو ) با . دارێکە کە یاری شەقێنی پێ‌ئەکرێ .
( کاشیی ) دەفرێکی لووس و پووسی گلێینی بەئاگرسوورەوەکراوی تەنکی جوانە .
( کاشیی ساز ) کەسێکە کە کاشیی دروست بکا .
( کاغەز ) قاقەز .
( کاغەزدان ) بەرگێکی مقەبایە کە وورده کاغەزی تێ‌بکرێ .
( کاغەزساو ) شتێکی قورسی لووسە کاغەزی پێ لووس ئەکرێ .
( کاف ) ناوە بۆ پیتێك لەبیست‌و حەوت پیتەی کوردیی .
( کافرمان ) کوێزانی سەرتاش .

( کافرۆش ) کەسێکە کە پیشەی هەر فرۆتنی کابێ .

( کافوور ) شتێکی سپی ساردی بۆن خۆشی بەنرخە بۆ گەلێ شت بە کار دێنرێ .

( کاڤر ) ز . کاوورر .

( کاڤرریی ) با . ناوە بۆ جۆرە هەنارێك .

( کاڤل ) ز . کەلاوە .

( کاسە ئاوسێ ) دوودراوسێن کە ناو بەناو چێشت بۆیەکتری بنێرن.

( کاك ) برای گەورە . جۆرەنانێکی ناسك و خۆشە بەبەرچایی ئەخورێ . [د] .

( کاکاو ) شتێکە وەك قاوە لێ ئەنرێو بەشەکرەوە ئەخورێتەوە .

( کاکشان ) د . کاکەشان .

( کاکل ) ز . کاکلە .

( کاکڵ ) کاکلە .

( کاکلە ) ناووکی گوێزو بادام و شتی تر .

( کاکلە شێران ) د . یاریی پاوشارکێ .

( کاکلە قووچە ) کاکلەی گوێزە کە بە چوار گۆشەیی بتە دەرەوە.

( کاکلە مووشان ) د . پەسپە سەکۆلە . ناوی جالجالۆکە . حەماموکێی منالان .

( کاکلیی ) گوێز .

( کاکنج ) د . بووکی پشت پەردە کە هێشتا زاوا نەچووبێتە لای.

( کاکوچ ) ز . چەکوش .

( کاکوچیل ) ز. چێشتی ترخێنە.

( کاکۆل ) مووی پێشی سەری پیاو کە بە قژاویی هێلرابێتەوە .

( کاکۆل مەل ) د . فشەکلاونە.

( کاکە ) کاك .

(کاکەشان) کێررێکی سپی پانی دوورو درێژە لە ئاسمانا بە هۆی زۆریی ئەستێرە و کۆبوونەوەیان لەو جێیە پەیدا بووە .

( کاکەلێ ) وونەیەکە لە رووی خۆشەویستییەوە ئەووترێ بە مەردوم

( کانەیی ) ناوە بۆ تیرەیەك لە کورد .

( کاکێژ ) د . قەلبێر .

( کاکێشان ) کاکەشان

( کاکیی ) کاکە .

( کاکێی بەکاکێێ ) دەشتی پانی دوورو درێژی چۆل و هۆل .
( کاکێیلە ) شەوییلە . کاکەلێ .
( کاکڵ ) سواغی قورر .
( کاکەز ) د . کاغەز .
( کاڵ ) ز . پییر . خزموخزیش .
( کاڵ ) شتی نەگەییو . رەنگێکە کە تێر نەبێ : ئەم سوورە یا ئەم سەوزە [ کاڵ ] ە . نەکوڵاو: گۆشتە کە بەشتاکالە . لەدوای ووتەی کشتەوە بەکاردێنرێ : کشتوکاڵ . پییر . یا پییر .
( کالاّ ) کەل و پەلی پۆشیین . کووتاڵ .
( کالاّت ) د . تالاّن : بەکالاّت چوو .
( کالاّ قنگ ) گیایەکی کوێستانی بەهاری یە لە ناوەراستا نێرکێك دەرئەکا پێی ئەڵێن رێواس .
( کالان ) کێلان .
( کالاّنە) چالاّیی یە کەکلێنەی چاوی تیایە .
(کالانیی) ز. کێردێکە کە کالانی بێ .

( کالبوون ) ز . پییربوون
( کالبوونەوە ) چوونەوەی رەنگ .
( کالك ) با . کالە .
( کالك ) کال .
(کالۆش) شتێکە لەسەر پێلاّوەوە لە پێ ئەکرێ بۆ ناو قورر .
( کالو کرچ ) شتی زۆر کالی نەگەییو .
(کالومە) ز. شمشێری ژەنگاویی کێلان شکاو .
( کالە ) چەرمێکی خاوە لەبەفرو بارانا لە جیاتی پێلاّو لەپێ ئەکرێ وە بەبەن ئەپێچرێ .
( کالە برروێش ) د . برروێش .
( کالەپێ ) ئەندازە یەکە لە بەفر کە بیارێ بە قەد ئەستووریی کالاّیەك: کالەپێیەك بەفر باریوە .
( کالەپێچ ) پەرروّیەکە لە پێوە ئەئالێنرێ و کالەی لەسەرەوە لەپێ ئەکرێ .
( کالەشێف ) زەمینێکی کێلراوە کە لە پاش کێلانی ، باران لێی نەدابێ .
( کالەك ) ز . خزموخوێش .

( کاڵەك ) میوەیەکی خڕی گۆشتنی خۆشی گەورەیە ناوەکەی تۆوی تیایە . کلاش[با] کاڵە [با]

( کاڵە کاڵ ) ز . باررە بارری مەرو لە کاتێکا کە بەرخەکەی ببینێت .

(کاڵەکوت) مێوژێکە کە بەدەسکو دۆل یا بە دەسکەوان کوترابێ و کرابێ بە شەربەت .

(کاڵەکەمارانە) گیایەکی دێمی یە دووجۆری هەیە ، یەکێکیان وەك مێو تەرز ئەهاوێ و بەرێکی خڕ ئەگرێ و ئەخورێ ، ئەوی تریان بەرەکەی وەك شووتی کۆڵە وایە وە زۆر تاڵە پێی ئەڵێن [ کووژاڵك ]

( کاڵە مستانە ) کاڵەمستێ .

( کاڵەمستێ ) جۆرە یاری یەکە یەکێك شتێك ئەشارێتەوە لە قوڵی مستیا. هەرکەس دۆزی یەوە ئەیبانەوە.

( کاڵەمشتێ ) کاڵەمستێ .

( کاڵەوبوون ) د . کاڵبوونەوە .

( کاڵەهێش ) د . زەمینێکە کە یەکجار تۆوی پێوەکرابێ .

( کاڵێ ) د . منالی سپی کەلە . ئەکرێ بە ناوی کچ .

( کالیار ) ترۆزیی گەورەی کەیوو .

( کالیماست ) ز . کەنمێکە لە سەر خەرمان بدرێ بە هەژار بەڵام بە ناوی زەکاتەوە نەبێ .

( کالیان ) د . هەڵکالیین بەسەر یەکیکا .

( کالیسکە ) د . کالیسکە .

(کالیوش) د . جۆرە خواردەمەنی یەکە لە کشمیش و گوێزی کوتراوو ڕۆن و د. کەشك دروست ئەکرێ .

( کالیی ) نەگەیویی میوە . بەکوڵاویی گۆشت : میوە، یاگۆشت بە کالیی ناخورێ .

( کالییت ) د . کۆلییت .

( کالییتکا ) د شوێنی کۆلییت

( کالیین ) د . کێلاں .

(کام)ووتەیەکە پرسیاری پێ ئەکرێ بۆ ناوبووس «تعیین» کردنی شتێك لە ناو چەند شتێکا : ئەمانە [کام] یان کورری تۆیە . ئارەزوو : بە [ کام ] ی خۆی گەیشت .

( کام ئاژنیین ) شووژن کردن بە مەلاشووی کەرا لە کاتێکا کە کامی

کردبێ .
( کاماخ ) ز . سمتی ئادەمیی و گیانداری تر .
(کامار) ز. کەمەی بێژنـگ‌ودەف.
( کاماش ) ز . تووتنێکە بە سەوزیی ووشك کرابێتەوە .
( کاماڤ ) ز . ئاوێکە کە لە جۆکەدا مابێتەوە دوای بڕینی لە سەرچاوەوە .
( کامباخکردن ) ز. وێران کردن.
( کامکردن) هەڵاوسانی مەڵاشووی ووڵاخی یەك سم لە حەلێکا کە ووڵاخێکی‌تر لەبەرچاوی ئەم ئالییك بخوا .
•(کامڵ) شتی پێگەیشتووی‌گەییو.
( کامۆخ ) ز . کەسێکە کەتریٚ بکوشێ .
( کامۆیی ) با . کام کردن .
( کامە ) ووتەیەکە پرسـیاری پێ‌ئەکرێ بۆ ناونووس « تعیـین » کردنێ شتێك لە ناو چەند شتێکا : ئەمانە ( کامە ) یان هی تۆیە .
( کامەتا ) کامە .
( کامەتانێ ) کامە .
( کامەتە ) کامە .
(کامەران) کەسێکە کە بەئاواتی خۆی گەیشتبێ .
( کامەرانیی ) بە ئاوات گەیشتن
( کان ) کونێکە کە دارتـاش بە ئەسکەنە لە دار هەڵی ئەکەنێ . جێگایەکە لە زەویی‌دا کە دەستی سوروشت شتێکی تیا دروست کردبێ وەك زێرو زیوو بەردو نەوت .
( کانکا ) شوێنێکە کە شـتێکی تیا پەیدا ببێ بە زۆریی : سلیمانی [کانکا] ی لۆکەو تووتن و میوەیە.
( کانگە ) کانکا .
•( کانوون ) دوومانگە لەناوەندی تشرینی دووهەم و شوباتا لە ساڵی ڕۆژیی ، کانوونی یەکەم مانگی دوانـــزە هەمە سیویەك ڕۆژە ، کانوونی دووهەم مانگی یەکەمەو سیویەك ڕۆژە .
( کانوونیی ) باڵنـدەیەکی ئاویی ماسیی‌خۆرە وەك قەلمراو وایە بەڵام ئەم بۆرە .
( کانە زبانە ) کانێکە کە زبانەی داری تێ‌ئەخرێ .

( کانە زووانە ) کانەزبانە .
( کانە شکاف ) کانەشکافە .
(کانەشکافە) کانێکی درێژ کۆلەیە دارتاش بەشتێکی تایبەتی هەلی ئەکەنێ لە سەرباری درێژیی بۆ تێبردنی شووشە یا تەختە .
( کانە شکاو ) د. کانەشکاف.
( کانەنیا ) د . رووانلن .
( کانێ ) ز . کوانێ .
( کانیاو ) ئاوی کانیی .
( کانیی ) ئاوێکە لە خۆیەوە هەل قولێ .
( کانییلە ) کانیاوی پچووك .
( کاو ) کەژی کرری درر .
کەوورك [د] مەردوومی بەدەعیەو دەمار (ز) . تاقی ناو شاخ . قینو رقێکە کە لە دلا پەسمەندە بووبێت دەربارەی یەکێك و پێی برێژێت : کاوی دلی خۆی پێرشت ، واتە بە دلی خۆی قسەی پێووت ، وە دلی خۆی سارێژکرد . زەرد .
( کاواتر ) ه . کۆتر .
( کاوان ) ه. ملە .
( کاوانەوە ) چووزانەوە .

( کاودان ) قاوورمە .
( کاولاش )کاوول ، لەکەلاوەی ئاشەوە وەرگیێراوە .
( کاولیی ) قەرەج . بێ شەرمی بێئابرروو .
( کاولیی ) د . کاوایی .
( کاوورر ) ساوای مەررە لەپاش بررینەوەی بەرگنەکەی تا یەك سالآنەی .
( کاوول ) جێگای وێرانی چۆل
[ کاوولبوون ] وێران بوون
[ کاوولکردن ) وێرانکردن .
( کاوە ) ئازارو ئێشێکە کە لە ئەندامی مەردوم پەیدا بێێ بەهۆی ئێیشی زۆر کردنەوە . نـاوە بۆ ئاسنکەرێکی کورد کە [زوحاك]ی کوشت .
( کاوەخۆ ) هێواشـی لەسەرخۆ : فیسارکەس زۆر کاوە خۆیە ، واتە لەسەرخۆیە .
( کاویان ) د . چووزانەوە .
( کاویانەوە ) د. کاوانەوە .
( کاوێژ ) جوونەوەی ئاژال شتی ناو سکی خۆی بە یەق کردنەوەی

بۆ ناو دەمی .
( کاوێژکەر )گیاندارێکە کە کاوێژ بکا .
( کاوییر ) ز . ووشتر خوار .
( کاویین ) د . مارەیی ژن .
( کاهوو ) گیایەکی گەڵا پانی بەهاریی ناوەرۆك چەوری سەلك دارە، زۆرتر بە سرکەوە ئەخورێ .
( کاهەرزانیی ) ە. هەنجییری رەشی زل .
(کاهێل) د. مەردومی تەمەلی سست
( کاهێلیی ) د . سستی وتەمەلی.
(کاهیی) جۆرە خواردەمەنی یەکە لە نیشاستە دروست ئەکرێ .
( کاهیی چی ) کەسێکە کە کاهیی بۆ فرۆتن دروست بکات .
(کایلۆش)د. دۆکەشك .کالیۆش
( کایە ) نۆرەیەك لە یاری یەك. یاریی .
( کایەکلێ ) د . کایەی یاریی .
( کایەگا ) د شوێنی یاریی .
( کایەل ) مەردومی خاوو خلیچك
( کایەن ) ژوورێکە کە کای تێ بکرێ .

( کپ ) گوێ ی گران : گوێم
[ کپ ] ە . دەرگـا و پەنجەرەی چەسپ کە با بوێری نەبێ . بێ دەنگیی و کشوماتی : دنیا [ کپ ] ە .
( کپ بوون ) گوێ گران بوون. جووت بوونی دەرگــاو پەنجەرەو گەلێ شتی‌تر بەجۆرێك کە با بوێری نەبێ . بێ دەنـگ بوون .
( کپەوبوون ) کپ بوون .
( کپیی ) بێ دەنگیی .
( کت ) کتتە . تاکێك لە شتی جووت [ز] .
( کتان ) ز . کوتان .
( کت بەچە ) ە . بەچکە پشیلە .
( کتتە ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ لە کاتێکا کە منال بکوژێ پاشتێکی لە بیین بگیرێ . ختتە [ز] .
( کتریی ) چاپەز .
( کتك ) پشیلە .
( کتکال ) ووتەیەکە گوفتوگۆی پێ ئەکرێ لە گەل ئافرەتا وەکو ووتەی : [کچێ]: [کتکال] ئابێ ، واتە کچێ وەرە .
( کتکە کێفـییلە ) د . پشییلە

کێوبی .

(کتکه نەفتیینه) د. کتکه نەوتیینه.

( کتکه نەوتیینه ) بریتی یه له یەکێك که ببێ بە هۆی ئاژاوەو هەرایەکەوە .

( کتۆ ) ووتەیەکه بەکاردێنرێ له جێی ووتەی چۆن .

( کتوپرر کوتوپرر .

( کتوکوێر ) کوتوکوێر .

( کتومت ) کوتومت .

( کتووت ) ز . نانی ووشکەوە بووی کۆن .

( کتوێی ) چۆنێتی .

( کته ) پشیله [ه] . کتته [ز].

•(کتێب) نوسراوێکی رێكخراوی چەند پەرەیی‌یه لەهەمووزانیاری‌یەك که گوڤارو رۆژنامه نەبێ .

•(کتێبخانه ) شوێنێکه که کتێبی زۆری تیابێ .

•( کتێو ) کتێب .

•( کتێوخانه ) کتێبخانه .

(کچ) ئافرەتێکه که هێشتا شوو نەکردبی . ئەوەی مێینەی باوكو دایك .

(کچانه) شتێکه که هەربۆکچ بشێ.

( کچانیی ) کوررێکه که خووی کچێ ببێ .

( کچك ) بچووك .

( کچکه ) د. شتی بچکۆله .

( کچۆله ) کچی بچکۆلانه .

( کچەزا ) منالی کچ .

( کچەزازا ) منالی منالی کچ .

( کچێنه ) رەشێنەی چاو .

( کچێنی ) ماوەیەکه که ئافرەت بەکچی تیا بمێنێتەوە . چۆنێتی‌یەکه له زێی کچابە یەکەم جار چوونه لای نامێـــنێ و خوێنی لێ دێ . خوێنێکه له زێی کچ دێ له کن چوونه لای یەکەمجار .

( کخ ) قخ .

( کخس ) با . پیازی فیسقه .

( کخه ) قخه

( کدارك ) ز . کارك .

( کدوو ) کووله‌که .

( کدوولفکه ) لفکەشامی .

( کر ) رایەلی جۆلا . شـــالی رانکو چوغه .

(کراس) جۆره کالآیەکی قۆل و

بەرۆکداره لەژێرەوه لەبەر ئەکرێ.
( کراسی زرێ ) شتێکه لەزرێ لە وێنەی کراس دروست کراوە لە کاتی جەنگا لەبەر ئەکرێ .
( کراسەکردن ) بە سابوونێکی بەزیی ئەڵێن کە بەتەواویی کولاّبێ و بلقی گەورە گەو ە هەڵبدات .
( کرانباوگاو ) جۆرە جنێوێکی کوردیە .
( کراو ) کارێکەکە کرابێ .
( کراوه ) لۆکەیە کە هەلاجیی کرابێ . شتی وال .
( کراهە ) د. کرێ .
( کراهەپا ) د. پێمز .
( کرتان ) ز . کامێشی خەساو.
( کرتاندن ) قرتاندنی شت بەدان .
( کرتانکرن ) ز . خەساندنی کامێش .
( کرنکرن ) ز . نیشانە کردنی دار بە لەلەکردنی بەمشار .
( کرتمرت ) ز . کەلوپەل .
( کرتناك ) ز . تیپروك .
( کرتوپان ) ز . کالاّو بەرگێکە کە باش دروست نەکرابێ .
( کرتوو ) گیایەکی باریکی قایمە وەك زەل دەسکە کول و شەتڵێ پێ ئەبەسترێ .
( کرته ) دەنگێکە وەك دەنگی شت خواردنی مشك ، [ کرتەکرت ] کرتەی یەك لەدوای یەك ، [ کرتو هوورر ] کرتەکرتی زۆر .
( کرتەك ) ز . بەفرێکە کە بەستبێتی وە بەهۆی بارانەوە دررنال دررنال بووبێ .
( کرتی ) کرتوو .
( کرچ ) گۆشت و میوەی کال . شتی سیس [د] .
( کرچه ) جۆرە دەنگێکە وەك دەنگی پچرپینی دەزوو یا دەرکێشانی دان ، [ کرچەکرچ ] کرچەی یەك لە دوای یەك ، [ کرچو هوورر ] کرچەکرچی زۆر . کرشە .
( کرچیان ) د . چرچبوون و ژاکان .
( کردار ) کردەوە .
(کردگار) خوای گەورە . کردار.
(کردم) وونەیەکە لە باتی ووتەی [ گییرەم ] بەکار دێنرێ : تۆ بچۆ

بۆ لای فیسارکەس [ کردم ] لەوێ نەبوو ، واتە گیرەم .

( کردن ) بەجی هێنانی کارێك .

( کردنەوە ) شیی کردنەوەی لۆکەو خوری بە چەکەو کەوان . خاو کردنەوەو هەڵگرتنی قفلی داخـراو بە کلیل . خاو کردنەوەی گرێ و شتی پێچراوە : گرێکە یا بارەکە [ بکەرەوە ] . خستنە سـەرپشتی پەنجەرەو دەرگای پێوەدراو. رزگار کردنی پیاوێك کە لە ژنەکەی بەسترابێ بە رەنگێکی وا کەبتوانێ لە کەڵیا دروست بێ . کردنی کارێك دووبارەوسێ بارە: نوێژەکەت [ بکەرەوە ] . چنینی میوەو گوڵ: گوڵەکە یا ترێ کە [ بکەرەوە ] . شکاندن و لەتکردنی دار : هێندێ دار [ بکەرەوە ] . دەست کردن بە کارێکی کرنـگ : حەفلەکەی بە ووتارێك کردەوە .

( کردوکۆشیی ) هەوڵ و تەقەلا بۆ ژیان .

( کردوکێش ) د . ئاسنێکی دەم پانی کلك درێژە بە دوو کەس دیزاوێکی پێ هەڵئەدرێتەوە .

( کردە )کردەوە: کردەپەشیمان بە ، نەکردە پەشیمان مەبە .

( کردە پەشیمان ) کەسێکە لە کردەوەیەکی خۆی پەشیمان بوو بێتەوە

( کردەوە ) ئەوکارەیە کە مرۆڤ بیکا .

( کرر ) مریشکێکە ئـارەزووی کەوتنی سەرهێلکەی بێ بۆ هەڵهێنانی. گیانداری بێدەنـگ : منـاڵەکە [کرر] ە ، واتە بێ دەنگە .[کرربوون] بێ دەنـگ بوون [ کرر کردن ] بێ دەنـگ کردن .

( کرراژ ) د . مێوی هەنگوین .

( کرراش ) د . کرراژ .

( کرراك ) د . کرر کرراکە .

( کرراکە ) د . کرراك .

( کرراڵ ) د . کررێن .

(کرراندن) لابردنی شتێك لە سەر شتێك بە لووتی شتێکی تیژ .

( کرراندنەوە ) گۆشت کردنەوە لە ئێسقان و داررووتاندنی بە دان یا بە چەقۆ .

( کررانن ) د . کرراندن .

( کررانئەوە ) د . کررانئدنەوە.
( کررانەوە ) کررانئدنەوە . ترۆخا ئەوەی قووررك بەهۆی سەرما بوونەوە
( کرراو ) شتێکە کەکرر ێنرابێ .
( کرراوە ) ئێسقانێکە کە کررێنرابێتەوە .
( کرربوون ) کش‌ومات بوون :
[ کرربە ] واتە بێ‌دەنگ بە .
(کرربوونەوە) ئەمانی‌دەنگەدەنگ. ئەمانی دەنگ و باسێك کە بلاو بوو بێتەوە .
( کررخەو) کەسێکە کەبەتەواوی خەوی لێ‌کەوتبێ .
( کرررراو ) شتێکە کەکرببێتت.
( کرر کردن ) بریتی‌یە لە کوشتنی یەکێك بە دزی‌یەوە .
(کررکرراکە) ئێسقانێکی تەنکی نەرمە لە کویچکەی گیاندارا .
( کررکررانە ) با . کررکرراکە
( کررکررك ) با ، کررکرراکە .
( کررکررە ) ناوە بۆ جۆرە ترێ یەك [ با ] . لوولەی هەناسە .
( کررکەفتن ) د . کررکەوتن .
(کررکەوتن) کەوتنی مریشك بە سەر هێلکەدا بۆ هەڵ هێنانی .
( کررکەوتوو ) مریشکێکە کە کەوتبێ لەسەر هێلکە بۆ هەڵ هێنانی
( کررندە ) کرریار .
( کررنك ) کررنگ .
( کررنگ ) دەعبایەکی سوورکە لەیە وەك کەنە بەلام پچووکترە . گەر چەك [د] .
( کررنوو ) کررنگ . کررنووش بردن .
( کررنووش ) کررنووش بردن.
( کررنووش بردن) سەردانەواندن و چەمیینەوە لەبەر دەمی یەکێکا بۆ بەگەورە راگرتنی .
( کررنە ) کررنگ .
( کرروك ) رەگ و ریشە .
( کررو کاش ) د . کردوکۆشیی.
( کررووز ) د . کورررووز .
( کرررووس ) د . کەرر .
( کرررووش ) ووتەیەکە کەری بێ‌بانگ ئەکرێ .
( کررە ) شتێکە وەك بەرداش بازنکەی سەرەوەی لە توولی مێو دروست ئەکرێ ، لە پاشا بەچەند

دارێکی بێی ناوه کەی پررئه کریتەوه ، وه کررەی چەلتووکی پێ ئه کرێ . جۆره دەنگێکه وەك دەنگی له یەك خشانی دووبەرد به نهێـم ، [ کرره کرر ] کررەی یەك لەدوای یەك [ کرروهوورد ] کرره کرری زۆر .

(کرره کردن) چەلتووك سپی کردن. بـریتی‌یه له بوونی کەسـێك به مەمنوون له شتێك: فیسارکەس به فیساره شت کرره ئەکا ، واته زۆر حازی لێ‌یەتی .

( کرریار ) کەسێکه که بیەوێ شتێك بکررێ .

( کررپاك ) کرراو . کرراو .

( کررێژ ) کررێش .

( کررێژاویی ) کررێشاویی .

(کررێش) چلکی بەسەریەکا کەو تووی ووشکەوه بوو . ووشکەلی شانه هەنگوین .

( کررێل ) مەردومێکه که قسه وەرنەگرێ .

( کررێڵ ) د . شـوێنی کررێن

(کررێن) زەویی چەولگی‌سەخت .

( کرریوکرریو ) ه . ترەوژه .

( کرریوه ) کاتێکی زۆر سارده که به فریا باران به باوه بیارێ .

( کررێین ) سەندنی شت بەپاره .

( کررێینەوه ) بریتی‌یه لەرزگار کردنی یەکێك له چورتمێك : ئەم پالتۆیه ئیمسال منی [ کرری‌یەوه ] یا تۆ منت [ کرری‌یەوه ] واته رزگارت کردم .

( کرژ ) هەودای زۆر بادراو . شتی هەلقرچاو : چەرمه که هەتاو [ کرژ ] ی کردووه . خێراو چەسپان [ د ] . مووی لوول ، [کرژ بوون] با خواردن . هەلقرچان. لوولبونی موو ، [ کرژ کردن ] لوولکردنی موو . خێراکردن [د].

( کرژهەلاتن ) هەلقرچان .

( کرژیی ) بوونی شت به کرژ.

( کرشه ) کولۆشه .

( کرك ) شوێنی تەختی رووتەن

( کرکایکرك ) کاکیی بەکاکیی .

( کرم ) گیاندارێکی باریکی درێژی پچکۆلەیه .

( کرماج ) د . کرمانج .

( کرماجی ) د . کرمانجی .
( کرماج ) ناوی هۆزێکی گەورەیە له کورد .
( کرمانجی ) زبانێکه که هۆزی کرمانج قسەی پێ ئەکەن .
(کرماندن) وورد کردنی شت به دان .
( کرمانن ) د . کرماندن .
( کرماویی ) کرمێ .
( کرمخواردوو ) شتێکه که کرم تێی دابێ و خواردبێتی .
( کرمخوارده ) کرمخواردوو .
( کرمژنه ) شـتێـکه که کرم تێی دابێ .
(کرمشیین) ز . چرچ بوونی کالاّ .
( کرمکار ) د . بەلەد و شارەزا به کارێك .
( کرمکوژه ) ڕیوا‌سیی .
( کرمکه ) جـۆره نەخشێکه له چیمغ دروسـت ئەکرێ له وێنەی کرمەکی ژنان . کرمەك [د] .
( کرمکییز ) ز . نەخۆشـی‌یه که له کرمی زۆری ناوسـکەوه پەیدا ئەبێ .

( کرمن ) بریتی‌یه له مەردومی قیین له سك .
( کرمۆکه ) کرمەك .
( کرمۆل ) شـتێـکه که کرم خواردبێتی .
( کرمووژن ) د . کرمژنه .
( کرمه ) دەنگێکه وەك دەنگی خواردنی هێندێ شتی رەق بەدان،
[ کرمەکرم ] کـرمەی یەك له دوای یەك [ کـرمو هوورر ] کرمه کرمی زۆر .
( کرمەژن ) کرمژنه .
( کرمەژنه ) کرمژنه .
( کرمەك ) جـۆره خشڵێکی زێڕیینی دانەدانەی هۆنراوەیە، ژنان ئەیدەن له ژێـر چەنەیان . زبانەی شت [د] .
( کرمێ ) کرمەژنه .
( کرمی ئاوریشم ) جۆره کرمێکه ئاوریشم هەل ئەپێچێ .
( کرن ) ز . کردن .
( کرناس ) ز . مەردومی دەم و چاو ئاولاّویی .
( کرنـگ ) کررنـگ .

( کرێنیی ) ز . کررنـك .
( کرۆزرۆ ) ه . گیا تویسیی .
( کرواس ) کراس .
( کرۆتن ) کورۆشتن .
( کروچ ) شتی لەتوکوت .
( کرۆژتن ) کورۆشتن .
( کروسـك ) با . درەختێکە لە هەرمێ موتوربەئەکرێ بەرێك ئەکرێ وەك هەرمێ کێوییلە وایە .
(کرۆسك) کروسك . خەنجەری کۆنی ژەنکاویی[ز]. هەرمێ کێوییلە
( کرۆشتن ) کورۆشتن .
( کروییت ) د . کبرییت .
٠( کرێ ) مـزێکە بەرامبەر بە کردنی کارێك بدرێ .
( کریانەوە ) د . کرانەوە .
٠( کرێبار ) کرێیەکە کە بدرێ بۆ هەل کرتنی بارێك .
( کرێت ) شتی ناشیرین [با] . کولۆوکەرسەك [ز]
( کرێچ ) ز . سوالەت .
٠( کرێ چیی ) کەسێکە بەکرێ لە شوێنێکا بێ .
( کرێداسیی ) سەپانیی .
( کریسك ) با . پزیسك .
( کرێشە ) جۆرە تەنراوێکی کرژی تەنکە لە لۆکە دروست ئەکرێ .
( کرێڤ ) ز. کەسێکە کە منال بکرێتە باوەشی بۆ خەتەنەکردنی .
( کرێڤا ) ز . کرێڤ .
٠( کرێکار ) کەسێکە بەرۆژانە کار بکا .
( کرێکاریی ) ئیش کردن بەکرێ
٠(کرێگرتە) کرێ چیی . شتێکە بە کرێ گیرابێ .
( کرێو ) دۆستێکە کە خزمایەتی ببێت .
( کرییس ) ووتەیەکە کارژۆلەی پێ بانـگ ئەکرێ .
( کرییڤت ) با . هاوررێ .
( کریین ) ز . کریان .
( کرینچك ) پەرچەم .
(کز)گیاندارو سەوزایی بێ کەیف. هێندێ شتی کەم: ئیمسال ترێ یا ناو [کز] ە . هێندێ شتی بێهێز: رەشەباکە [ کز ] ە . چـرا یا ئاگرێکە کە گرری کەم بێ .چاوی کەم هەنا .

( كزاندنەوه ) چووزاندنەوه .
( كزانن ) د . كزاندنەوه .
( كزانەوه ) د . كزاندنەوه .
( كزانەوه ) چووزانەوەی ئەندام .
( كزبوون ) بێ كەیف بوون . كەم بوونی شت . بێ‌هێزبوون. كەم تیـین بوونی چاو . بێ‌شـەوق بوونی چراو ئاگر.
( كزخاندن ) ز. هەڵپاچینی درەخت بۆ جوانیی و بەخۆداهاتن.
(كزر) شتێكی تەرره كە كەمێك ووشك بووبێتەوه . گیاندار یاسەوزا یی‌یەكە كە بە خۆیا هاتبێ و لەخەم رەخسیبێ .
( كزران ) شوێنێكە كە هەرچەن باران بیارێ ئەو هەر كزربێ .
( كزراندن ) ز. هەڵپرووزاندنی خوریی .
( كزربوون ) خررەڵەبوون و بە خۆدا هاتنی گیانداروسەوزایی .
( كزربوونەوه ) كەمێك ووشـك بوونەوەی شتی تەرر .
( كزریی ) بوونی شت بەكزر.
( كزك ) ز . چزلیك .
( كزكردن ) كەم كردنەوەی گرری چراو ئاگر .
( كزكۆڵە ) د . كزۆڵە .
( كزكۆڵەكردن ) د . كزۆڵەبوون
( كزكە ) د . كزكۆڵە .
(كزكریین) ز . داچڵەكینی تالی هاتوو .
( كزمك ) ز. سەركۆزەری گەنم
( كزن ) دانەویلەیەكە وەك ماش كەڵای وەك نیسك وایە، بەخووساوەیی لە زستانا ئەدرێ بە رەشە ووڵاخ .
( كزۆڵە ) گیانداری كزۆڵ .
( كزووریی ) ز . كاڵای خوری هەڵ پرروزاو .
( كزە ) سـرووەی با . جۆرە دەنگێكە وەك دەنگی گۆشتی سوور كراوە لەسـەر ئاگر ، [ كزەكز ] كزەی یەك لە دوای یەك ، [كزو هوورر] كزەكزی زۆر .
( كزەبا ) بای سووك .
( كزەڵۆك ) كزۆڵە .
( كزەی جەرگ ) بریتی‌یە لە رۆڵەی خۆشەویست .
( كزیان ) د . چووزانەوه .

( کزیانەوە ) د . کزانەوە .

( کزێنکە ) هەویرێکی شلە بە دەست پان ئەکرێتەوە بەسەر ساجا بۆ برژاندنی .

( کزیی ) زەبوونی و بێکەیفی .

( کزییر ) ز . کزییر .

( کژ ) مووسم : ئێستا کژی تۆوە ، یا کژی شەتلی نووتنە .

(کژبلۆك ) ز . گیایەکە بنکێکی هەیە بەپاك کراویی ئەخورێ .

( کژك ) د . کەژوو .

( کژگ ) ه . تیلمەیەکی درێژە دروست ئەکرێ و تەنگەو قەیاسەی وولاخی پێئەدرێ .

( کژوورەك ) ز . خێزەرە .

( کژەبارانە ) بارانێکە کە لەکاتی خۆیا بێ .

( کس ) ووتەیەکە مەرری پێ لێ ئەخورر رێ .

( کسپوکز ) کرروکەرمییەکە لە دەروونا پەیدا ئەبێ بەهۆی تووررە بوون و رق هەستانەوە : ئەوەندەم قسە پێووت تا [کسپوکز] ی دڵی خۆمم پێرشت .

( کسپە ) دەنگێکە وەك دەنگی کردنی ئاوبەسەرئاگرا ، [کسپەکسپ] کسپەی یەك لە دوای یەك ، [ کسپو هوورر ] کسپە کسپی زۆر .

( کسـس ) کس .

( کسکس ) ووتەیەکە سەگی پێتێبەر ئەدرێ لە شت .

( کسك ) با . چزلییك .

( کسکۆڵە ) د . کزۆڵە .

( کسکە ) د . کزۆڵە .

( کسکیانەوە ) د . کزانەوە .

(کسۆك) تووتکە سەگ . سەگ .

(کش) ووتەیەکە باڵندەی پێ دەر ئەکرێ . سواربوونی یەکێك لە ئەندامەکانی شەترنج بەسەر شادا .

( کشان ) رۆیین و تێپەرریینی شتێك بە گورجیی : ئەو ئەستێرەیە یا ئەو زەلامە [ کشا ] . کەش هاتنی شت .

(کشاندن) خشاندن . کەش هێنان بە شت : لفکەکە [ بکشێنە ] .

( کشان کشـان ) ووردە ووردە کشان و تێپەرریینی شت : فیسار کەس [ کشان کشان ] هات .

(کشانەوە) گەررانەوەی شت بۆ دواوە : ئاوەکە یا لەشکرەکە [ کشایەوە ] .
(کشپل) پشقل .
(کشت) دانەویڵەی چێنراو . کرژ .
(کشت‌سازیی) إصلاحی‌زراعی.
(کشتکە) مەزرەعە .
(کشتوکاڵ) تۆوکردن و چاندنی شەتڵ لە زەوییدا .
(کشتەك) چەن هەودا دەزووـ یەکی بەیەکا بادراوە .
(کشتیار) خاوەنی کشت‌وکاڵ.
(کشش) کش .
(کششە) کش .
(کشکش) د . هەڵپەررین .
(کشکە) ﻫ . بژار .
کشمیش) ووشکەوەبووی ترێی دەنك ووردی بێ‌ناووك .
(کشمیشی) جـۆرە ترێیەکی سپی دەنك ووردی بێ‌ناووکە .
(کشنییژە) د . گژنییژە .
(کشومات) شتی بێ‌دەنگی‌بێ‌خشە
(کشوماتیی) بوونی شوێنێك بە کشومات: کشوماتیی جیهانی داگرتووە
(کشە) ووتەیەکە پەلەووری پێ‌دەرئەکرێ .
(کفت) ماندوو . شتێکی زەردی جوانە وەك زێرر وایە لە رووی‌هێندێ شت ئەدرێ بۆ جوانی . خۆرە [د] .
(کفتك) ز . شقارتە .
(کفتکاریی) بەکارهێنایی کفت لە هێندێ شتا بۆ جوانیی .
(کفتوکۆ) سفتوسۆی . کسپوکۆ.
(کفتە) جورە خواردەمەنی‌یەکە دروست ئەکرێ لە قییمە و برنج و خرر هەڵ ئەدرێ و ئەکوڵێنرێ یا سوورئەکرێتەوە .
(کفتە شۆربا) چێشتی کفتە .
(کفتتە شۆروا) کفتە شۆربا .
(کفتی) ماندوێتی .
(کفر) دارێکی کەڵا ووردە لە خرروچەم و رووبارا ئەرروێ و بۆ سووتاندن بەکار دێنرێ .
(کفرێن) جۆرە یاری‌یەکە بە هییچ ئەکرێ .
(کففە) جـۆرە دەنگێکە وەك دەنگی هاتنە دەرەوەی خوێن لەکاتی

سەربرینی ئاژالا .
( کفکێ ) کێکف .
•( کفن ) بلووری یا خامێکە کە لە مردوەوە بپێچرێ .
•( کفن دز ) کەسێکە گۆرری مردوو هەڵ بدانەوە بۆدزینی کفنەکەی
( کفە ) کففە ، [ کفە کف ] کففەی یەك لە دوای یەك .
( کڤارك ) با . قارچك .
( ککەو ) کەووت .
( کل ) سورمەی چاو . شتی کلا. گومەز [ز] . ناردن : [ کلم کرد ] واتە ناردم .
( کڵ ) گۆزەودیێزەی لەسەریەك کەڵەکە کراوی ئاگر تێبەردراو بۆ سوور کردنەوە. تاقی پرد . گرری ئاگر : ( کـڵ ) ی ئاگـرەکە لە دوورەوە دیارە . کل [د] ،
( کلا ) شـتێکە کە کەوتبـێتە کەنارەوە ، [ کلابوون ] کەوتنە کەناری شت .
( کلاش ) جۆرە پێلاوێکە ژێری لە پەررۆ دروست ئەکرێ و سەری لەبەن یا لە دەزوو ئەچنرێ .
( کلاشچن ) کەسێکە کە سەری کلاش بچنێ .
( کلاشدروو ) کلاشچن .
( کلاشدم ) دووپشك .
( کلاشەکردن ) هەڵگیرانی قورر بە پێـلاوەوە لە کاتێـکا کە زەویی بووبێ بە قورر .
( کلاشبین ) د. خوراندن .
( کلاف ) د . کلافە .
( کلافە ) چەن هەودا دەزوو یان ئاوریشمێکە کە پێکەوە هەڵ کرابێ بۆ ئەوەی تاو تاو دەرکێشرێو کار بکرێ . شتێکە لە بەن ئەهۆنرێتەوەو جوانووی پێ ئەبەسترێنەوە بۆ ئەوەی دابیێن و دەستەمۆ ببێ : ئەم نۆمابە [ کلافە ] نەکراوە بۆیە وا سرکە .
( کلافەکردن ) بەستنەوەی نۆما بە [ کلافە ] .
( کلافە هەڵکەر ) گوڵەژەن .
( کلاکردن ) لاخستنی شتێك .
( کلانە ) قۆپچەی گەورە .
( کلاو ) شـتێکی تەنکی کردە ئەکرێتە سـەرو سەرپێچی لەسـەر ئەبەسترێ .

( کلاوئالتوون ) کلاوێکی ژنانەیە غازیی یا لیرەی پیادا دروابێ .
( کلاوبۆرگە ) کلاوێکی لبادینە بەسەر فەرەنجی‌یەوە شوان لە بارانا ئەیکاتە سەری .
( کلاوبۆرە ) کلاوبۆرگە .
( کلاوچن ) کلاودروو .
( کلاودار ) بالندەیەکە کە لە تووکی سەری کلاوی بێ .
( کلاودروو ) کەسێکە کە هەر کلاو بدروێ .
(کلاورۆژنە) کونێکە لە ناوەڕاستی بانا بۆ رووناکی و دووکەڵ لێوە دەرچوون ئەهێلرێتەوە .
( کلاورەش ) دەردێکی کوشندەیە دووچاری بزن ئەبێ، ناوسکی هەڵ دەئاوسێ و خوێنی تێ ئەزێ .
( کلاوزرێ ) جۆرە کلاوێکی زرێ دارە لەرۆژی جەنگا ئەکرێتە سەر .
( کلاوزەرر ) کلاوزێرر .
( کلاوزێرر ) کلاو ئالتوون .
جۆرە کلاوێکی ئالتوونە ژنان وەك تاس ئەیکەنە سەریان لەسەر کلاوەوە
( کلاو فەررەنگی ) کلاوێکە

ئەدرێ بەسەر لوولەی سۆپادا بۆ ئەوەی کەدووکەلەکەی باش دەرچێ وە یا نەی گێررێتەوە .
( کلاو کلاوێن ) یاری یەکی دوودەستەیی یە وەك یاریی گۆرەویی بازیی، بەلام ئەم بە کلاو ئەکرێ. پشکێیلان
(کلاوکوررە) بالندەیەکی پچکۆلەیە بە قەد چۆلەکەیەك ئەبێ کلاوێکی لەپەرر بەسەرەوەیە .
( کلاوگەزە ) کلاوبۆرە .
( کلاونە ) کلاودار .
( کلاوە ) ئاخلەیەکە دروست ئەکرێ لە قورر یا لە هەویر بە دەوری گوێرووی بەرداشا بۆ ئەوەی [ دانەرێز ] نەکات . ئەوقەسەری شاخ . پووچەکی زەررات: زەرراتی ئەمسالمان هەمووی [ کلاوە ] یە.
کلاونە [د] . کەلەمەی جووت .
(کلاوەسوورە) گیایەکی بەهاری‌یە وەك پیشۆك بەلام ئەم توێکلی زۆر سوورە .
( کلاوەکردن ) بریتی‌یە لەباران و بەفری دەنك گەورە
( کلاوەی بەیاخ ) د. ئاسنێکی

لروت نییژە ئە رێ بەسەری بەیاخا .
( كلاوێن ) كلاو كلاوێن .
( كلب ) ز . كەلبە .
( كلبوون ) گواستنەوەی یەكێك
لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێك .
( كلپە ) دەنگێكە لە كری ئاگر
پەیا ئەبێ ، [ كلپە كلپ ] كلپەی
یەك لە دوای یەك ، ( كلپوهوورر )
كلپە كلپی زۆر .
( كلتوور ) توورەكەیەكی بچكولانەیە
كلی هارر راوەی تێ ئەكرێ .
( كلچان ) ز . فانۆزی دەستیی .
( كلچۆڤ ) ز . كلچێوك .
( كلچێوك ) شـتێكی باریـكی
لووسـە ئەكرێ بە كـلاو چـاوی
پێ ئەرێژرێ .
( كلچییڤ ) با . كلچێوك .
( كلدان ) كلتوور .
( كلدان ) كلدان .
( كلفت ) د . شتی ئەستووری زل .
شتی زۆر : فیسار كەس پارەیەكی
[ كلفت ] ی هەیە .
( كلفتیی ) د . زۆریی . ئەستووریی شت
( كلفەت ) د . بریتی‌یە لەخێزان و
ماڵو منداڵ . كارەكەر .
( كلفەتبار ) د . مەردوومی خێزاندار
( كلك ) شتێكی باریكە وا بە
عاستی سمتەجوڵەی هێندێ گیاندارەوە .
قەڵەم [د] . پەنجە .
( كلكاف ) د . مازوو .
( كلكانیی ) بریتی‌یە لەمەردومی
شێت و وێت : فلأن كەس پیاوێكی
كلكانیی‌یە .
( كلك بەس ) د . بریتی‌یە لە
كەسێك كە دەستەشكێن كرابێ .
پەتێكە لە پەنجە كرێ ئەدرێ بۆ
بیرخستنەوەی شتێك .
( كلك بەسە ) د . كلك بەس
( كلك پێوەكردن ) بریتی یە لە
گاڵتەكردن بەیەكێك . پەنجەكردن
بە قنگی یەكێكا .
( كلك تەقینە ) كلكەهەڵسەنگینە .
( كلكدار ) شتی خاوەن كلك .
هێندێ شتی دەسكدار : ئەو تاوە
[ كلكدار ] ە م بدەرێ .
( كلكردن ) د . كەنارەگرتن
ناردنی یەكێك بۆ شوێنێك .
( كلك گرتن ) كلك بەرز كردنە
وەی ووڵاخی بەرزە لەكاتی سواربوونیا .

( کلك کێبر ) د . قوشقنە .
( کلك نما ) د . ئەنکوشت نما.
(کلك نیشان) د . ئەنکوشت نیشان.
( کلکوانە ) د . کلکەوانە .
( کلکە )شتێکە وەك مرۆر بەلام ئەم پچووکترەو کلکێکی باریکی هەیە . داوێنی کێو .
( کلکە تووتە ) د . پەنجەتووتە.
( کلکە ررەقە ) ئەخشێکە لە تەون دروست ئەکرێ لە وێنەی کلکی رەقەدا .
( کلکە رێویی ) ناوە بۆ جۆرە ترێ یەك .
( کلکە سووتەکە ) کلکە لەقێ .
( کلکەسووتەکێ ) کلکەسووتەکە
(کلکەتنکێ) بریتی یە لەجوولاندنی یەکێك بە کردار یا بە گوفتار : [ کلکە تنکێ ] ی مەدە ، واتە مەی جوولێنە یا سەرمەکەرە سەری .
( کلکە کەڵە ) د . کلکەگەورە.
(کلکەگەورە ) د . پەنجەی گەورە.
( کلکە لەقە ) کلکە لەقێ .
( کلکەلەقێ ) بریتی یە لەریایی و رووپامایی یەکێك بۆیەکێکی تر بە گوفتار یا لەگەڵ کردارا .
( کلکەمار ) بریتی یە لە شتی زۆر تاڵ .
( کلکە مارکردن ) زەقنەکردن.
( کلکە نما ) د . کلك نما .
( کلکەوانە ) ئەموستیلە . ئەموستیلەی درومان .
( کلك هەڵسەنکێنە ) باڵندەیەکی پچووکی کلك درێژە هەمیشەکلکی هەڵ ئەسەنگێنێ .
( کڵکە ) پرد .
( کلم ) چلمی خەستەوەبوو .
( کلمن ) چلمن .
( کلمیش ، یا کلمیش .
( کلمیش ) ز . چلم .
(کلناشك ) درر کودالی دەشتەکە لە هاوینانا ووشك ئەبێتەوەو یا ئەی شکێنێتەوەو ئەیباتە ناو دۆڵ و دەرەوە .
( کلۆ ) کوللە .
( کلۆ ) کولێ .
( کلۆت ) کولۆت .
( کلۆچ ) ز . جۆرە مارمارۆکە یەکی پێچ پێچە وەك بازن .

(کلۆخ) ز. یەك سەر لە ئاژاڵ .
( کلۆخ ) با . کاسەی سەر .
( کلۆر ) ز . کلۆچ .
( کلوسك ) با . کووپەلە .
( کلۆش ) کولۆش .
( کلۆفت ) د . کلفت .
( کلۆك ) کلۆت .
( کلۆل ) کولۆل .
( کلۆلاش ) هـ. کیایەکی بەرزە قۆزاخە یەکی دەنك دەنکی باریك ئەگرێ و دانی پێ ئەناژنرێ .
( کلۆم ) کولۆم .
( کلوو ) کولوو .
( کلووك ) کولووك .
( کله ) کل [د] . کلی پرد .
( کلەپێچ ) ز . خشتی کاڵ .
( کلەدان ) د . کلدان .
( کلەو ) ئاوێکە لە رووبارێکی گەورەدا کە پێ بەسەر بەستێکا ، وە بە زەقی بکشێ بەسەریا : ئاوە کە [ کله ] و ئەکات .
( کلێچە ) کلێنچکە .
(کلێس) شتێکە کە بنەبرر بووبێ: تیرەی هەمەوەند [ کلێس ] بوو ،
[ کلێس بوون ] بنەبرربوون .
( کلێسمان ) ز . کلێکە کە بۆ جوانیی بەکار بهێنرێ .
(کلێسە، جێیخواپەرستیی گاوران. ناوی دێیەکە لە ناوچەی قەرەداخ.
( کلێل ) د . کلیپل .
(کلێلوکۆم) د . کلیپلو کولۆم .
( کلێلە ) د . کلیپلەی بەفر .
(کلێلەبوون) د. دەمچوونە کلیپلە.
( کلێنچکە ) ئێسقانێکی باریکی گرێ گرێی کورتە بەژوور قنگی بزن و مەررو هێندێ گیانداری ترەوە لە جیاتی کلك .
( کلیپسا ) کلێسە .
( کلیپسە ) کلێسەی گاوران .
( کلیپسە ) کلیپسە .
( کلیپش ) شارای خەلەوخەرمان
( کلیپشە ) بن باخەل . وێنەی شت کە بە قەبارە دەربێنرێ بۆ ئەوەی کە وێنەی زۆری لەسەر کاغەز پێ دەربهێنرێ .
( کلیپل ) شتێکی زبانەدارە قفل یا کلێمی دەرگای پێ ئەکرێنەوە .
( کلیپل بە دەست ) کلیپلدا .

( کلییلدار ) کەسێکە کە کلیلی شوێنێکی بەدەست بێ .
( کلییلدان ) داخستنی شتێك بە کلییل .
( کلییلوکۆم ) کاییلو کولۆم .
( کلییله ) بەفرێکی زۆره کە با لەپەنایەکا پێچی دابێو کۆی کردبێتەوه
( کماخ ) کاماخ .
( کمکمه ) با . قۆرریی .
(کن) لای شت : له [کن] تۆیه وانه لای تۆیه . شتی کورت [ز] .
( کنا ) د . کناچه .
(کناچه) ه . کچێکه کە شووی نەکردبێ . ووتەیەکە وەکوو ووتەی [ کچێ ] .
( کناچێ ) ه . کناچه .
( کنج ) د. شتی کال و کرچ .
( کنجرر ) با . پەررۆ .
(کندر) جۆره دەزوویەکی بارییکە بەمەکیینه دروست ئەکرێ . کنگر. کۆشی شەکرو شرێتی ئەستوور .
( کندر درك ) کەرتەشیی .
( کندرر ) کندری دەروو .
( کندره ) کندری دەزوو .
( کنر ) کندر .
( کنـگ ) تنـگ .
(کنگر) گیایەکی بەهارییی درر کاویی یه هەڵئەکەنرێو ئەخورێ .
( کنگرەکەرانه ) کەرتەشیی .
( کنوکۆ ) د. کردو کۆشیی .
( کنه ) کارکردن له پیك هێنانی کارێکا هەمیشه و لەسەرخۆ : هەر [ کنه ] یەتی .
( کنێر ) داری مەلحەم .
( کنێره ) کنێر .
(کنییوال) جۆرێکه له قورراده .
( کۆ ) کۆمەڵە ئەستێرەیەکی بە ناوبانگە بە ناوەراستی ئاسمانەوه . کۆمەل : منالەکان هەموو [کۆ]ن . دەردێکە ئەدا له چاوی وولاخی بەرزەو ئاژاڵ هێندێ جار کوێریان ئەکات . کوێ . کەژ [د] .
(کوا) ووتەیە کە داوای پیشا ندانی شتێکی پێ ئەکرێ . کەوا [د] .
(کوارك] قارچك . دومەڵان[د].
( کوان ) دومەڵ و برین .
( کوانك ) ئاکردان .
( کوانـگ ) کوانك .

( کوانوو ) کوانـک .

( کوانێ ) کوا .

( کوانیخورما ) بریێتیکە لەکاتی پێ‌گەیشـتنی خورما دا بە ئەنـدام هەڵ ئەپەررێ .

( کۆبوون ) د. کۆبوونەوە .

( کۆبوونەوە ) کردبوونەوە .

( کۆبە ) پەراوێزی کەوا .

( کۆپار ) د. کۆپارە .

(کۆپارە) گولمەگۆشتێکی گەورەی بەرزە بە سـەر پشت ملی حوشتر و وولاخەوە . کۆسپایی و بەرزیی‌یەکی کەم لە زەویی .

( کۆپان ) شـتێکە ناواخنەکەی پووشە لە سەر پشتی کەرو ئێستر قایم ئەکرێ و باری لەسەر ئەبەستریٚ

(کۆپان ئاخن) شیشێکی سەر دوو پەلە پووشی کۆپانی پێ ئەئاخنرێ.

( کۆپاندروو ) کەسێکە هەر کۆپان بدروێ .

( کۆپاندوور ) کۆپاندروو .

(کۆپانە) خوری‌یەکە کە بهێلرێتەوە بەسەر پشتی مەررو بەر-ەوە .

( کۆپەرر ) ه. کاتی پووشپەرر

( کوت ) سۆك . پارچەیاك لە شت : [ کوت ] یك گۆشت یا نانم بەرێ ، [ کوت کوت ] شتی پارچە پارچە . کۆلووی نان [ز] .

(کۆت) جۆرە پێوەندێکە ئەکرێتە دەست و پێ . دوو تەختەی پانی پچکۆلانەیە ئەدرێتە بەر کونی مەشکە و هێیزە ، لە دیێوی دەرونـاوی و توند ئەبەسترێ . کۆتە . ووتەیەکە بەکار دێنرێ لە گەڵ ووتەی سـەرا بە مەعنا سەرقۆنیین .

( کۆتا ) د. شتی باڵا کورت .

( کۆتاسیی ) ز . کۆتاهیی .

(کوتان) لێدان لەشتێك بەدەست یـا بە لیبس : کەزۆکە [ بکوتە ] . وورد کردنی شت: گۆشتەکە یاقاوە کە [ بکوتە ] . دەرزیی کردن بە شوێنێکا لە ئەندامی منداڵ بە ماکی ئاولەوە بۆ دەردانی ئاولەکە . خاڵ هەڵ کەندن لە ئەندام بە دەرزیی . لێ کردنەوەی ئارد لەبرنج بەدیبیەك یا بە مەکینە . سفت کردنی شتی تەنراو . بریتی‌یە لە لێدانی زۆر : ئەگەر نەخوێنییت [ ئەتکوتم ] واتە

زۆرت لیٚ ئەدەم .
( کۆتان ) شوێنێکە کە مەرر و ماڵاتی تیا مۆڵ بدریٚ بە شەو .
( کوتاندن ) کوتان .
( کوتاندنە چاو ) کوتانەچاو .
( کوتاندنەوە ) سفت کردنی شتێکی چنراو. پەستاندنەوەی شوێنێکی فشەڵ
( کوتانك ) با . پەچەی ئاژاڵ .
( کوتانن ) د . کوتاندن .
( کوتاننەوە ) د . کوتاندنەوە .
( کوتانەچاو ) شت بە چاوادانەوە
(کوتانەماووش) د. لەخەر کەمان دان
( کوتانەوە ) کوتاندنەوە .
(کۆتاهاتن) د. دوایی هاتنی شت
( کۆتاهیی ) بررانەوەی شت .
دریغی کردن لە کارێکا : [ کۆتاهیی ] مەکە لە خزمەتی نیشتمانا .
( کۆتایی ) کۆتاهیی .
( کوتر ) د . کورت .
( کۆتر ) باڵندەیەکی جوانە لە کەوپچووکترە ، وەگەلیٚ رەنگی هەیە
( کوتران ) کووانی شوێنێك لە ئەندام بە هۆی ئازار پیٚ گەیشتنەوە
( کۆترباز ) کەسێکە کە کۆتر رابگریٚ .
( کۆتربازیی ) راگرتنی کۆتر و بەخێوکردنی .
(کۆترە) دارێکی پانە لەناوەندی [ هەسوون ] و [ کۆمانج ] ی دەوارا دائەنریٚ . دییرەك .
(کۆترهاتن) د . کۆتایی هاتنی شتێك
(کۆترە بارییکە) جۆرە کۆترێکی بۆری پچووکی بارییکە خوێندنی لە خوێندنی کۆتری ماڵی ناچیٚ .
( کۆترەبەرجییلە ) کۆترەبارییکە.
( کۆترە ئێوییلە ) جۆرە کۆترێکە
( کوتك ) توتکە سەگ . بەچکەی وورچ و گورگ و هێندیٚ گیانداری تر [ ز ] چەکەی هەلاجیی [د] . کوتەك .
( کۆتك ) کەمۆلە .
( کوتکردن ) لەتکردنی شت . داکوتانی سنجووق بە زەویی دا لە یاریی سنجووقێنا .
( کۆتکە ) ئەشپییەکی کەورەی قوولی دەم والە .
( کوتلك ) ز . کتە .
(کۆتن) کەوتن . کرراندنەوەی گۆشت

لە ئیسقان بە دان [ز] .
( کوتوپرر ) ووتەیەکە بە مەعنا
ووتەی [ دەست بەجێ ] .
(کوتوکوڵك) وورده خوری یەکی
ناشرینە کە بررێسرێ بۆ درووونی
دەمی فەردە .
( کوتوکوێر ) مەردومی چاوکز .
(کوتومت) ووتەیەکە بەکار دێنرێ
بۆهاووێنەیی دووشت لەگەڵ یەکتریی:
نەژاد [ کوتومت ] ئەڵێی فەرهادە
( کوتومزرەقیی ) ووتەیەکە بەکار
دێنرێ لە جێی ووتەی کوتوپرر .
( کوتە ) دەنگێکە وەك دەنگی
کوتانی شت ، [کوتەکوت] کوتەی
یەك لە دوای یەك .
( کۆتە ) مەوورەداری گەورەی
بێبار . دارێکی درێژی بەکوڵمێخ
لە زەویی داچەقاوی لەلەکراوله
راستی هەرلەلەیەکی قوڵفێکی ئاسنی
تیایە پێی بەنەدیی تێئەخرێ .
کۆتەرە دارێکی بەرزە گۆشتفرۆش
گۆشتی لەسەر لەتلەت ئەکات .
( کۆتەرە ) پارچەدارێکی خرری
نالەبار . سەرەبزووت . برێتی یە لە
پەلەوورێك کە باڵی نەمابێ .
( کۆتە شکێن ) د . پارچە
ئاسنێکە لە بەردەمی موغەیریی دا
دائەنرێ بۆشکاندن وتەکاندنی بزووت .
(کوتەك) داردەستێکی سەرخرره
( کوتەکوت ) ز. وەرریێنی سەگ
( کوتە کەلەکە ) د . سواڵەت .
( کۆتەڵ ) سەرکۆزەری دانەوێلە .
هەڵواسیینی کالای مردوو بۆشییوەن
لەسەر کردنی. کۆمەڵە دارودرەختێکی
داربەررو یا مازووە کە چرروپربێ .
ناوە بۆ شوێنێك لە بەردەمی دێی
[ سورداش ] دا کە دارو دەوەنی
زۆرە . نێی ئاش . گەنمێکە کە
لەناو قاپۆررەکەیا مابێتەوە دوای
کوتان و شەن کردنی . پەیکەر .
(کۆتەڵ بوون) گەورەبوونی منال:
منالەکە کۆتەڵ بووە ، واتە بەخۆیا
هاتووەو لەخەم رەخسیوە .
( کوتیاك ) د . کوتراو .
( کوتیان ) د . کوتران .
( کوتیلك ) با . کفتە .
( کوتیی ) ز . کول .
(کۆتییاه) هـ. درەختێکی پچکۆلەیە

لەبەر کزیی بەرز نەبێتەوە .
(کوجەڵە) کاسەی پچووك . شتێکە لە قورر دروست ئەکرێ لە وێنەی لالەوێنچ، ئەنرێ بەقەدی دارەبەنەوە بۆ ئەوەی بنێشتەکەی تێ بچێت .
( کوجیلە ) کوچوولە .
( کۆجیلە ) کۆجەڵە .
( کوچ ) کوچك [ز] . کەسێکە کە دەردی [ شەپلە ] لێی دابێ.
( کۆچ ) کەل و پەلی کۆچەریی یە بە بارەوە . موورەدار [ز] . بزن و بەرانی بێ شاخ .
( کۆچاو کۆچ ) کواستنەوە لەم کۆچەوە بۆ ئەو کۆچ : جاف هەر خەرییکی [ کۆچاو کۆچ ] ە .
( کۆچای کۆچ ) د. کۆچاوکۆچ
( کوچچك ) ل . بەرد .
(کوچك) بەردی نە زۆر گەورەی نە زۆر پچووك . ئاگردان [با] .
( کۆچك ) تووتك [ز]. قۆچك.
( کوچکتاش ) د . بەردتاش .
( کوچکچن ) د . کەسێکە کە دیبواری بەرد بەووشکەکەڵەك دروست بکا . دیبواری ووشکە کەڵەك .

( کۆچکردن ) بارکردن بەماڵ و منداڵەوە لە شوێنێکەوە بۆشوێنێکی تر. بریتی یە لە مردن .
(کوچکرریژە) د. جۆرە بەردێکە شووشەی لێ دروست ئەکرێ
( کوچکوچ ) ز. ووتەیەکە وەك ووتەی « کووت کووت » سەگی پێ بانگ ئەکرێ .
( کوچکوکوانگ ) د . بریتی یە لە وەجاخی ئاگر : بەم [ کوچکو کوانکە ] رازیی نی یە .
(کوچکوکەڵەك) شوێنی بەردەڵان و ناخۆش .
( کوچکە ) سێ بەردە ئەخرێتە ژێر مەنجەڵ و دیبزە ، لە باتی سێ پا.
( کۆچکە ) قۆچکە .
(کۆچلە بەس ) چەن بەربەستێکە ئەکرێ لە بەردەی تیرەی مەرەزە لە زەوی بەرز و نزمدا بۆ ئەوەی کە ئاوەکە پۆنگ بخواتەوەو یەکسان مەرەزەکە ئاوبدا .
(کوچکەهەسان) د. بەردەهەسان .
( کۆچلەبەست ) کۆچلەبەس .
( کۆچوبار ) مالی کۆچەریی کە

لە وولاخ نرابێ .
( کۆچوماڵ ) کۆچوبار .
( کوچوولە ) دەرمـانێکی بۆری کوشندەیە . باقەیەکە لە کیای کوش کە نرابێتە ناو ئاو بۆ نەرم بوونی بۆ ررستن [ز] .
( کوچووڵە ) کوچوولە .
( کۆچە ) هـ . جۆرە هەنجیرێکی ووردی سووری خرری زۆرشیرینە.
( کۆچەر ) کۆچەریی .
(کۆچەریی) کەسێکە کە نیشتەجێ نەبێ ، وەکەرمیان و کوێستان بکا .
( کۆچەك ) کوررێکی جوانە کە جلی ژنانەی لەبەرا بێ و لە نـاو پیاوانا سەما بکا .
(کۆچەکاو) هـ . جۆرە هەجیرێکە وەك [ کۆچە ] بەڵام ئەم زەردە .
( کۆچەکە ) فێستی سەری ژنان .
(کوچەڵە) کۆچەلە . چاڵاو [د].
( کۆچەلە ) کۆجەلە . شـتێکە وەك دەمە کەوچك لە قوورردروست ئەکرێ و ئەنرێ بەقەد دارقەزوانەوە لەکاتێکا کە دارەکە برینداردەکرێ بۆئەوەی بنێشت دەربداو بچێتەناوی ( کـۆچەڵە بەس ) چەن کۆچەلە یەکی قوورپینە ، دروست ئەکرێ لە ناو جۆکە ئاوی تەنیشت [تییر]ی مەرەزەدا ، بۆ ئەوەی ئـاوەکە لەو کۆچەڵانەوە دابەش ببێ بەســەر تییرەکەدا بەیەك سانیی .
( کۆچەڵکۆچ ) د . کۆچاوکۆچ
( کۆچیدوایی ) بریتیییە لەمردن
( کۆخ ) زنجێکی پچکۆلەیە لە ناو باخا ئەکرێ .
( کۆخا ) کوێخا .
( کۆختە ) قۆختە .
( کوخك ) ز . کۆکە .
(کۆخك) ز . کۆکە . سەرپێچێکی ئاوریشمە ئەبەسترێ بەسەری بووکەوە
( کوخکیی ) ز . کەسێکە کە کۆکەی تووش بووبێ .
(کۆخن) کەسێکە کە زۆربکۆکێ
(کۆخواردنەوە) د . پارێز کردن و سلەمینەوە لە شتێك .
( کۆخە ) کۆکە .
( کۆخە رەشە ) کۆکە رەشە .
( کوخیین ) با . کۆخیین .
( کۆخیین ) کۆکیین .

( کۆد ) کاسەیەکی پچووکە شوان شیری تێئەدۆشێ [ز]. قفل.
(کوداندن) ز.جێبەجێ کردنی کار
( کۆدك ) قفلی پچووك .
( کودوو ) کەدوو .
( کۆدە ) ز . پووشانە .
( کودەریی ) جۆرە تەنراوێکە کالای لێدروست ئەکرێ . جۆرە چەرمێکی تایبەتییەئەکرێ بەسەری پێلاو .
( کودیی ) کەدوو .
( کور ) ز ، کورر . مەرری کەرریلە. شوێنی قوول لە زەویی.
( کۆر ) کوێر .
( کۆراندنەوە ) سەرزەنشت کردنی یەکێك چەند جارێ لەسەر یەك .
( کۆرانەوە ) کۆراندنەوە .
( کۆرانەوە ) کورروزانەوە .
( کۆراو ) کوێرەکانیی .
( کۆرایی ) کوێرایی .
(کۆرپە) ساوای گیاندارو سەوزایی. دارێکە هەلپاچرابێ وە تازە لقو پۆپی دەرکردبێتەوە : نزاری فیسار کەس بەشێکی کۆرپەیەوبەشێکی بررەیە
( کۆرپەلە ) منالێکە کە لە ناو منالدانابێ « جنین » .
( کورت ) شتێکە کە درێژنەبێ . چاڵ [ز] .
( کورتان ) کۆپان .
( کورتاندروو ) کۆپاندروو .
(کورتبرریی) ووتن یا نووسینی مەبەستێك زۆر بەکورتیی «ایجاز».
( کورتبوونەوە ) کەم بوونەوەی شت لە باری درێژیی .
( کورتخەس ) قرتاندنی نیرکی تووتن لە سەر کەلاوە بۆ ئەوەی بالا نەکات .
( کورتکردنەوە ) کەم کردنەوەی درێژیی شت .
(کورتم) شتێکی کورتی ئەستوورە.
( کورتمە ) کورتم .
(کورتوکوێر) کالای کورتی تەسك
( کورتە ) وولاخی نارەسەن[ز]. کورتەك . کورتکراوەی شتێك .
(کورتە بالا) شتێکە کە بالای نزم بێ
( کورتە بنە ) کورتە بالا .
( کورتەك ) کالایەکی یەخەو قۆلداری پرر لە ناوی کورتە تا سەر

ئەژنۆ . کەوا [با] .
( کورتەکەلەکە ) بۆشایی عاستی کەلەکە .
( کورتەکەوا ) کەوایەکی کورتی پرر تەریبی ناوداره لە لبادە دریژ ترو لە کەوا کورت ترە .
( کورتەڵە ) کورتە بنە .
( کورتەوکردن ) د. کورتکردنەوە
(کورتی) ووتەیەکە بەکار دینری لە جیاتی ووتەی [ بە لای کەمەوە ] : فیسار کەس[کورتی]حوقەیەك تریی خوارد .
( کورتیی ) بوونی شت بەکورت . دریغ و کۆتاهیی [د] .
( کورتیلە ) کورتەڵە .
( کورد ) کەلێکی کۆنی ئاریی یە کەوتۆتە ناوەڕاستی ئاسیاوە ، لە بیست ملیون زۆرترە .
(کوردانە) وەك کورد: کوردانەو مەردانە وەرە پێشەوە .
( کوردایەتی ) خەریبك بوون بە کاروباری کوردەوە .
( کورد پەروەر ) کوردێکە کە هەوڵ بدا بۆ خزمەتی گەلی کورد .
( کوردپەروەریی ) هەوڵـدان بۆ خزمەتی گەلی کورد .
( کوردستان ) ئەو جێگایەیە کە گەلی کوردی تیا دانیشتووە کەسنووری ئەختێك لە ژوورکەنداو «خلیج»ی فارسـی‌یەوە بە دیوی ئێراندا دەست پێ دەکات تانزیبك دەریای رەش ، وە لە کرماشـانەوە تـا کەنداوی ئەسکەندەروونە . وەچوارسەد هەزار کیلومترچوار گۆشەیە .
( کوردشناسیی ) خەریبك بوون بە باسێکەوە کە دەخلی بەسەر کوردەوە بێ « الدراسات الکردیە »
( کـورد کوژە ) ناوە بۆ جۆرە خورمایەك . جۆرە تریێیەکە .
(کوردۆ)جۆرێکە لە نقامی قەزریات.
( کۆردەرە ) ناو دۆڵو دەرەیەکە کە دەرنەچێ .
( کوردەکوژە ) د . کوردکوژە .
(کوردەواریی) شوێنێکە کە کورد تیا دانیشتبێ .
( کوردیی ) زبـانێکە کە کورد قسەی پێ ئەکات . جۆرە خواردەمەنی یەکە کە لە هەرزنی کوتراو و دۆو رۆن دروست ئەکرێ [ز] .
( کورر ) نێرینەیەکە کە هێشتا

ژنی نەهێنـابێ . نەوەی نێـرینەی باوکو دایك. کورروو . قورر [با].

(کۆرر)کۆمەلی گیاندار: مەچۆرە ناو [ کۆرری ] قومارکەرەوە .

( کورراده ) قورراده .

(کۆرراندن) پررماندنوحیلاندنی ئەسپ .

( کوررانە ) شتێکە کە هەر بۆ کورر بشێ .

( کوررانیی ) کچێکە کە خووی کورری بێ .

( کۆرریێکرتن ) سـەرنانە سەر یەکێك و بەزم پێ کرتنی .

( کوررش ) کورروو .

( کوررکورر ) بالندەیەکە بەقەد کۆتر، تووکی لە هەموو تووکێك نەرم تره ، وە گۆشتی ئەخورێ .

(کوررکورروچکە) کررکرراکە .

( کوررکە ) قیتکە .

( کوررك ) د . جوانوو .

(کۆررکە) جێی کۆبوونەوەی چەند کەسێك .

( کوررنوو ) کررنووش .

( کوررنووشبردن ) کررنووشبردن.

( کورروکال ) بە چەند کوررێکی گەنجی تازە پێکەیشـتوو ئەلێن کە کۆبووبنەوە .

( کـورروو ) ووتەیەکە وولاخی یەکسمی پێ بانـگ ئەکرێ. جاشەکەر

( کورررووز ) گیاندار و درەختی سیسی بێ کەیف .

( کوررروزانەوە ) باسی نەبوونیو نەدارایی کردن لە لای یەکێـك . ناڵەوگریانی منال بەهۆی نەخۆشی یەوە

(کوررووزە کوررووز) کورروزانەوە.

( کوررووله ) جاش .

( کۆررە ) پررمەی ئەسپ لەکاتی غوبابی‌دا . دەنـگی بەرزی گریان بەکول ، [ کۆررەکۆرر ] کوررەی یەك لە دوای یەك .

( کوررە بەشە ) مەلێکی گۆشتنی قەلەوە .

( کوررەپا ) د . پێ کوررە .

( کوررەدار ) دارێکە کە میوێك پیا هەلگەررابێ ، وە ئەو دارە بۆ ئەو میوە تەرخان کرابێ .

( کۆررەدار ) کۆمەلە دارێکـی چرری بەیەکا چووە .

( کوورەزا ) منالی کورر .
( کوورەزازا ) منالی منالی کورر
( کوورەزاك ) د . کوورەزا .
(کوورەکەل) نێری حەیوانە کێوییە کە پێی نابێتە دوو یا سێ ساڵە .
( کووریژکە ) کووری پچکۆڵە.
( کوورێنیی ) تاقی گەنجیی کورر.
(کووریی) مەڕێکە کە بێ گوێچکە بێ یا نییوەگوێچکەی بێ . ووتەیەکە بێ ئەبێژرێ بۆ لێخوڕین و بانگ کردنی جاش وجوانوو . جاشەکەر . مەڕێکە کەخوری یەکەی لێکرابێتەوە
( کوورییلە ) کووروولە .
(کوورییس) کاوورێکە کە گوێچکەی پچۆوك و دەموچاوی سوورکال بێ .
( کۆرس ) ز . جۆلا .
( کورسکەر ) ز. جۆلا .
( کورسیی ) تەختێکە لە دار دروست کرابێ بۆ لەسەر نوستن یا دانیشتنی .
( کورسیی کورسیی ) شتێکە وەك چەرخوفەلەك چوار کورسیی پێوەیە منالان ئەچنە ناوییو ئەخولێنرێتەوەو بەرزو نزم ئەبنەوە .

( کورشك ) کەروێشك .
( کورشەهەلاتن ) چیچکە کردن بە کزیی یەوە .
( کورك ) تووکێکی زۆر نەرمە لە بن مووی بزنەوە دەردێ . مریشك و باڵندەی کرر .
( کورکاندن ) کورکە کردن .
( کورکانن ) کورکاندن .
( کورکوروژە ) کررکرراگە .
(کۆرکۆرە) باڵندەیەکی بۆرەقنەی بێ بێبرەلە کوندە بەبووی پچووك ئەچێ . کونێکە لە پاڵ دۆلیانی ئاشا ، ئاشەوان هاتوچۆی پیا ئەکا بۆ ژێر [ دۆزەقە ] .
( کورکە ) دەنگی گریانی هێواشیی .دەنگێکە لە وولاخی بەرزەی یەك سەوە دێ لە کاتێکا کە وەختی ئالییکی هاتبێ ، [ کورکە کورك ] کورکەی یەك لە دوای یەك .
( کورکە نیسان ) گولالەسوورە.
( کۆرگ ) د . کوێرووی دەغل .
( کورکییان ) د . کورکە کردنی وولاخ .
( کورن ) ز. دۆلی بەردەکە ئاوی

تێ بکرێ .
( کۆرنۆش ) کوررنووش .
( کورۆتن ) کورۆشتن .
( کورۆچانن ) د . کورۆشتن .
(کورۆچکرۆچ) د کرر کرراکە .
( کوروزمان ) با . پەچەی مەرر .
( کۆرۆژتن ) کورۆشتن .
( کورۆژیین ) کورۆشتن .
( کورسك ) با . هەرمێ کێیوییلە
( کورۆسك ) هەرمێ کێیوییلە .
( کورۆش ) کوڵۆش .
( کورۆشتن ) داکرماندنی شتی رەق بە دان .
(کورۆشە) کرمێکی سوور کەلەیە لە دەمی قەفوکوڵا ئەدا لە گەنم و ووشکی ئەکا . کوڵۆش .
( کورۆك ) نێرك . کاکڵە .
( کورۆڵ ) کوڵۆڵ [د] . کولۆر .
( کوروور ) د . کولوور .
(کۆرە) کوێر. فیسارکەس کۆرەیە
( کۆرە بەشك ) ز. جۆرێکە لە مشکە کێویی .
(کورەك) د . کورۆك . زبانەی‌شت
( کۆرەکە ) کۆر کۆرەی ئاش . نێی ئاش : ناوی بە [کۆرەکە] ی ئاشا چێ .
(کۆرەلاش) ھ .گیایەکی بەهاری‌یە لەشنگ ئەچی بەڵام ئەم‌گەڵای‌پانترە.
( کۆرەمار ) کوێرەمار .
( کۆرەمشك ) ز. مشکەکوێرە .
( کۆرەوەریی ) کوێرەوەریی .
( کۆریانەوە ) د . کۆرانەوە .
( کۆریی ) کوێریی .
( کۆرییت ) کولانەی مریشك .
( کورییشك ) لۆچی کالاوهەموو شتێکی‌تر .
( کوز ) قوز .
( کۆز ) جی‌مۆلی ئاژەڵی وورده کە بە تەیمان تەنرابی . هەوارگە . لەوەرر کا .
( کۆزانە ) ز. جۆرە ترێیەکی دەنك گەورەی خرره .
( کۆزانین ) جمعی عیلمی .
( کوزبررکە ) قوزبررکە .
( کۆزروبەربانان ) بریتی‌یە لە لێدانی زۆر لە یەکێك .
(کوزکەش) بریتی‌یە لە مەردومی گەواد .

(کۆزلاخ) ز. خانووی پچووکی نزم.
(کوزمال) پاك کردنەوەی جۆگەی پچووك .
( کۆزمان ) ئەنجومەنێکە کە لە وتەیزمانێك بکۆلێتەوە «مجمعي لغوي» .
( کۆزە ) جێمۆلکەی کاروبەرخ .
( کۆزەر ) پووش و پەلاشێکە لە دانەوێڵە کیرابێ بەکێژ کردنی .
( کۆزەرە ) کۆزەر .
(کۆزەرە رریشە) یەکێکەرریشێکی بۆزی هەڵپررووزاوی بێ .
(کوزە سووتەکێ ) قوزە سووتەکێ
( کوژاندن ) کوژاندنەوە .
( کوژاندنەوە ) نەهێشتنی گرری ئاگرو چرا . تێکدانی پیتی نوسراو یا کێرری سەرزەویی . بریتی یە لە نەهێشتنی هەراو ئاژاوەیەك .
( کوژاننەوە ) کوژاندنەوە .
( کوژاو ) کوژراو .
( کوژاوە ) نوسراووکێررێکە کە تێك درابێ .
( کوژتن ) د . کوشتن .
( کوژران ) کوشتن .
( گوژراو ) گیان لەبەرێکە کە بێ گیان کرابێ . بریتی یە لەیەکێك کە لێیدرابێ بە زۆریی .
( کوژنە ) د . کوشندە .
( کوژیاك ) کوژراو .
( کوژیان ) کوژران .
( کوژیانەوە ) کووژانەوە .
(کوژیرك) با . گێژەو قوررنە .
( کوژیی ) با . قوژبن .
( کوژیین ) کوشتن .
( کوس ) قوز .
(کۆس ) د . کۆست . کۆسپایی
(کۆسار) د . شوێنێکە کە شاخ و داخی زۆربێ .
( کۆسپ ) بەرزایی کەم لەزەویی . قۆرت وگرێی رۆزگار .
( کۆسپایی ) کۆسپ .
( کۆسپە ) کۆسپایی .
( کۆست ) بەلای گەورە .
( کۆستکەوتن ) بریتی یە لە هاتنی بەلایەکی گەورە بەسەریەکێکا
( کۆستە ) پیاوێکە کە مووی ریشی نەبێ یا زۆر تەنك بێ . ناوی دوو دێی نزیك لە یەکن لە رۆژاوای سلیمانی .
( کۆستەك ) قولفەیەکي چەرمینە

بەکیلانی خەنجەرەوە لەمشتووەکەی هەڵ ئەکێشرێ بۆ ئەوە کە نەیەتە دەرێ .

( کۆستە کۆستە ) بریتی یە لە چاوو رراوکردنی چەن کەسێك لەگەڵ یەکێك بۆ دەست برریین و هەڵ خەڵەتاندنی .

( کۆستەوەیی ) دوو زەلامن لە کاتی بێبارانی دا یەکێکیان رووی خۆی رەش ئەکاوئەوی تریان بەرگی بووك لەبەرئەکاودەست ئەدەنە دەستی یەکتریی و ماڵەو ماڵ ئەسووررێنەوەو ئاویان ئەکەن بەسەرا بۆ نوقڵانەی باران بارییین .

( کوسك ) ز. مەردومی چاوشیین.

(کوسکەش) بریتی‌یە لە مەردومی کەواد . بریتی‌یە لەیەکێك کە کالکە لەقێ بکا بۆ یەکێکی تر .

( کوسکەشیی ) کەوادیی .

( کۆسکەفتن ) د . کۆستکەوتن.

( کوسکیی ) ز . نۆێلی ناسن .

( کوسۆك ) کسۆك .

(کۆسە) مەردومی کۆستە . جۆرە ماسی‌یەکە .

( کۆسەك ) کۆستەك .

( کوش ) ز. ووریایی‌و خۆپاراستن .

( کۆش ) ماوەی بەر وورگ و رراني مەردوم لە کاتی دانیشتنا .

( کوش‌بوون ) ز . هاتنە پێشەوە . بزووتنەوە .

( کوشتار ) کوشتنی زۆر لە مەردووم یا لە گیانداری تر : لە ئیسارە جەنگا [کوشتار] ێکی زۆر کرا ، یا کۆشت فرۆشەکان ئیمرۆ زۆریان [ کوشتار ] کردووە .

( کوشتن ) دەر کردنی گیان لەبەر گیاندار . بریتی‌یە لە ئیدانی زۆرو بە ئازار .

( کوشتنەوە ) بریتی‌یە لەسەربرینی ئاژاڵ:ئیمرۆ سەدمەرریان [ کوشتەوە ] کوشتنی یەکێك لەخوێنی یەکێکی ترا

( کوشتوو ) ئاژاڵی سەربرراو .

( کوشتە ) کە چێکی کییراوەی کوژراوی بێهێزە لەسەرگە چکاریی یەوە سواغی پێ ئەدرێ و بەماڵە لووس ئەکرێ .

( کوشتەرا ) رەندەیەکە دارتاش داری پێ لووس ئەکا

( کوشتەرە ) د . کوشتەرا .
( کوشتیی ) کوشتوو .
(کۆشش) هەوڵدان و تەلاشکردن بۆ شتێك .
(کۆشك) خانووی بەرزی خۆش . کلێنەی ئاو خواردنەوە [ز] .
( کوشکار ) ز . پینەچیی .
(کۆشکە) ز. جۆرە هەرمێ یەکە . ناوی دێیەکە لە یۆنان .
( کوشکە کردن ) کورش هەلاتن .
( کوشکەلاتن ) کوشکە کردن .
( کوشکەلانوو ) کەسێکە کە کورش هەلانێ .
( کوشکەلان ) کۆکای تەپالەیە کە بەکردیی دانرابێ و ناوەکەی بە بۆشی مابێتەوە . سەرەنوێلك [د].
( کوشکەهەلاتن ) کوشکەلاتن .
(کوشندە) شتێکە کە مایەی کوشتنی گیانداربێ .
( کۆشە ) کۆشیین .
( کۆشـەلان ) د . کومەزێکە لە تەپالە ناوەکەی پڕ ئەکرێ لە تەپالە بۆ سووتەنی .
( کۆشەوە ) د. کۆشش .
( کۆشیین ) د . هەوڵدان
( کونت ) د . گەفت .
( کۆفیی ) ز . جۆرە کرێ یەکە ژنانی کوردوستانی زازا ئەیدەن لە سەرپێچیان لە عاستی ناوچەوانیان بۆ جوانیی .
( کۆڤك ) با . رەحەتی نەوت .
( کۆك ) جۆرە تەقەڵێکی زلە لە کالا هەڵ ئەدرێ لە پێش دروونیا بۆ ڕێك وەستانی ; شتی سازی لەبار: مەکینەکە زۆر [کۆك] ە . رەگ و ریشە [ز] . پەلپ .
( کۆکردن ) سەلەمینەوە لە شتێك . کۆکردنەوە .
( کۆکردنەوە ) کۆمەڵە کردن و گردکردنەوەی شتی بلاو .
( کۆك کردن ) قورمیش کردنی سەعات . سازکردنی شت .
(کۆك کرتن) پەلپ گرتن . تەقەل هەلدان لە کالا بە درشتیی بۆڕێك وێستانی .
( کۆکلاش ) کیایەکی کوێستانی یە لاسکەکەی برێندار ئەکرێ و شتێك دەرئەدا وەك بنێشت ئەجوورێ .

( کوکو ) کووکوو .

( کوکوختیی ) کوکوختیی .

( کۆکە ) دەنگێکە لە گەرووی گیان دارەوە دێتە دەرەوە بە تەکان بە هۆی خورووبەکەوە کە لە گەروویا پەیدا ئەبێ ، [کۆکە کۆك] کۆکەی یەك لە دوای یەك . ناوی دێیەکە لە کوردستانی ئێران .

( کۆکە ررەشە ) جۆرە کۆکەیەکە بەمنداڵ ئەگات دەنگی وەك کەڵەشێر دێ

( کۆکەن ) ئاڵف برریین .

(کۆ کەنار) توێکڵی خاشخاشە بە هارر راوەیی لەگەڵ شەکرا ئەدرێ بە منداڵی کەم خەو بۆئەوەی خەوی ائ بکەوێ .

(کۆکیی) بوونی شت بە کۆك و ساز.

( کۆکیین ) کۆکە کردن .

( کۆگـا ) کۆمەڵێکی گەورە لە هەموو شتێك. شوێنێکە کە بە زۆریی شتی تیا دابنرێ « مخزن » .

(کۆکا بازیی) د . جۆرە یارییەکە شتێك لەژێرخوڵا ئەشارنەوە ، هەر کەسێك دۆزییەوە ئەیبا بۆ خۆی .

( کۆکـادان ) د . کۆکردنەوەی شتو کردنی بە کۆگا .

( کۆگە ) کۆگا [د] . کوێ [ه].

( کۆگەوان ) مأموری مخزن .

(کۆل) تیغێکە کە شت نەبررێ . گیایەکە وەك خەرتەلە بەلاّم ئەم لووسە. ئەندامێکی نەخۆش [ز] . ماندوو : ئەوەندەم هەوڵ دا [ کول ] بووم . کل : چاووم کول ئەکات ، واتە کل ئەکات . کە سەر : دڵم کولە واتە خەمبارم .

( کـۆل ) قەم [ه] . تەختەیەکە وەك سندووق نانەوا هەویـیری تیـا ئەشێلێ. کۆڵ [ز] . دۆڵیانەی ئاشە ، کە دانەوێڵەی تێ ئەکرێ بـۆئەوەی کە بەرە بەرە بچێتە ناوچەرخۆرەوە . ئەندازەیەکە وەك قاسناغ دانەوێڵەی پێ ئەپێورێ .

( کوڵ ) جۆشی شتی شل لەسەر ئاگر . جۆش و هەنسکی گریان : [ کوڵ ]ی گریانی نەئەنیشتەوە . شـتێ کورت . هێـندێ گیانداری بێ کەلك .

( کۆڵ ) شـتێکی نووکدارە کە نووکەکەی کول بێ. ئاژاڵی بێ شاخ. گیانداری کۆج . شتێکی قورسە کە بەکۆڵی ئادەمیی هەڵ بگیرێ . پشتی

ئادەمیی بەلای هەردووشانیەوە: ئەو منالە بکەرە [کۆل] ت . بەچکەی گیاندار : کەر [کۆل] واتە جاشە کەر . گیایەکی کوێستانی یە کەلاَی درێژکۆلەیە ، بنـکەکەی سـوورە ، ئەکری بە کەلانە .

(کولاب) ز . چنگی گیاندارو بالندە

(کولابە) ر. ئەو دوو دارەیە کە ئەکەوێتە سەر ملی گای جووت.

( کولات ) ز . کولۆی پچووك لە گڵ یا لە بەفر .

( کولاَنـك ) شتێکە هاتبێتە کول.

( کۆلارە ) بـالندەیەکی گۆشت خۆری زیان دارە لە داڵ ئەچێ . جۆرە شتێکە منالاَن لە قاقەزی رەنکاورەنـك دروستی ئەکەن و هەلی ئەدەن بە ئاسمانا بە دەزوو .

( کولافك ) با . قارچك .

( کولافە ) مەردومی بێ وور .

( کولاڤ ) لباد[ز] . کلاَو [با]

( کولان ) د . کولانە .

(کۆلاَن) قولپدانی شتی شل لەسەر ئاگر . پووختە بوون و پێگەیشتنی شت لەسەر ئاگر .

( کۆلاَن ) دەربوونەیەکە کە چەن دەرگایەکی لە دەربێ .

( کولانچکە ) کلاَورۆژنە .

( کولاَندن ) پوختە کردنی شت لە سەر ئاگر .

( کولاندنەوە ) ئازار گەیاندن بە برین بە هۆی دەست لێ دانیەوە .

( کۆلاَنکوت ) بریتی یە لەمەردومی گەڕرۆك .

( کولانکە ) کلاَوڕۆژنە .

( کولاَنـك ) د کولاَندن .

( کولاَنن ) کولاَندن .

( کولاننەوە ) کولاندنەوە .

( کولانە ) شـوێنێکی پچکۆلەی سەرگیراوە ، کۆتر و مریشك تیـا هەل ئەنیشێ .

( کولانەوە ) ئـازار گەیشتن بە برین بە هۆی کەوتنی لە شتێك .

( کولاو ) ل . تەورداس .

( کولاَو ) شتێکە لە سـەر ئاگر پوختە بووبێ .

(کولبوون) نەمانی تیژیی تێغ . بریتی یە لە ماندووبوون لە کارێکا . ئیش کردن[ز] . ئاوسان وکێم کردنی

ئەندام [ز] .
( کۆلبەند ) کۆلوانە .
( کولپ ) با . گرانیی .
( کولپیچ ) با . خشتی سوور .
( کۆل پێدان ) بەزاندن .
( کولجە ) د . کولۆجە .
( کولخان ) توون .
(کولخواردن) د . جۆشخواردنی شت بەسەر یەکا . بریتی‌یە لە رق هەستان و جۆش‌خواردنی دەروون.
( کولدان ) جۆشدان و کولاندنی شت لەسەر ئاگر .
(کۆلدان) وەررس بوون لەشتێك و دەست لێ‌هەل گرتنی .
(کولغا) با . گیانداری زۆر برسیی
( کولفت ) د . ئەستوور . زۆر.
(کولك) دڵێکە کەزۆرخەفەتبار بێ.
چاوێکە کە زۆر بیەشێ و ماندوو بووبێ . دومەڵ . هۆدەیەکە کە لە حەسیر وقامیش دروست کرابێ [با].
( کولك ) مووی کورت کە ئەشێ بۆ رستن . کورك [د] . تووش و دووچار : بووە بە [کولك] یەوە ، واتە بووە بە تووشی‌یەوە .

( کۆلك ) کۆتەرەداری رزیو .
مـزراحێکی بێ کەڵکە دانەنرێ و مزراحی بەسەرا دانەکوترێ . شتی کۆنی بێ کەڵك . کەپری پچووك .
بنکی دانی رزیو .
( کولکانە ) ل . ئەموستیلە .
( کولکردن ) کالاشتن .
( کۆلکردن ) کوڵکردن . کردنە کۆڵی شت [د] .
( کولکردن ) ز پاڵ پێوەنان .
(کولکن) شتێکە کە کوڵك وموی پێوەبێ . ماستاوی‌خەستی کورۆ کورۆ .
( کولکنە ) کۆلکن .
( کولکە ) د . کوالك .
( کۆلکەر ) جل شۆر .
(کولکەررن) رنینەوەی خوری و مووی ئاژاڵ بە دەست .
(کۆلکەزێرریینە) پەلکە زێرریینە .
( کۆلکێش ) کەسێکە بە کۆل شت هەل بگرێ .
(کولکە) رەبەت. جێی کۆبوونەوەی چەن راوچی‌یەك بۆ حەسانەوەیان .
( کۆلکێرر ) کەسێکە بە کۆل شت بکێرێ بۆ فرۆشتن .

( کولله ) گیاندارێکی بالـداری درێژ کۆلەی قاچ زڕه ، سـەوزایی ئەخـوا ، وه کەلێ جـۆری هەیه ، پەردەیەکی تەنکە لە هاویناـا بە دەوری جێی نووستنا ئەکێررێ .

(کوللەبەجەرر) بریتیە لەیەکێك کە ئەوەندە لاوازبێ ئەندامەکانی وەك بە جەرر لێکدرابێ وابێ .

( کولله زەرده ) جۆره کوللەیەکی زەردی بە زیانه .

(کوللەك) ز. کلاو رۆژنه . شەل

( کولله مـسکە ) جۆره کوللەیەکی وورده گەنم و جۆ ئەخوا .

( کول لێدان ) بردنی شـتێك بە ناخونەك .

(کولم) ز. لەوێچ . مستە کۆلە [با] .

( کولم ) روومەت .

(کولمە) گولمەی گۆشت[د]. کولم .

( کۆلنج ) ئازارێکە لە شـان و ملوپشتا پەیدا ئەبێ بەهۆی سەرماوه . تووی نەگەییو .

( کۆلنجان ) گیایەکی گەرمە ئەکوترێ و ئەدرێ لە ئەندامی یەکێك کە تووشی رەقبیتە بووبێ .

( کۆلنجکردن ) ئازار پەرژینه ناو شان و ملوپشت بەهۆی سەرماوه

( کۆلنجکە ) د . ناوشان .

( کۆلنجه ) تووی نەگەییو .

( کولندەر ) ز . کوولەکە .

( کولنـك ) قولنـك .

( کولو ) با . کولله .

( کولو ) پارچەیەکی رەقی خرره لە هەموو شـتێك : [ کولو ] یەك شەکر یا گل .

(کۆلوانە) پارچە تەنراوێکی چوار سووچە ژنان لەسەر کلاوه ئەیکرنه کۆلیان .

(کولوت) ئێسقانێکە کە نەرمەی گۆشتی سەتی پێوەیه . کولو .

( کولوج ) ووتەیەکە بەکاردێنرێ لە دوای ووتەی بە [ هیچ ] ە وە بۆنەبوونی کارێك: بە [هیچ کولوج]ێك ئەم کاره ناکەم ، واته بەهیچ رەنگێك .

(کۆلوجه) سەردەرییەکی کورتی ناوداره، لەسەرسوخمەوه لەبەرئەکرێ

( کولوخ ) با . کاسەی سەر .

(کولوز) شتێکە کە ناوی هەڵوڵ و پووچ بێ .

( کۆلزز ) ز . کلاوێکە کە لە خوری دروست کرابێ .
(کۆلۆزبانە)ھ . گیایەکی بەھارییە گولێکی زەردی ھەیە بەجۆش دراویی ئەخورێتەوە بۆ ژانە سك .
( کولۆززرك ) د . کولەزرك .
( کولۆش ) د واوەی دانەوێڵە .
( کولۆشە ) کولۆش .
( کولۆفت ) د . کولفت .
(کولۆك) کولۆتی گیاندار . نیسك و نۆژك و ماشێکە کە زوو بکولێ .
(کولۆکار) دیوارێکە کە بە کولۆ کرابێ . وەستایەکە کە ھەردیواری کولۆ بتوانێ بکا . شتی رێك و پێك[د]
( کولۆکاریی ) خەریك بوون بە دیواری کولۆوە .
( کولوکۆ ) کلپەی گرری ئاگر: [ کولوکۆ ] ی دامرد .
( کولوکۆدامردن ) سووتانی شت بە ئێجکاریی .
( کولۆل ) مەردومی بەدبەخت . مەرری ناوچەوان سپی .
( کولۆلیی ) بەدبەختیی .
( کولۆم ) چەن پارچەدارێکە لە ناو کیسەڵەی دەرگادا بەرەت بوونی شەمشێرەی دەرگاکە ئەکەونە ناو لەلەکانی بەوەودەرگاکە دائەخرێ .
[ کولۆمکردن ] داخستنی دەرگا بە کولۆم .
( کولۆنجە ) کولۆچە .
( کولۆندە ) کولۆچە .
( کولوو ) لووکەی تازەی کراوەی نواله کراو .
(کۆلوو) پارچە نانێکە کەوتبێتە ناو تەنوورەوەو لۆچ بووبێ و ھەڵ- پرروزابێ . بنکی گیای تاڵ-ووەلە شوێنی کەم دارا ئەکرێ بەسووتەمەنی.
( کولووچە ) د . کولیچە .
( کولووچەمەژکە ) د . جۆرە کولیچەیەکە ناوەکەی شەکرو گوێز یا خورمای تێئەکرێ .
( کولوور ) ناوە بۆ پێنج [لەك] کە ئەکاتە پێنج سەد ھەزار .
( کولوورە ) پوورەی ھەنگ .
(کولووز) د . گیانداری پەرر پووتی بێ تیین .
( کولووزیانەوە ) د.کوررووزانەوە
(کولووکیی)د. پەلەپەل و تالووکە کردن.

( کولوه ) ل . گۆڕ ڕیپچە .
( کوله ) کوللە .
(کوڵە) رەبەت.جێی خۆحەشاردان لە مەردوم بۆ گوێ گرتن و قسە دزین : فیسارکەس [ کوڵە ] ی لێ گرتووم . ژیپشك[د] . شتی کول .
( کۆڵە ) بەندە .
(کۆڵە) شووتی پچووك . بەچکەی گیاندار : کەر ( کۆڵە ) ، شێر ( کۆڵە ) واتە بەچکەی شێروکەر. کۆلوو [د] .
( کوڵەبار ) د. کۆڵەکەیەکە کە درابێتە بەر لقێك کە بەری زۆری گرتبێ تانەشکێتەوە .
( کوڵەبال ) فەرەنجییەکی کورتی گوێچکە دارە قۆل ئەکرێ بەبێ گوێچکە کانیا .
( کوڵەباڵە ) کوڵەبال .
( کوڵەبرك ) د. کورتمەدارێکە ئەگیرێتە بەرزە درەخت بۆ خستنە خوارەوەی بەرەکەی .
( کوڵەبنە ) مەردومی خرر ییلانە .
( کوڵەبەس ) منالی ژن لە مێردی تری .
( کۆڵەبەست ) کۆڵەبەس .
( کۆڵەبێی ) درەختی کورروز. ناوی دوو دێیە لە ناوچەی سەنگاوو تانجەرۆ .
(کوڵەپررە ) د . مەردومی خرری چوار شانە .
( کوڵەپێچکردن ) راپێچکردن و بردنی یەکێك یا زیاتر چنگ لە سەرشان .
( کوڵەجە ) کوڵۆجە .
( کوڵە چوار شەموو ) دواترین چوار شەمووی مانگی سەفەرە کە دانی پێغەمبەری تیا شکێنراوە )
( کوڵەخرتە ) د . کوڵەپررە .
( کۆڵەر ) کەسێکە شت باش بکۆڵێتەوە .
(کوڵەررم) رمی پچووك.بەرچێیخ.
( کوڵەزرك ) د . سییقەتۆرە .
( کۆڵەسی ) دارێکی ئەستووری کولۆرە کە هەنگ شانی تیا هەل بەستێ . مێوێکە کە لە نەمامیی تێ پەرر بووبێ و قەدەکەی ئەستوور بووبێ .
( کوڵەش ) د . کوڵۆش .مەردومی

بێعاری بێ ئابروو .
( کولەك ) با . پەنجەرەی پچووك کە پێی ئەڵێن پەنجەرەی هەوایی . تاقی ناودیوار .
(کولەك) ز. لێـکەی کەوچك تاش.
( کۆلەکەچەررە ) دارێکە ئەدرێتە بەرچەرخی سەربیر بۆ ئەوەی کە نەخولێتەوە .
( کولەکردن ) بریتییە لە گوێ هەڵخستن بۆ قسە دزین .
( کولەکوێرۆ ) سفرەمار .
( کولەکەوا ) دیـیرەکێکە درابێتە بەرنیرگە .
( کۆلەکەزێرریینە) پەلکەزێرریینە
( کولەکەوا ) کورتەك .
( کولەمالە )دارێکە ناوەراستە کەی کونێکی تیایـە ، زبـانەی ئیرەقی پیا ئەکرێو مالەی زەویی پێ ئەدرێ.
( کولە مانـگ ) مانگی شەعبان .
( کولەمەرگێ ) کولەمەرگیی .
( کولەمەرگیی ) گوزەران کردن بە کەم و کورریی .
(کولەنانیی) کەسێکە کە پیاوێك لە ژنی بەسترابێ بیکاتەوە .
( کۆلەنجە ) کولنجە .
( کولەنجیی ) دووپشك .
( کۆلەوار ) گیاندارێکە کە بە برینێکی گەورە بریندار بووبێ .
( کۆلەوانە ) کۆلوانە .
(کۆلەووژ) دارێکی بارییکی درێژە ئاگری تەنووری پێ تێك ئەدرێ و نانی لە تەنوور پێ ئەکرێتەوە .
(کولەوەس) کۆلەبەس . دەغلێکە زوو لە پێش پەلەدا دا چنرابێ و بنجی داکوتابێ .
( کولەوەیباب ) جۆرە مارێکی کورتی زۆر پیسـە . بـرێتی یە لە مەردومی بە ئاشووب .
( کولەوەی وا ) کولەوەی باب .
( کولەوەیواو ) کولەوەی باب .
(کۆلەویژ) د. شیعری لەنگی نارێك
( کولی ) با . کوللە .
( کولیاك ) شتی کولاو .
( کولیان ) د . کولان .
( کولیانەوە ) د. کولانەوە .
(کولیدل) سۆزیدل : بە [ کولی دل ] خۆشم ئەوێ .
( کولێرە ) جۆرە نانێکی خرری

ئەستوورە .
(کولێرەچەورە) جۆرە کولێرەیەکە کە رۆن درابێ لە روویەکی .
کوولەکە دەرویشیی .
(کولێرە مەژگە) جۆرە کولێرەیەکە ناوەکەی گوێزی کوتراوی تێ ئەکرێ
( کولیلك ) با . کولووك .
( کولین ) با . موغەیریی ئاکر .
( کولین ) سوو-چێکە لە ناو دەوارا بە چێغ برر ئەدرێ بۆ تیا دانانی شتی بە نرخ . کولانە [د].
( کۆلین ) دەفرێکی گلێینی سوورەوە کراوە ، کە لە دیـزە گەورەترە ، دۆشاوی تێ ئەکرێ .
( کولینگ ) قولنکە .
( کولینە ) د . کولین .
( کولیی ) ز . کوللە . کاکۆل .
( کۆلیی ) ز . شوێنێکە لەوولات کە داگیر کرابێ لەلایەن دەولەتێکی بێگانەوە . « موستەعمەرە » .
(کۆلیی) مەردومێکە کە لە کارێکا ناشیی بێ .
( کۆلییت ) کولانەی مریشك و سەگ و شتیتر . دارێکی گەورەیە ناوەکەی هەڵکۆلراوە ترێ وهەناری تیا ئەگوشرێ .
( کۆلییت ) رەبەت . هۆدەیەکە لەکۆلەکەوداروگەڵا دروست ئەکرێ و کلەبانێکی کەم ئەکرێ . کۆلییت .
( کۆلییتە ) هـ . کولانەومریشك.
( کولییچە ) خواردەمەنی یەکە لە هەویروشەکروگوێز دروست ئەکرێ وەك شەکرلەمە .
(کولییچەمەژگە) کولووچەمەژگە .
( کۆلییدار ) ز . داگیـرکەر . « مستعمر » .
(کۆلیی سوار) کەسێکەکە سواریی باشی نەزانێ .
( کولییلك ) ز . کولووك .
( کولییمك ) ز . هەردووسمتی مەردوم .
( کولیین ) کولان .
( کۆلیین ) هەڵکەندن .
(کۆلیینەوە) هەڵ کەندن و دانەوەی بێخی شت . ووردکردنەوەو لێك ـ دانەوەی شتێکی وونی نادیاربەبیرو هۆش:دەرسەکەت جوان [بکۆلەرەوە] یا هەموو قسەیەك ( بکۆلەرەوە )

تا تێ‌ی ئه‌که‌یت .
( کوم ) ز . کڵاو .
(کزم) قنـگ . مه‌ردومێکه پشتی چه‌مابێـته‌وه . کولزم [ﻫ] . نـاوی دێ‌یه‌که له‌ناوچه‌ی سه‌نگاو که‌کانی خوێ‌ی تیایه .
( کزماج ) کزمانج . قنگه بـان [د] . جۆره کولێره‌یه‌کی نه‌رم‌وشلی زه‌ردوزۆله به چاوه ئه‌خورێ [د] . کووره [د] .
(کزماچه) د. ته‌پله‌کی سه‌رکۆله‌که
( کزمار ) چه‌ن ره‌شـمالێکه که پێکه‌وه له شوێنێك هه‌ڵیان دابێ . کزمه‌ل . که‌ل .
( کزمارێتی ) جمهوریة .
(کزمانج)دارێکی درێژه به‌ناوه‌راستی ده‌وارا رایه‌ل ئه‌کرێ و هه‌سـوونی ئه‌درێته ژێر .
( کزماو ) کزماوه .
(کزماوه) که‌سێکه که کزم بووبێته‌وه
(کزمبوونه‌وه ) چه‌وتانه‌وه‌ی پشت به هزی پیریی‌یانه‌خۆشی‌یه‌وه .
( کومسا ) ﻫ . کاتی باران‌برران
( کزمه ) کزمه‌ڵه‌یه‌ك له شت .

( کزمه‌ك ) یارمه‌تیی . یارمه‌تی ده‌ر : فیسارکه‌س [کزمه‌ك] مه .
( کزمه‌ك کردن ) یارمه‌تی‌دان .
( کزمه‌کیی ) کزمه‌ك کردن .
(کزمه‌ل) چه‌ن شتێکی گردەوەبوو .
(کزمه‌ڵایه‌تی) چۆنێتی‌یه‌کی جوانه له ناو کزمه‌ڵێك له ئاده‌می دا که به یه‌کیانه‌وه بیه‌ستێ : راست‌گوییی بۆ [ کزمه‌ڵایه‌تی ] باشه .
( کزمه‌ل بوون ) کردبوونه‌وه‌ی چه‌ن شتێك .
( کزمه‌ڵه ) د . کزمه‌ل .
( کزمه‌لکردن ) کۆکردنه‌وه‌ی چه‌ن شتێك .
( کزمه‌ڵه ) کزمه‌ل ، [ کزمه‌ڵه بوون ] کزمه‌ل بوون [ کزمه‌ڵه کردن ] کزمه‌لکردن .
( کزمه‌ڵه به‌ستن ) کزمه‌ل بوون .
( کون ) ده‌لاقه‌یه‌کی‌بچووك‌یاگه‌وره له شتێکا [ کون‌بوون ] په‌یدابوونی کون له شتێکا [ کون کردن ] . په‌یدا کردنی کون له شتێکا .
( کۆن ) شتی زۆر ماوه . خێوه‌تی بچووك [ز] .
(کونا) کون ، کڵاوڕۆژنه [د] .

( کونار ) درەختێکی گەرمیانی یە دررکێکی درێژی هەیە ئەکرێ بە پەرژین .
( کونارروچن ) کوناوچە .
( کونارشك ) ئانیشك .
( کوناوچە ) کلاو رروژنە .
( کوناودەر ) شتێکە کە کونێکی ئەم دیوو ئەو دیوی تێبووێ .
( کوناوەجکە ) کوناوچە .
( کون بوون ) دەلاقە بوون لا شت .
( کون برر ) شوێنێکە کە با بوێری نەبێ ، [ کون برر کردن ] گرتنی کونی شوێنێك بەجۆرێك کە با هاتوچۆی پیا نەکا .
( کون بەفر ) با . چالە بەفر .
( کونج ) قوژبن و پەنا : فیسار کەس [ کونج ] ی تەنیایی گرتووە . شتی خالدار: مریشکەکە [کونج]ە . مەردومی دەم وچاوئاولاویی. ئینجانەی گوڵ
( کونجر ) شتی کونجی خاڵ خاڵ
( کونجرر ) کونجوورر .
( کونجررە ) دررکی پەیکول .
( کونجررکە ) کونجرر .
( کونجرك ) ز . نوقورچ .

(کونجرە) گیایەکی بەهاریی زبرە بەبارێك ئەگرێ وەك پەیکول بەلام ئەم دررکەکانی ووردترە .
(کونجکاو) د . کەسێکە کە زۆر پرسیار لە شت بکا .
(کونجکاویی) د . بوونی یەکێك بە پرساو بە جۆستو جۆ .
( کونجکونجێن ) یارییەکە چەن کەسێك هەریەکە لەکونجێکا ئەوەستێ لە پاشا جێگە گۆررکێ ئەکەن لەو حەلەدا ئەگەر بۆیان رێکەوێ لە یەکتری هەل ئەدەن .
( کونجوورر ) کونجی تەسك و تەنگە بەر .
( کونجوول ) د . کونجوورر .
( کونجیت ) ل کونجی .
( کونجیی ) شتێکی ووردی دەنك زەردی ناسکی چەورە ئەکرێ بە کولێرەوە ، وە بە گەلێ جۆری تر ئەخورێ .
( کوند ) ز . کوندەبەبوو .
( کوندر ) ز کوولەکە .
(کوندك) با . کوندە . کوولەکە
( کوندووش ) دەرمانێکە وەك

بررنووتیی ئەکریتە لووتەوە ، بەڵام ئەم کەسکیین ترو بە پژمەترە .

سووژن .

(کونده) پیستی بزنە کە بەساغی دەرهاتبێ وخۆشکرابێ بۆئاوتێ کردن.

( کوندەبوو ) کوندەبەبوو .

( کوندەبەبوو ) باڵندەیەکی گۆشت خۆری دەنووك قولاپەبی چاو جوانە ، هەر لە چۆڵبی و کەلاوە دائەنیشێتەوە

( کوندەڵان ) جێگایەکی نسرمە هاوییناں کوندەی پرر لە ئاوی لێ دائەنرێ بۆ ئەوەی کە ساردبێ.

( کونزووان ) د. مەردومی تری زبان لال .

( کون زەین ) د . مەردومی تێنەگەیشتووی کەودەن .

(کونساڵ) بریتی یە لەمەردومی پیر

( کونکردن ) سمیینی شت .

لابردنی کچێنی کچ بەچوونەلای .

•( کونکریت ) چیمەنتۆو لم و چەوی گیراوەیە کە بەکار هێنرابێ

•(کونکریتی شیش دار) کونکریتێکە کە شیشی تیا راکێشرابێ .

( کونـك ) ز . گرێ یەکە لەناو داری گوێزاهەڵ ئەکەنرێ وئەکوژرێ و شتی پێ زەرد ئەکرێ .

•( کۆنکرە ) کۆنکەرە .

•( کۆنکەرە ) مۆتمر .

( کوننە ) کوندە .

(کوننەلان) کوندەلان، تەپۆڵکە[د].

(کوننەی زرانیی) د.کاسەی ئەژنۆ .

( کونزش ) مەردومی رژد [ز]. کوندووش [د] .

( کونزشە ) ز. کەسك .

( کونورر ) د . کونوورر .

( کونوورر ) د. چەوی یەکە کە لە داری قەزوان نەبێ .

( کونووچکە ) کونی زۆر وورد

(کۆنووس) نووسراوێکە کە چەن کەسێك لەبارەی شتێکەوە بینووسن و مۆری کەن « محضر » .

(کۆنە) کاڵای کۆن . ئاکردان [ل].

( کۆنە پۆش ) کەسێکە کە هەر کۆنە لەبەر بکا .

( کۆنەپۆشیی ) ناوە بۆتیرێیەك لە کورد کە ل سنووری پێنجوین دائەنیشن .

( کۆنەپەرست ) کەسێکە کەبیرو

باوه ری کۆنی خوش بوێ بانارره‌واش بێ « رجعی » .
(کۆنه‌په‌رستیی) په‌رستنی باوی کۆنی نارەوا .
( کۆنه چه‌کمه رره‌ق ) بریتی یه له پیاوی بووه‌ی لێ که‌وتووی به‌فیز.
( کۆنه‌سوار ) که‌سێکه له کاتی‌زۆر خانه‌دا دومه‌له‌ك لێ بدا . که‌سێکه له کۆنه‌وه سوار بێ .
( کۆنه فرۆش ) که‌سێکه پیشه‌ی هه‌ر کرریین و فرۆشتنی کۆنه‌بێ .
( کۆنیی ) بوونی شت به کۆن .
(کۆنیینه) شتی زۆر کۆنی مێژوویی.
( کوو ) ووته‌یه‌که به‌کار دێنرێ له جیاتی ووته‌ی [چۆن] .
( کۆوار ) د . رۆژنامه .
( کووارك ) کارگ
( کووپ ) ده‌فرێکی قولفه‌داری پچووکه شیر و چایی و قاوه‌ی پێ ئه‌خورێته‌وه. جۆرێکه له کاغه‌زی قومار
( کووپه ) کۆزه‌ی زۆر گه‌وره‌ی دووقولف. جۆرێکه له کاغه‌زی قومار که خاله‌که‌ی له کووپه ئه‌چێ .
(کووپه‌لۆکه) کووپه‌ی پچکولانه .
( کووپه‌له ) کووپه‌لۆکه .

( کووت) ووته‌یه‌که سه‌گی پێ بانگ ئه‌کرێ . خاك و خۆلی ناو ماله‌که به ده‌م گه‌سکه‌وه کۆنه‌کرێته‌وه ، وه له‌گه‌ل چێشت ووورده ئانا تێکه‌له ، ئه رێته ناوشینایی یه‌وه بۆ هێزی زه‌ویی ، ئه‌مه‌ش له‌شوێنێکا وایه که شیاکه‌و پشقلی وولاخ و ئاژال بسووتێنرێ له‌به‌ر بێ‌داریی. زبل. پهین. سه‌ماد
(کوونال) چه‌ن پارچه ته‌نراوێکی به نرخه بازرگانی له دووکانیا دای ئه‌نێ بۆ فرۆشتنی .
( کووتالفرۆش ) بازرگانێکه که کووتال بفرۆشێ .
( کووت کووته ) پارچه په‌ررۆ یا گوشێکه منالانی به‌ردێکی پێوه ئه‌به‌ستن و هه‌لی ئه‌ده‌ن به‌هه‌وادا .
( کووته ) قه‌زوان و تووی به‌یه‌کا کوتراو [ه] . تووتکه سه‌گ .
( کووته‌ل ) با . دۆلیانی ئاش .
( کووته‌له ) تووتکه سه‌گ .
( کووجیی ) ه. کۆلانی ته‌نگه‌به‌ر.
( کووچاك ) ز . خێزه‌ره
( کووچه ) کۆلان .
( کووخك ) کۆکه .
( کوودك ) ز . ئه‌ژنۆ .

( کوودەڵە ) بەچکەی بەراز .
(کوور) کیسکی دوو ساڵەی نێر . قووڵ [ز] .
(کوور ر) شتێکی درێژە کە کەمێك خواربووبێتەوە : پەنجەم یا پشتم [ کوورر ] بووە . شوێنێکە کە ڕێی تێ نەکەوێ . شوێنێکە کە زۆر لێژ بێ .
( کوورە ) کەلەبەرێکە لە زەویی یا لە دیوار ئاگری تیانەکرێتەوە . شتێکێ کون کونی پێچکە دارە لە تەنەکە یا لە گلی سوورەوە کراو ئاگری تێ نەکرێ و چێشت و چایی لەسەر لێ ئەنرێ .
( کوورە پەزخانە ) کوورەی خشت سوور کردنەوە .
( کوورەخانە ) کوورەی ئاگری ئاسنگەر . کوورەپەزخانە .
(کوورەدان) پوورەدانی هەنگ .
( کوورە دەمێن ) شاگردێکە کە بە مووشەودەمە هەر کوورە بدەمێنێ
(کوورەفەررەنگبی ) جۆرە کوورە یەکە بە نەوت ئەگرێ وە چێشت و چای لەسەر لێ ئەنرێ .
(کووز) قاشی میوە . جۆکەلە (م)
( کووزاندنەوە ) چووزاندنەوە .
( کووزانەوە ) چووزانەوە .
( کووز کردن ) قاش کردن .
( کووز کووز ) شتێکە لە خۆیا قاش قاش بێ بەڵام لێك نەبووبێتەوە: ئەم کاڵەکە [ کووزکووز ] ە .
( کووز لێدان ) خانخان کردنی زەویی بە کاسن بۆ دێراووکۆڵ .
( کووزە ) ز. گیاندارێکە بەقەد پشیلەیەك ئەبێ کلکی درێژوچوار پەلی کورتە، پێستەکەی ئەکرێ بە کەوڵ
(کووزەڵە) گیایەکی توونی ئاویی بەهارییە ، لەکوێ ئاو ئەڕروێ ، گەڵای وەك کەرەووز وایە .
( کووژە ) ئەوکونەیە کە دەغڵی لێ دێتە خوارەوە بۆ ناو کوێرووی بەرداش .
( کووژەرە ) د . عەنزەرووت .
( کووژەکە ) قۆپچەیەکی شینە بۆ جوانی ئەدروێ بەسەرشانی منالا .
(کووژەکەکەرانە) مووروەکەرانە
( کووش ) ووتەیەکە پرسیاری شوێنی پێ ئەکرێ : لە [ کووش ] بوویت وانەلەکوێ بوویت. ووتەیەکە

بەکاردێنرێ لەجیاتی ووتەی:«هیچ» .
( کووفك ) ز . رەحەتیی .
( کووفیی ) سەرپێچی ژنان .
کووپە [ز] .
( کووڤان ) ز . داخ وخەفەت .
ئێش و ئازار .
( کووڤە ) ز . کەی .
(کوو کوو) جۆرە هێلکەو رۆنێکی دوو دییوە جاترەی تێکەڵ ئەکرێ.
جۆرە کۆترێکی دەنگ خۆشە [د] .
( کووکووکەرە ) کۆترەبارییکە .
( کووکە ) هەراو ئاژاوەیەکە کە کە بەرپا ببێ بە هۆیێ پەیدا بوونی شتێکی ناشرییینەوە : یا خوا هەزار کووکەی لێ هەستێ . قووقەی کەڵەشێر
(کوول) تەختەیەکە وەك سندووق نانەوا هەوییری تیا ئەشێلێ. زاخە .
ئەشکەوت [د] . فییلی شەترنج [د].
تەوییلە [با] .
( کوولك ) کولانەی مریشك .
(کوولەکە) بەری کیایەکی کەلاّ پانە وەك کالەك وایە بە چێشتی ئەخورێ وە کەلێ جۆری هەیە .
(کوولەکەئاویی) جۆرە کوولەکەیەکی پچکۆلەی بارییکی سپییە .
( کوولەکە بالقە باغییی ) جۆرە کوولەکەیەکی مل دارە ناوەکەی دەرئەهێنن و شتی تێ ئەکەن .
(کوولەکەدمە)ه . جۆرەهەنجییرێکە لە هەرمێ ئەچێ .
(کوولەکە دۆشاویی) جۆرە کوولەکەیەکی گەورەی شیرییینی سوورە ، ئەکرێ بە چێشت .
(کوولەکەدەروێشیی) جۆرە کولەکەیەکی قنـك خرری مل بارییکە ، دەروێش رۆنی سوالی تێ ئەکا . کیایەکە لە ناو دەغلا ئەرروێ بەرێك ئەگرێ وەك کوولەکە دەروێشیی وایە بەلاّم ئەم ووردە .
(کوولەکەسەندەڵیی)جۆرە کوولەکەیەکی گەورەی خرری قاشقاشە ئەکرێ بە چێشت .
(کوولەکێن) د . چێشتی کوولەکە
( کوومرر ) با . خەڵووز .
( کوون ) قنـك .
( کوونە ) ل . مەقەڵیی .
(کوونیی) مەردومی حییز. کیان داری ئەمەلی ئییش لێ نەهاتوو .

( کووە ) د . ئەستێرەی کۆ .
( کوە ) با . ئاڵبوونەوەی دان : دانم [ کوە ] بووە .
( کوێ ) ووتەیەکە پرسیاری پێئەکرێ لە شوێن : لە [کوێ] بوویت ، واتە لە چ جێگایەك ؟
(کوێت) وولاخێکەرەنگی سوورێکی تاریێك بێ .
(کوێخا)دەمڕاستوکاربەدەستی دێ
( کوێخایانە ) مووچەیەکە ئەدرێ بە کوێخا .
( کوێخایەتی ) کوێخایی .
( کوێخایی ) دەم ڕاستیی و کار بەدەستیی دێیەك .
( کوێر ) گیاندارێکە کە چاوی نەبینێ . گوێزێکە کە ناوکەکەی درەنـگ دەرەبێ .
( کوێرانە ) وەك کوێر .
(کوێراو) چاوگەیەکە کەمی لەبەر بڕروا .
( کوێرایی ) کوێریی .
( کوێرایی داهاتن ) کوێربوون .
( کوێربوون ) نەمانی بینایی چاو .
(کوێربوونەوە) نەمانو وون بوونی ڕێوشوێنی‌شت: ڕێگاکە یاکارێزەکە یا بیرەکە ، یا دەمی برینەکە ، یا کونی کوێچکە سمراوەکە [ کوێر بووەتەوە ] . نەمان و بنە بڕربوونی وەچەی یەکێك : خانەدانی فیسار کەس [ کوێربووەوە ] .
(کوێردڵ) مەردومی تێنەگەیشتوو .
( کوێرڕا ) ووتەی سەرسوورمان لەکردنی کارێك زۆربەدەستوبردیی : [ کوێرا ] ئەو کارەت کرد .
( کوێرك ) کوێروو .
(کوێرکوێرانە) ووتەیەکە ئەووترێ بە یەکێك کەکارێك بکا بەبێ تێبینی و لێکدانەوە: هەروا [کوێرکوێرانە] دەستم دایە ئیشەکە .
( کوێرك ) کوێرووی دەغل .
( کوێرنان ) بریتییە لە کەسێك کە نان بدە نەبێ .
(کوێروو) پووچەکی دانەوێڵەیەکە کە ناوکەکەی ڕەش بووبێ .
(کوێرەدێ) دێیەکی پچکۆلانەی کەم ئاوەکەچەن‌ماڵە هەژارێکی تیابێ
(کوێرەڕێ) ڕێگایەکی بارییکە کە کەم هاتوچۆی پیا بکرێ .

( کوێرەك ) کوێرو .
( کوێرەکانی ) کانی یەکە کە پرر بووبێتەوەو ئاوێکی کەمی مابێ . ناوی دێیەکە لە سووورداش .
(کوێرەمار) جۆرە مارێکی کوێری زۆر پیسی کوشندەیە .
(کوێرە مووشە) مەردومی چاوکز.
( کوێرەوەبوون ) کوێر بوونەوە .
(کوێرەوەریی) سەغلەتیی و دەردی سەریی لەکاروبارا .
( کوێرێتی ) کوێریی .
(کوێریی) بوونی گیاندار بەکوێر .
( کوێریشك ) کەروێشك .
( کوێژرك ) با . قوژبن .
( کوێسان ) کوێستان .
( کوێستان ) وولاتی بە هاوین فێنکی بە زستان ساردی بەفرو باران زۆر .
( کوێستانیی ) شتێکە لە وولاتی کوێستانەوە هاتبێ .
( کوێشتێیر ) چتێیر .
( کوێشکە ) چۆلەکە پاساریی .
( کۆێلە ) بەندەی زەرر خرریدە،
( کوێن ) تەختەی دەوار .
( کوێندەریی ) ووتەیەکە پرسیاری جێی لە دایك بوونی یەکێکی پێ ئەکرێ: ئەرێیمان[ کوێندەریی ]یە، واتە خەلقی کوێیە ؟ .
( کوێنك ) تەختەیەکە لە دەوار
( کوێنە ) کوێ .
( کوێو ) ئاوێرەبەرد .
( کوێوسان ) کوێستان .
( کوێوە ) ووتەیەکە داوای دیار کردن « تعیین » ی شوێنی شتێکی پێ ئەکرێ : مانگ لە [کوێوە]یە؟
( کوێوییسان ) کوێستان .
( کوێیر ) با . قوول .
( کوێیسان ) کوێستان .
(گە) پیتێکە ئەکەوێتە ناوەندی دوو ووتارەوە ، ووتاری دووەم ئەکا بە تەواوکەری ووتاری یەکەم : مەردوم کەسێکە [ کە ] گیانی خۆی بەخت بکا لەررێی بەرزی نیشتمانیا. ووتەیەکە بەکاردێنرێ بۆبەستنەوەی شتێك بە شتێکی ترەوە لە کاتێکا : [ کە ] تۆ هاتییت من دەرزۆم . پیتێکە جیاوازیی شتێك لە شتێکی تر ئەکەیەنێ وەك ووتەی « تر » :

یەکێکی کە ، واتە یەکێـکی تر .
اسمی موصولە : ئەو میوانانەی کە
هاتن رۆیشتن .
( کەباب ) گۆشتی کوتراوی لە
شیش دراوی برژاو .
( کەبابچی ) کەسێکە پیشەی
هەر کەباب برژاندن بێ .
( کەبابخانە ) شوێنێکە کە هەر
کەبابی تیا ببرژێنرێ .
( کەبابە ) کەبابەی چینی .
( کەبابە بوون ) بریتی یە لە
گەورە بوونی جووجەڵەی مریشك و
قەلەموون و باڵندەی تر بە جۆرێك
کە لەوانەبێ گۆشتەکەی وەك کەباب
ببرژێنرێ و بخورێ .
( کەبابەی چینی ) شتێکی دەنك
ووردی گەرمیانی یە وەك کونجیی بۆ
بەربوونی دەنك ئەخورێ .
(کەبات) شتێکە وەك نارنج بەڵام
ئەم گەورەترو توێکلی ئەستوورترە.
(کەبادە) د . کەوانەیەکی ئاسنینە
زنجیرێکی ئەستووری پێوەیە زۆر
خانەچی لەکاتی وەرزشاهەلی ئەسوورێنێ
( کەبانوو ) کەی بانوو .

( کەبانیی ) ز . کەی بانوو .
( کەبلەمە ) کەپلەمە .
(کەبەر)جۆرە درر کێکی هاوینی یە.
ئەبێ بەکەبەل ، وە لق و گەڵاکانی
وەك تووترك وایە .
( کەپ ) چەمۆڵە . کەپوو .
(کەپر) سێبەرێکە لەدارو کۆڵەکەو
گەڵا دروست ئەکرێ لە هاوینانا .
( کەپرۆکە ) کەپری پچووك .
( کەپرۆکەبەستن ) کۆبوونەوەی
کەف و ملتە لەسەر شتی شل: پرکی
ترشیانەکە [ کەپرۆکەی بەستووە ] .
( کەپرە سەوزە ) کەپرەشینە .
(کەپرەشینە) جەژنێکی جولەکانە
لەدەمە دەمی پایزا هەرماڵەکەپرێك
ئەکاو میوەی پیا هەل ئەواسێ ، لە
پاش بررانەوەی جەژنەکە یان
میوەکە ئەخۆن .
( کەپك ) قوتکە .
(کەپلەمە) دەرمانێکی هاررراوەی
ووردەکە بکرێتە سەربەری دەست و
بخورێ ، [کەپلەمەکردن] خواردنی
کەپلەمە .
(کەپ لێگرتن) چەمۆڵەدان لەشتێك

( کەپن ) کەسێکە لەقسەوگوفتو گۆدا کەپەی لێوەبێ .
( کەپۆ ) لووت .
( کەپۆل ) د . کاپۆل .
( کەپۆلك ) د . کاپۆلك .
(کەپوو) کەپۆ . دان . چەمۆلە . پیپری بێدان [د] .
( کەپوورە ) د . دەنگە دەنگو قەلەبالغ .
(کەپووکەرە) ناوە بۆجۆرە مەلێك کە لەکاتی‌خوێندنا ئەلێ:- [کەپوو].
(کەپوولە) دەفرێکی دارینە کە مزەی ئاشی پێ‌ئەگیرێ .
(کەپە) دەنگی کەسێکە کە دانی نەمابێ ، [ کەپە کەپ ] کەپەی یەك لە دوای یەك .
(کەپەر) کەسێکە کە دانی پێشووی نەمابێ .
( کەپەك ) توێکی گەنم و جۆو هێندێ شتی‌هارر راو کەبەهێلەك گیرابی.
( کەپەلەك ) ز . کرمی‌مافەتە .
( کەپەلەکیی ) ز. مەررێکە تە مافەتە لێی دابێ .
( کەپەنك ) فەرەنجیی .
( کەپەنە ) با . کەپەنك .
( کەپەنەکدال ) کەرکەس .
( کەپی‌پان ) با . ناوە بۆ جۆرە هەنارێك .
( کەپیلە ) کەپوولە .
( کەت ) لادانێکە لەنانەواخانەدا ئاردی تێ‌ئەکرێ . وێنجە [ ز ] . شان ، زۆرتر لەگەل ووتەی[کۆل] دا بەکاردێنرێ: [ کەت]و [کۆل] واتە شانو کۆل. [د] . یەك[با] .
( کەتان ) جۆرە تەنراوێکی سپی ناسکی بە نرخە ژنان ئەیکەن بە کراس‌و سەرپۆش . جۆرە گیایەکی بەکەلکە وەك گوش لە لاسکەکەی هێندێ شتی تەنراو دروست ئەکرێ.
(کەتان‌وکەوان) د . پەردەوکوللە
( کەتانە ) جۆرە نقامێکە .
(کەتانیی) جۆرە بادامێکی توێکل تەنکە .
( کەترە ) د . نەنـگو بەدیی .
( کەتریی ) کتریی .
( کەتك ) با هەنجیری ووشـکی ناو مەشکالە .
( کەتکەتە ) با . یەکە یەکە .

( کەتن ) تەررن . کەوتن .
( کەتن پێکردن ) تەررن پێ کردن
( کەتوکڵفت ) گیانداری زەلامی تێکسمرراو .
(کەتوو ) ئاسنێکی دەمپانی چوار سووچی درێژ کوڵەیە، کلکێکی دارینی هەیە ، دێراوی پـێ هەڵئەدرێتەوە .
ناوی کێوێکە لە شارباژێرر بەردی بەرداشی زۆرە .
( کەتوون ) د . کەمەند .
( کەتە ) شتی زلی قەبە . کەتی نانەواخانە [د] .
( کەتەپلاو ) ووشکە پلاو .
( کەتەو ) ز. دەردێکە ئەکەوێتە ناو ووڵاخی یەك سمەوە ئەی کۆکێنێ.
[ کەتی ] با . قەتی .
(کەتیبە) گویسوانەی خشتی سوور.
( کەتیر ) د . شەخرە .
( کەتیرە ) جەوی کەوون که کەلێ جۆری هەیە .
( کەجان ) کەچۆ .
( کەجیی ) ز. کشتەکی بادراوی لووسکراو .
(کەچ) شتی لار. کەل . کچ [ز].
( کەچایی ) عاستی ئەکەچیی شت .
( کەچك ) با . کەوچك .
( کەچۆ ) ز. ووتەیەکە بەئافرەت ئەووترێ وەك ووتەی : [ کچێ ] .
( کەچە ) فەرەنجی بێ قۆلی ناو دامان . ئاژالی شاخ خوار .
(کەچەشاخ) بزنێکە کە شاخێکی شکابێ .
( کەچەل ) گیاندارێکە کە سەری بریندار بـێ و تووکی لێ نەرروێ.
(کەچەڵە) جووجەڵە یەکە کەمێك کەورەبووبێ وتووکی پێشووی وەریبێ.
[ کەچەلەبوون] کەورەبوونی جووجەڵە بەجۆرێك کە تووکەزۆرەکەی وەریبێ.
( کەچەلیی ) دەردێکە بە سەری گیاندار ئەکاو تووکی ئەوەرێنێ .
( کەچیی ) ووتەیەکە ووتارێکی وا بە سەر ئەگرێتەوە لە گوفتوگۆدا کەکوێکر بەجۆرێکی تر بێ ی کەیشتبێ: چوومە لای نەریمان [ کەچیی ] لەوێ نەبوو ، لە کاتێکا کە کوێکر وا بزانێ لەوێ بووە . خواریی شت .
( کەچیبچ ) ز. جێکای چینەی مریشك لەسەرەنوێلك .

( کەحلان ) ئەسپی رەسەن .
( کەخس ) ز . پیازی فیسقە .
( کەخسە ) با . کەخس .
( کەد ) لق : کەدەدارێکم بدەرێ
( کەدوو ) کوولەکە .
( کەدوون ) ز. جەررەی پچووك
( کەدە ) ز . منالی نێرینە .
(کەدینك) جەررە[ز]. کووپەڵە[با]
( کەدینە ) گلێنە .
(کەدیی) ز. گیاندارێکی کێویی یە کە مالیی بووبێ .
( کەر ) گیاندارێکی یەك سمی بارەبەری بە سزمانی گوێ درێژە . پیتێکە بەهەر ناوێکەوە نرا ئەی کا بە ئیش کەر : کارە (کەر) ، نوێژ (کەر) ، چێشت [ کەر ] . گەلە [با] . کەرر [ ز ] . قەرز [ ز ] . پارچەیەك لە شت [ز] .
( کەرانباوگاو ) کرانباوگاو .
(کەرانە) جۆرە باجێکی دەوڵەتی یە لە هەموو بارێك ئەسێنرێ .
١ کەربەش ) ز . دررکێکە کەر زۆری حەز لێ ئەکا .
( کەرپەسە ) گیـاندارێکە وەك مارمێلکە هەمیشە رووئەکاە رۆژ .
(کەرت) لەتی شت ، [کەرتبوون] لەتبوون ، [کەرتکردن] لەتکردن .
( کەرترر ) بریتی یە لەمەردومی نەزۆن دووی قسە رروق .
(کەرترێنە) د . دواهەمیین دەست لە یاریی گۆرەویی بازیی دا .
( کەرتك ) کەرت .
( کەرتوپە ) پەتانە .
(کەرتوو) کەتووی دێراو هەڵدانەوە
( کەرتە ) پارچەیەك لە ئاژاڵ .
( کەرتەرر ) د. کەکرە .
( کەرتەشیی ) گیایەکی بەهاریی دررکاویی یە نێرکێکی بارێکی بەرزی هەیە لە سەرەوە ئەیکا بە توێژێکی دررکاویی . تۆوی کنکر .
( کەرتەك ) ز . شتی زۆر .
( کەرتەلە ) هـ . سەبەتوولکەیە کە لە تووڵ دروست ئەکرێ .
(کەرتەلەرر) ووڵاخی بەرزەی لاواز
( کەرتێنە ) د . کاکلە مووشان .
( کەرچلاندن ) ز. تێکەڵ کردن .
( کەرخ ) دەفرێکی گلێنە کە لەبەر زۆر ئاوتێ کردنی لووس بووبێ

و قەوزەی گرتبێ . سنوور .
( کەرخ بوون ) دەنـگ نووسان .
( کەرخنکێنە ) جۆداس .
(کەرخێین) ز. لە پێش چاو کەوتنی خواردەمەنی یەك لەبەر زۆرخواردنی.
( کەردار ) کەسێکە کە کەری بێ و بە کرێ ئیشی پێ بکا .
(کەرداریی) ئیش کردن بە کەر بە کرێ
( کەردرر ) گیایەکە وەك قامییش گولێك دەرئەکا دەنکەکانی ئەکرێ بە نان .
(کەردوکێش) د . ئاسنێکی دەم پانی ئلك درێژە بەدوو کەس دیراوی پێ هەڵ ئەدرێتەوە .
( کەردوو ) د . دێراو . جۆرە خاکەنازێکی دەم پانە بە دوو کەس دیراوی پێ هەڵئەدرێتەوە .
( کەرر ) گیانداری گوێ گران .
( کەرران ) ز . چەکوشی گەورە
(کەررانە)ز. مەردوومی دەولەمەندی ماڵدار .
( کەرربوون ) گوێ گران بوون . بریتی یە لە زۆر ساردبوونی ئاو بە بەفر یا سەهۆل تێ کردنی: بەفراوەکە [ کەرربووە ] . بریتی یە لە زۆر خێراخولانەوەی مزراحی قۆررقۆررە.
( کەررك ) کەررەك . مێیـوەی کاڵ [با] .
( کەررکردن ) زۆر سارد کردنی ئاو بە بەفر یا سەهۆل. چاك خولاندنەوەی مزراحی قۆرر قۆررە .
(کەررواویی) شتێکە کە کەرروی هەڵ هێنابێ .
( کەرروو ) شتێکی سەوزی بۆن ناخۆشە لەسەر رووی گولێرەو هێندێ شتی تر پەیدا ئەبێ کە شێی بێ.
( کەرروو هەڵهێنان ) پەیدابوونی کەرروو لەسەر شتێك .
( کەررە ) قەلەفرر . ئاژاڵی گوێ پچکۆلە .
( کەررەپوو ) داری زۆر ووشکی کەندەڵ . بەری گیای لە بان کە وەك ووردە لۆکە وایە .
(کەررەپووسەر) مەردومی پیری گێژوویژی ساویلکە .
( کەررەسییسە ) بارینی بەفر بە ووردیی لە ڕۆژی زۆر ساردا .
( کەررەپووە ) د . کەررەپوو .

( کەررەك ) جۆرە فەرەنجی یەکی ئاودامانی بێقۆلو کونە .
(کەررەکوتتێ) مەردومی زۆر کەرر
( کەررەکۆشە ) کولیی .
( کەررەکیێفە ) د . کەرروو .
(کەررەمار) جۆرە مارێکی کەرری پیسی کوشندەیە .
( کەررەنا ) زوررنا . بۆررییەی سەماوەر .
( کەررەنسۆ ) مرۆڤێکە کە گوێ رایەڵ نەبێ .
(کەررەواڵە) مەلێکی بۆری بێ کلکی جوانە لە سوێسکە پچووکترە لەکاتی فررینیا دەنکی باڵی زۆر دێ ، وە یەك سەرئەفررێ. برێتی یەلەمەردومی ساویلکەی بەسزمان .
( کەررەوان ) کەررەواڵە .
( کەررەووڵ ) د. کەررەکیێفە .
(کەررە هەنجیر) تەقڵەهەنجیرێکە کە بە سەوزیی هەڵوەریی بێ .
(کەرریی) گوێ گرانیی. کەرییلە .
( کەررییل ) د . کەررییلە .
( کەررییلە ) بزن و مەرری بێ گوێچکە .

( کەرسەمە ) رەگێکی ئەستوورە لە ناو لووتی هێندێ گوێدرێژا بە رەنگێکی وا کە نەیەڵێ هەناسەی بە رەوانی دەرچێ ، ئنجا دێن ئەو رەگەی ئەسمن و دەری ئەهێنن ، وە بەو جۆرە چاك ئەبێ .
( کەرسۆنە ) تەپاڵە .
( کەرسەپ ) کەرمووز [د] .
(کەرسەرر) مەلێکی سوورە بەقەد مراوی یەك ئەبێ ، گۆشتی ئەخورێ و دەنکی وەك زەررەی کەر وایە . مزراحی قۆررقۆررەی دەستەکیی[د]
( کەرسەك ) کڵمتکی کەورە .
(کەرسەگ)کەرسەك . مەردومێکە بۆ هێندێ شت کە ربێو بۆهێندێ شتیش زۆرزان بێ .
( کەرشین ) د . کەسێکە بەدرۆ خۆی کردبێ بەنەوەی پێغەمبەر .
( کەرك ) ز . عەبای بێقۆل .
( کەرکرن ) ز . قەرزکردن .
( کەرکوژ ) د . ژالە .
( کەرکۆل ) گیایەکی پایزیی یە ، کولێکی شینی دررکاویی دەرئەکا ، کەلاکەی ئەکوترێ وئەکرێ بەپووشوو

جاشەکەر [د] .
( کەرکییت ) کەڵکییت .
( کەرك ) ھ . مریشك .
( کەرکراف ) شبهی جزیرە .
( کەرکەداس ) دارێکە ئەبڕێتە کلکی داس .
( کەرکەدەن ) کەرکەدەنـك .
(کەرکەدەنـك) کیانداریکی زۆر زلی قاچ و مل ئەستوورە شـاخێك وا بەسەر لووتیەوە .
( کەرکەس ) داڵە کەرخۆرە .
( کەرکەلارێ ) ھ . بالندەیەکی بـۆری دەنووك درێژە لە قـژاڵکە پچووکترە .
( کەرمە ) ز . پـارچە تەپاڵەی ووشکەوەبوو .
( کەرمێش ) ز . مێشە کەرانە .
( کەرۆکە ) مەردومی کێلۆکە .
( کەروو ) د . کاکلەمووشان .
(کەروێشك) دەعبایەکی تیژرەوی کێویی دەست کورتی قاچ درێژە ، گوێی وەك گوێی کەر وایە .
( کەروێشکە خەو ) بریتی یە لە نوستنێك کەچاوھێشتابەتەواویی نەقووچابێ

( کەروێشکە کردن ) جووڵانەوەی سەوزایی ھەراش بەدەم باوەبەرەنگێك کە مەردووم لە دوورەوە وا ببینێ کە ئەوسەوزاییبەئەرروات وشەپۆل ئەدا
(کەرە) چەوری یەکە کە بەژەندن لە ماست گیراوێ .
( کەرەپوول ) ز . داگیر کردنی مولكو مالی یەکێکە ، کە لەلایەن خاوەنی یەوە سەرپەرشتی نەکرێ .
( کەرەتوو ) کردوکێش .
( کەرەجی ) د . کەشتی پچووك
( کەرەدان ) دەفرێکە کە کەرەی تیا کۆبکرێتەوە .
( کەرەز ) کیایەکی کوێستانیی بەھاریی یەکەلای لە کەرەووزووردترە ئەکرێتە ترشیاتەوە .
( کەرەستە ) کەرەسە .
( کەرەسە ) چەن پارچەیەکە کە شتێکی تایبەتی لێ دروسـت بکرێ وەك دارو بەردو کەچ بۆ خانوو ، وە بەروپشت بۆ کالا .
( کەرەشێل ) د . کەلەشێر .
( کەرەکێفی ) د . کەرەکێویی .
( کەرەکێویی ) دەعبایەکی کێویی

زۆر خێرایە ، لەکەری مالی ئەچێ .
( کەرەکیی ) شتێکە کە هەر بۆ کەر بەکار بهێنرێ : ئەم کورتانە [ کەرەکیی ] یە .
( کەرەلیاس ) د . چاررچێی .
( کەرەم ) کەلك : بە [ کەرەم] نایەت ، یا بە [کەرەم] کەوتووە .
(کەرەنتوو) داسێکی کلك داریینی درێژی دەم پانە ، بە پێوە گیـای پێ ئەدرونەوە .
(کەرەنك) جۆرە مێشێکی گەورەیە لە هەنـگ پەیدا ئەبێ وهەنگوینی نی یە
( کەرەوان ) کەسێکە کە هەر کەر بلەوەررێنێ .
( کەرەوس ) د . کەرەووز .
(کەرەووز) گیایەکی توونی گەلا پانە بە کزشتەوە ئەخورێ .
( کەرهەنك ) جۆرە هەنگێکی بێ چزووی بۆرەلووکی بێ هەنگوینە ، هەمیشە لەپوورەدا شان هەل ئەبەستێ . جۆرە مێشێکە وەك خەرەنگەزە وایە .
( کەرەهوو ) ز. بای بە تەووژم لە هاوینانا .
( کەرهێ ) با . کۆکلاش .

( کەرێ ) کەرە .
( کەرێتیی ) بێ ژیریی .
( کەریی ) کەرێتیی . رانی مەرر [ز] . پارچەیەك لەمەمووشتێك[ز].
( کەز ) ز . قەوزە .
( کەزاختن ) ز . کزخاندن .
( کەزاخە ) با . بزرینی مێو لە بەهارانا .
( کەزان ) با . قەزوان .
( کەزنەزان ) دارێکی کوێستانی یە، وەك دارکەزوایە بەلام لەچەماندنەوە دا نەرمە .
( کەزوان ) ز . قەزوانی کێویی دەنك وورد .
( کەزەب ) ز . جەرگی گیاندار .
( کەزیی ) پرچ .
(کەژ) چیا . جۆرە شتێکی قایمی جوانی بریقەدارە وەك ئاوریشم وایە. تەنراوێکی پانی درێژکۆلە یەسەرو قنگی چێغو حەسیری پێ ئەگیرێ . شتێ سپی جوان . [با] .
( کەژال ) کەژەل .
( کەژاوە ) دوو ژووری پچکۆلەیە لەتەختە لەسەر پشتی وولاخ دانەنرێ

بۆ ئەوەی لەرێ ڕۆیشتنا هەرژوورەی یەکێکی تیا دابنیشێ .
( کەژك ) قەیاسە .
( کەژك ) کەژوو .
( کەژمالکردن ) هاتنە دەرەوەی زەلام لە هەموو مالێکەوەو چوونیان بۆ کەژ بۆ کەرران بەشوێن شتێکی وون بوودا .
(کەژۆك) کەژێکە وەك ئاوریشم وابێ . نەخۆشی [ عرق النساء ].
( کەژوو ) کەژك . کەژێکە کە سەروقنگی چێبێ وحەسیری پێ ئەکیرێ .
( کەژە ) د . قولنگەی فیلەوان
( کەژەل ) شتی بەلەك .
( کەژەوان ) شاخەوان .
( کەژیی ) کەژوو . شتی کێویی
( کەس ) یەکێك لە ئادەمی :
[ کەس ] م لەلانییە . خزموخوێش : خۆ بێ [ کەس ] نییم .
( کەساس ) کیانداری زەبوونی بێ نەوا .
(کەساسیی) زەبوونی و بێنەوایی.
( کەساندن ) حەواندنەوە . دلنیا کردن . هەلکرتنی گۆشت بۆخواردنی لە زستانا [ز] .
( کەسایەتی ) خزمایەتی .
( کەسپ ) کۆسپ . قوررپەستی سەربان لەسەر زەلەوە .
( کەسپك ) ز . هێلکە شەیتانۆکە.
( کەستك ) کەرسەك .
( کەستەك ) کەستك .
( کەسخاندن ) ز . کەزاختن .
( کەسك ) سەوز .
( کە سکاو ) سلقێکە کە لە ناو دۆلا کوترابێ بۆ ئاوچێشتی سلقاو .
( کەسکوسۆر ) کەسکوسوور .
(کەسکوسوور) پەلکە زێرریینە .
( کەسکون ) د . کەسکوون .
( کەسکوون ) خواردەمەنی توندو تیژ وەك سرکە .
( کەسکە ) ئافرەتی بێشەرم .
(کەسکە سۆر) ز. پەلکەزێرریینە
( کەسکێن ) کەسکوون .
( کەسمە ) د . کاسمە .
( کەسناو ) کونیە .
( کەسنە دار ) شتی نایاب کە کەس نەیبێ .
(کەسنەناس) کەسێکە لەشوێنێکا

کە کەس نەیناسێ : بررۆشوێنێکی کەس نەناس ، خۆت هەڵکێشە پرر بە کراسێ .

( کەسوکار ) خزم و خۆیش .

( کەسە پشت ) ل . ژیشك .

( کەسەر ) خەفەتو پەژارە .

(کەسیرە) گیاندارێکە لەسەرمانا کرژ هەڵاتبێ ، [ کەسیرە بوون ] کرژ هەڵاتن لە سەرمانا .

( کەسیف ) د . چەپەڵ .

( کەش ) درێژبوون و کشانی هێندێ شت: ئەم هەوییرە [کەش]ی هەیە . خۆشیانی ناوەندی دووباران : دەمێکە ئەبارێ هێشتا [کەش]ێکی تێ نەخستووە . چیا [ه] . زەمینێکە کە کزربووبێتەوە[د]. ئەستێرەی زوحەل [د]. بەمەعنا [بن] باخەڵە لەکاتێکا کە لەگەڵ(بن)یا[ژیر] دا بە کاربێنرێ : بن [ کەش ] واتە بن باخەڵ [ه] . سەرکردنی گوللە یاتیربە لای راست یاچەپا [ز] .

( کەشاکەش ) دەردی سەریی و سەغڵەتیی .

( کەشان کەشان ) بکرەوبەردەو پالە پەستۆ .

( کەشاو ) د . ئاودانی زەویی بۆ ئەوەی بکێڵرێ و تۆوی پیابچێنرێ تا سەووز بێ .

( کەشتێلە سەرە ) د . بەچکەی قومقومۆکە .

( کەشتیی ) پاپۆرر .

(کەشتیی جەنگیی) جۆرە کەشتیی یەکی زرێدارە لەجەنگا بەکار دێنرێ

( کەشتیی زرێدار ) جۆرە کەشتی یەکی جەنگی یە هەموو رووبەکی لە ئاسن گیراوە ، هیچ شتێك کاری تێ ناکا .

( کەشتییوان ) پاپۆرروان .

(کەشتییوانیی) خەریك بوون بە کەشتی لێخوررینەوە .

( کەشتی بەوان ) کەشتی وان .

( کەشتی بەوانیی ) کەشتی وانیی .

( کەششە ) ز . قەشە .

(کەشك) شتێکی میچۆلە میچۆلە یە لە خەستەی دۆ دروست ئەکرێ . پشتی پەنجەی بالا بەرزە کە بی مالییت بەسەری یەکێکا : کەشکێکی مالی بە سەریا .

( کەشك پا ) ل . ئەژنۆ .

(کەشکوسوور) د. شتی سوورو سپی.
( کەشکۆل ) جۆرە دەفرێکە لە
داری گویزی هیندستان دروست
ئەکرێ وزۆربیزەیەکی تێ ئەخرێ .زۆر تر
دەرویش ئەیکا بە قۆلیا و ئاوی پێ
ئەخواتەوە . ملوانکەیەکی زێرر یا
زیبوینە ئەکرێتە ملی منال . کتیبێکە
کەهۆنراوەی کەلێ شاعیری تیا نوسرابێ
( کەشکە ) چەمۆلە .
( کەشکە ئەژنۆ ) کلاوەی ئەژنۆ.
( کەشکەزرانی ) کەشکەئەژنۆ .
( کەشکەزەنگول )کەشکە زرانی .
( کەشکەژنۆ ) کەشکەئەژنۆ .
( کەشکەسەر ) قومقومۆکە .
( کەشکەسەرە ) کەشکەسەر .
( کەشکەشان ) کاکەشان .
(کەشکەك) چیشتێکە لەگۆشت و
کەنمەکوتاو دروست ئەکرێ .
( کەشکەلان ) شوێنی زۆر بەرز
کە دەست نەیگاتێ: تۆ لێم چوویتە
کەشکەلانی ئەلك .
(کەشکین) دۆکەشك[ز] چیشتی
دۆکەشك [د] .
( کەشماکەش ) د. کەشمەکەش
( کەشمان ) راکیشانی شتێك لە

دوو سەرەوە بۆ ئەوەی کە بکشێ .
( کەشمان هاتن ) کشان و فراوان
بوون و درێژبوونی شت .
( کەشم و ئەشم ) نازو عیشوە .
لەنجەو لار .
( کەشمەکەش ) کەشاکەش .
( کەشوتووش ) برریین یا درریین
یا خەت کێشـانی شتێك لە گۆشەیە
کەوە بۆ گۆشەیەکێ تری : [کەشو
تووش] کراسەکە ببررە یا لیفەکە
تەرییب بدە .
( کەشوفش ) دەعیە و دەمار و
فییزکردن .
( کەشوقنك ) د . کەشوفش .
( کەشول ) ز . پاقلەی دیمیی .
(کەشە) د . چار:چەن [ کەشە ]
هاتم واتە چەن جار . قەشە .
(کەشهاتن)کەشمان هاتن . ووشك
بوونەوەی زەویی بەجۆرێك کەبکێلرێ
(کەشەنك)گیانداری ماندووی کفت
( کەشەهەور ) هەورێکی پەلەپەلە
یەکە بکەوێتە رووی ئاسمان لەگەل
خۆشیی هەوادا .
( کەشییدە ) جۆرە پارچەیەکە

بە ئاوریشمی زەرد ئەچنرێ و حاجی بەسەریەوە ئەبەستێ. خەتێکی پچکۆلەی درێژە بەسەرهێندێ پیتی عەرەبی یەوە ئەنووسرێ .
( کەشیش ) قەشە . کەواد .
( کەف ) شتێکی سپیی سووکی بێ نموودە ئەکەوێتە سەرئاوو هێندێ شتی شل ، وە لە سابوون و ئەسپۆن و هێندێ شتی تریش پەیدا ئەبێ .
قەراغی حاجەت [ز] .
( کەفاك ) د . تەوقەسەری شت.
( کەفاندن ) ز. دروونی چوار دەوری کالا .
( کەفتار ) ز . کەمتیار .
( کەفتاررۆ ) با . کەفتار .
(کەفتانیی) سەبیلەدارێکی ساکاری سەرخرری تۆکمەیە ، تووتنی پێ ئەکێشرێ .
( کەفتن ) کەوتن .
( کەفتوو ) با . کەوتوو .
( کەفتە ) د . کەوتوو .
( کەفتەکار ) مەردومی کەوتووی زەبوون .
( کەفتەکاریی ) زەبوونی و لە کار کەوتنی مەروم .
( کەفتەیی ) د . کەوتوویی .
(کەفچاندن) کەف هاتنە دەرەوە لە دەم بە هۆی تووررە بوون یا ئازارێکەوە .
( کەفچك ) ز . کەوچك .
( کەفچیی ) ز . کەوچك .
(کەفر) با . تاشە بەردێکی گەورە کە بەقەد شاخێکەوە بێ .
( کەفرتاش ) با . بەرداش .
( کەفرڕێژ ) پڕبوونی شتێك یا شوێنێك لە شتێکی شل و هاتنە خوارەوەی بە لێواریا .
( کەفز ) ز . قەوزە .
(کەفش) کەوش . بن هەنگڵ [با]
( کەفشێف ) ز. سوێنەی کەشك تیا سوونەوە .
( کەفشێل )ز . لێوێکی دەم .
( کەفکانیی ) ز . بەردەقانیی .
( کەفکردن ) پەیدا بوونی کەف لە شتێکەوە .
( کەفکەنۆك ) ز . ئەسپۆن .
( کەفکیر ) کەوکیر .
( کەفلەمە ) د . کەپلەمە .
( کەفلێدان ) بریتی یە لە بردنی

شتێك بە ناخونەك .
(کەفمال) سواغێکە کە بە دەست درابێ .
( کەفوکول ) چلك وکەفێکە لە کاتی کولینا ئەکەوێتە سەرشت .
(کەفە) ئاسنێکە کزپاندرووئەیکاتە دەستی لە کاتی کارا .
( َەفە ژیاکە ) گۆشتی شلی چەرمە چەقالتە .
( کەفەل ) سمت .
(کەفەلپۆش) پارچەیەکە بەزینەوە ئەکەوێتە سەر کەفەلی وولاخ .
( کەفەلووك ) کەفەلووکە .
( کەفەلووکە ) کەفێکی کەمە کە لەگەل تەرریی‌یەکا تێکەل بوویێ .
( کەفەلولکە ) کەفەژیلکە . کەفەلووکە .
( کەفیدەریا ) شتێکی پفەلە وەك پووشـوو ، دەمو چاوی پێ ئەشۆرێ
( کەفیی ) ز . دەسەسرر .
( کەڤارك ) با . قارچك .
( کەڤان ) ز . کەوان .
( کەڤانژەن ) ز . هەلاج .
( کەڤتك ) ز. دەسەسرر . سەر پۆشی ژنان .
( کەڤر ) بەرد [ز] . تاشەبەردی گەورەی قەد شاخ .
( کەڤرکانی ) ز . بەردەقانیی .
( کەڤشك ) با . کررێشی سەر.
( کەڤك ) کەوچك .
( کەڤکیر ) ل . کەوکیر .
( کەڤلکرن ) با . کەوولکردنی گیاندار .
( کەڤن ) با . کون .
(کەڤنار) با . شتی زۆر کۆن .
( کەڤۆت ) ز . داری کەووت .
( کەڤۆك ) ز . کۆتر .
( کەڤووت ) با . کەڤۆت .
(کەڤەر) ز. بزنی بەلەك . کێو.
( کەڤەل ) ز . پێسـتی ئاژالی ووردە .
( کەڤینك ) با . جامانەیسەر .
( کەڤیی ) با . بەفرێکە کە بە زۆریی کەوتبێ بە سەریەکا .
( کەك ) کێچ [ه] . کاك [با]
(کەکرە) جۆرە خەیارێکی کێویی زۆر تالە .
( کەکلیی ) ه. کەوی بالندە .

( کەکەو ) کەووت .
( کەل ) شتی لاشکاو . کێو :
مانگ لەدەم[کەل]٥٠ لق : [کەل]ە
دارێکم بدەرێ واتە لقێك . فرمان :
[کەل]وکارم نی‌یە واتە بێ کارم[د] .
کەلك : بە [ کەل ] نی‌یە واتە بە
کەلك نی‌یە . شتی زۆر گەرم [ز] .
مەرری شاخدار [ز] . بەرانی شاخ
پچووك [ز] . پەچەی ئاژال [ھ] .
( کەل ) نێری رەشـە ووولاخ و
کامێش و بزنە کێوبی .
(کەلا)هەلماتێکە کەتێیلی‌پێ بکرێ .
شتێکە کەوتبێتە کەنارەوە .
( کەلائەنکوچك ) فەقیانە .
( کەلاتیی ) د . چەند خانوویەکە
کە بەسەر بەرزی‌یەکەوە کرابێ .
(کەلاج) ز . مەردومی دووورووی
بوختان کەر .
( کەلاخ ) ز. گیانداری لاواز .
( کەلار ) چەن شیشە تووتنێکی
زۆرە کە وەك خەرمان لەسەر یەك
دانرابێ . ناوی دێ‌یەکە لەناوچەی
کفری‌ی .
(کەلارە) دەفرێکی قوولە لەشیاکە
دروسـت ئەکرێ پووش و پەلاشی
ناومالی تێ‌ئەکرێ .
(کەلاس) ز. لاشەی مردارەوەبوو .
( کەلاش ) کلاش .
( کەلاشتن ) ز . قەلاشتن .
(کەلاشچن) کەسێکە کە کلاش بچنێ
(کەلاشچنین) چنینی سەری کلاش
( کەلاشەکردن ) کلاشەکردن .
( کەلافە ) کلافە .
( کەلافەت ) د . قەلافەت .
( کەلاك ) لاکی مردارەوەبوو .
( کەلام ) ھ . خەرمانی دەغل و
دان ، یاکزرەکیا .
( کەلان ) د . شتی گەورە .
(کەلانتەر) د . گەورەی گەررەك .
( کەلاندن ) با . کولاندن .
( کەلانکوچك ) فەقیانە .
(کەلانە) جۆرە نانێکە تەررەپیازی
چنراو ئەکرێتە سەر نیوەی‌نیوەکەی
تری ئەدرێتەوە بە سەریاو بە ساج
ئەبرژێنرێ .
( کەلانە ) کلانە .
( کەلاو ) کەلانکوچك .
(کەلاوە) خانوویەکە کە رووخابێ و

کەسیی تیا نەبێ .
( کەلایانی ) هەڵماتێن .
( کەلایی ) کەلیی‌شت .
( کەلاێێن ) کەلایانی .
( کەلب ) کوڵۆی شەکر .
(کەڵبە) چواردانی درێژی تیژی بە هێزە لە دانی پێشەوەی هێندێ گیاندار ، دوانیان لە سەرەوەیە و دوانیان لە خوارەوەیە ، وە لە ناوەندیانا چواردانی وورد هەیە .
(کەڵبەی‌زێین) د. قەڵپووسی زێین
( کەڵپ ) کەڵبە .
( کەڵپك ) ز . کەپەك . .
(کەڵپۆس) د. پێستەیەکە توو کەکەی پێوە مابێ .
( کەڵپە ) کەلبە .
( کەڵدان ) بەردانی رەشەووڵاخ و گامێش بۆ سەرمێ کەیان .
( کەڵدرر ) کەردرر .
(کەڵفیچ) کەسێکە دانی پێشەوەی کەل بووبێ و باش قسەی بۆنە کرێ .
( کەڵك ) کەڵك .
(کەڵك) قازانج‌وسوود . گوێسوانە . مەلێکی کێوییی سپی‌یە لە کۆترئەچێ .

سەربان [د] . سەقاقوش .
(کەڵك تێ کەوتن) پێویست بوونت بە یارمەتی یەکێك .
( کەلکردن ) پەلکردنی شت : گوێچکەی [ کەلکرد ] .
( کەڵك گرتن ) قازانج و سوود گەیاندن بەیەکێك .
( کەڵکەڵە ) خولیا کەوتنە سەر بۆ شتێك .
( کەڵکییت ) شتێکی دەسکدارە شانەی ئاسنی‌تێ‌براوە ، وەك پەنجەی دەست.ئەونی‌پێ‌ئەکوترێ بۆسفت‌بوونی
(کەڵلە)سەلکی‌گیاندار. قسلی کوڵۆ.
(کەڵلەبا) د. بریتی‌یە لە مەردوی خودسەری کەڵلە رەق .
( کەڵلەبایی ) د . خودسەریی .
(کەڵلەبۆش) بریتی‌یە لە مەردومی بێ‌ژیریی .
( کەڵلەپێژنك ) د . کەلەپێژنك .
( کەڵلەپاچە ) د . کەلە پاچە .
( کەڵلەتەزێن ) بریتی‌یە لە شتی زۆرسارد ، وەك ئاووماستاووهێندێ شتی تر .
(کەڵلەچاخ)د. مەردومی سەرزل .

(کەللەرەق) بریتی‌یە لە مەردومی رق ئەستوور .
(کەللەزاوور) بریتی‌یە لەمەردومی ترسنۆك .
(کەللە شەق) بریتی‌یە لە مەردومی تووررەوتررۆ .
کەللە شەکر) شەکرێکی داریژراوە کە سەرێکی پان‌وسەرێکی بارییکە
( کەللە قەند ) د . کەللەشەکر .
( کەللەکۆن ) بریتی‌یە لەمەردومی کۆنەپەرست .
( کەللەیی ) دەنگی گەورەی قەبە کە کار بکاتە سەر مێشك ، چ خۆش چ ناخۆش . کەلەکیی[د] . بریتی‌یە لە مەردومی شێت .
(کەل لێ کەفتن) د . کارتێ کەوتن
(کەلواز) . سەرمای زۆر بەتین .
( کەلوالك ) گیایەکی بەهاریی‌یە گولێکی سووری هەیە ، وەك پیالە وایە بنکێکی خرری سپیی شیرینی هەیە .
( کەلوان ) گزگل .
(کەلوپا) سەروپێی ئاژالی وورده .
( کەلوپاچکە ) کەل و پا .
( کەلوپوور ) د . کەل و پەل .
( کەل و پەل ) نوێن‌وجل‌وبەرگ .
( کەلۆس ) کەسێکە کە دانی پێشەوەی کەوتبێ .
(کەلوکۆم) شتی کۆنی شەق‌وشرر .
( کەلوو ) پۆرگی پاقلەو ماش و پۆلکەوفاسۆلیا . قولفەی تێ‌هەل گێشی ئەو شتانەی کە بەشیش ئەچنرێن ، وەك کۆرەوێی و لفکە . پسۆلکە . برجی ئاسمان .
(کەلوورر) ناوە بۆ تیپرەیەك لەکورد
( کەلووررێی ) جۆرە نقامێکی کوردی‌یە کە تیپرەی کەلوو رقسەی پێ ئەکەن .
( کەلووز ) فندق . بەری کاژ .
(کەلووك) نیوەی چارەکە خشت
( کەلە ) قەلەفرر . کەمە .
( کەلە ) برنجی پلاویی .
(کەلەئەنگوست) پەنجەی گەورەی دەست و پێ .
( کەلەئەنگوشت ) کەلەئەنگوست
( کەلەئەموست ) کەلە ئەنگوست
( کەلهاتن ) د . بەکارهاتن .
( کەلەباب ) کەلەشێر .
( کەلەبەر ) کونێکی گەورەیە لە

دیوار کە لەوانەبێ هاتووچۆی پیا بکرێ.
( کەلەبێژنگ ) کەمەی بێژنگ .
( کەلەپاچە ) سەروپێی ئاژاڵی سەربرراو .
( کەلەپاچە کردن ) بریتی یە لە شەق و پەق کردنی گیاندار .
( کەلەپچە ) ئاسنێکە ئەکرێتە دەستی بەندی یەوە ، [ کەلەپچە کردن ] بەستنی هەردو دەستی بەندیی بە [ کەلەپچە ] .
(کەلەپشکۆ) پشکۆئاگری گەورە .
( کەلەپوور ) ئەو شتانەیە کە لە مردوو بەجێ ئەمێنێ بۆکەس وکار.
( کەلە پیتاك ) شتێکە ئاغا لە مسکێنی خۆی بسێنێ ساڵی جارێك یا زیاتر ، لە دراو یا دەغڵ و دان یا شتی تر لەکاتی کەم دەستی یا .
( کەلە پیاو ) کەڵەمێرد .
( کەلەخ ) با . لاکی گیانداری مردارەوەبوو .
( کەلەدار ) داری گەورەی ئەستووری زل .
(کەڵەرم) گیایەکی گەڵاپانی خرری پێچ‌راوەی کوێستانی یە ئەکرێ بە یاپراخ .
(کەڵەز) دەمی تێبەربوونی مەررە کێویی .
( کەڵە زەرریی ) زۆرەملێیی .
( کەڵەژ ) دارێکی پەلپەلاوی یە دانەچەقێنرێ و مێوی لە بەهارانا ئەخرێتە سەر .
(کەڵەس) کوریێسێکە رائەنکێورێ بەسەر ئاوێکی زۆرا لەم سەرو لەو سەرەوە قایم ئەکرێ بۆئەوەی رێبوار دەستی پێوە بگرێ و بپەررێتەوە . کەڵەکی ئاو [د] .
( کەڵەسوو ) مانگاو گامێشێکە کە لەبەر زۆر لێ‌پەرریینی کەڵ ، هەرا سان بووبێ .
(کەڵەش) کەچەڵ [ز] . گیانداری زۆر جوان [ز] . پیاو خراپ [ز] جەستە . کەلاك .
(کەڵەش) د . کولۆش . مەردومی بێ‌عاری بێ‌ئابرروو .
( کەڵەشاخ ) شووشەیەکە وەك پیاڵە کلکێکی کولۆری هەیە خوێن و باکەشی پێ ئەگیرێ .
( کەڵەشێر ) باڵندەیەکی جوانی

پۆپنەداری دەنگ خۆشی ماڵی یە لە
وێنەی مریشك بەلاّم ئەم نێرە .
(کەلەشێرباز) کەسێکە کە حەزی
لەکەلەشێری باش بێ بۆشەرڕپێ کردنی
( کەلەشێرە ) شتێکە لە وێنەی
کەلەشێر لە سەر کۆپانی وولاّخی
پێشەنگ دروست ئەکرێ بۆجوانی .
( کەلەشێر ) ل . کەلەشێر .
( کەلەف ) ز . کەلاّفە .
( کەلەقەند ) د . کەللەشەکر .
( کەلەك ) قولاّخەی کەوش .
(کەلەك) چەن دارێکە ئەبەسترێ
بە چەن کوندەیەکی گەورەی فـوو
دراوە وە لە ناو ئاوا بۆپێ پەڕرینەوەو
هاتوچۆ پێ کردنی . فێل . دیبواری
بەردە کە بەووشکی هەڵچنرابێ .
( کەلەکباز ) فێلباز .
( کەلەکەبازیی ) فێلبازیی .
(کەلەکبوون) کۆبوونەوەی شت و
بەسەر یەکا کەوتنی .
( کەلەکچیی ) کەلەکەوان .
کەلەکباز .
( کەلەکردن ) د . کۆبوونەوەی
چەن کەسێك . کولەکردن .

( کەلەکۆتك ) کاسەی کەل .
( کەلەککردن ) د . کۆکردنەوەی
شت و بەسەر یەکا خستنی . وێل کردن .
( کەلەکە ) تەنیشتی گیاندار لە
بن دەستیەوە تا ژوور کولۆتی . کاسەی
کەل کە ئاوی تێ ئەکرێ بۆ سەگ و
مریشك .
( کەلەکە ) تەلەکە .
( کەلەکەبوون ) کەلەکبوون .
( کەلەکەبەستن ) خڕ بوونەوەو
کۆمەڵ بوونی گیاندار .
( کەلەکە تڕێ ) خۆبەسەر یەکا
دانی چەن کەسێك .
( کەلەکە کردن ) کەلەککردن .
( کەلەکەلە ) ووتەیەکە کەلەگای
پێ هان ئەدرێ بۆسەر مانگا بەکەل .
(کەلەکەوان) کەسێکە کە کەلەك
لێ بخورڕێ .
(کەلەکێویی) نێرێی مەڕرو بزنە کێویی
( کەلەگا ) نێرەگای بەکون .
(کەلەگایی) ئیستبدادوخودسەریی .
( کەلەگەت ) شتی بالاّبەرز .
(کەلەگیی) ژووری تەنیشت هەیوان
(کەلەلا) کەسێکە برینێکی گەورە

بە جەستەیەوە بێ، [ کەلەلا بوون ] بریندار بوونی جەستە بەبرینی گەورە [ کەلەلا کردن ] بریندار کردنی جەستەی گیاندار بە برینی گەورە .

( کەلەلان ) د . پشتیر .

(کەلەم) کەلەرم . قەڵبەی داروشتی تر [با] .

( کەلەم ) د . کەلەمەی جووت.

( کەلەموست ) کەلە ئەموست .

( کەلەمە ) دارێکە ئەکرێ بە کونی ئەم سەرو ئەوسەری [ نیبل ] دا ، وە ئەبەسترێتە ملی گای جووت .

( کەلەمە کردن ) خستنی کەلەمە بۆ ملی گاجووت . بریتی یە لە بەیدەست کردنی گیاندار .

( کەلەمێرد ) پیاوی دەم رراستی ئازای دەرهاتوو .

(کەلەمێروو) مێروولەی گەورەی لوتن

( کەلەمێش ) ز . مێشوولە .

( کەلەیی ) با . کەلەرم .

( کەلەن ) د . کەلەم .

(کەلەنچ) جۆرێکە لە بەری مازوو لەچەکەی هەلاج ئەچێ ، بەڵام ئەم کلکی نی یە .

( کەلەندیین ) ز. کۆمەڵەبەفرێکە کە لە بان مالیینەوە کۆبوو بێتەوە .

( کەلەوانە ) کلاّنە .

( کەلهورر ) کەلوورر .

( کەلەوەر ) کەلەبەر . دەرگا .

( کەلەوەر ررەشکردن ) بریتی یە لە دزیی کردن: کەلەوەری ئەومالەی ررەشکردن واتە دزیی لێ کرد .

( کەلەوێ ) گیایەکی کەلاّ پانی بەرزە دررکێکی تیژ دەرئەکا .

( کەلهە ) با . قەلاّ .

( کەلە هەرز ) کاتی تێ بەرربوونی بەرانە کێویی .

(کەلەهێرر) کۆبوونەوەی کەلەگای زۆر بۆ سەر مانگا بە کەل .

( کەلەهێرر کردن ) بریتی یە لە کەلە کۆمەکێ کردنی چەن کەسێك لە یەکێك .

(کەلی) فەرییك : کەلی نۆك واتە فەرییکە نۆك .

(کەلێن) کەلەبەر . پەناو دالدە : فیسارکەس لە کەلێنی فیسارایە ، واتە لە پەنایایەتی . کەمیین کا: فیسارکەس لە [ کەلێن ] دا بۆی

دانیشتووە .
(کەڵێن) قاپشێکە ئەکرێتە ملی تانجی
( کەلیی ) عاسمی کەلایی شت.
خواردەمەنیی کەم خوێ [ ز ] .
کیانداری کلك کورت [ ز ] .
کیانداری گوێ کورت [ز] .
( کەلییژ ) ز. کلینچکەی مەرر
( کەلییلان ) ز . کەرمیی .
( کەلیین ) ز . کولاّن .
(کەڵیین) د . شتی کەورەی زەلام .
( کەم ) شتێکە کە زۆر نەبێ .
(کەما) کیایەکی لاسك ئەستووری کەڵا ووردی بەهارییە، کزرە ئەکرێ بۆ ئاژاڵ .
( کەماچارر ) شوێنێکە کە کەمای زۆر بێ .
( کەماچە ) ز. کەمانچە .
( کەماخ ) سمت [با] . کامۆخ .
(کەمان) کەمانچە . سیینە کەمان . کەوان .
(کەمانچە) پارچەیەکە لەپارچەی مۆزیقە ، چەن ژێیەکی پێوەیە ، دارێکی تایبەتی ئەهێنرێ بەژێ کانا، دەنکێکی خۆشی لێوەدێ .
( کەمانچەژەن ) کەسێکە کە کەمانچە باشی لێبدا .
(کەمانە) تیرێکی هاوێژراوە کە بگەرێتەوە بەهۆی کەوتنی لەشتێکەوە
( کەماو ) چێشتی پییتە .
( کەمایەتی ) شتێکی کەم لەناو شتێکی زۆرا : تورکمان لەکەرکوکا کەمایەتییە .
(کەمایەسیی) کەم بوونەوەی شت و نزیك بوونەوەی لە برانەوە .
( کەمایی ) کەمایەسیی .
(کەمباخ) ز . زۆرداری ستەمکار. کەلاوە .
( کەمبارە ) د . کەم بەهرە .
( کەمبوون ) نزیك بوونی شت لە بەسەرچوونی : ترێ [کەم بووە] واتە هاکا بەسەرچوو .
(کەمبوونەوە) هاتنە کەمایەسیی شت
( کەمبەت ) ز . کومەز .
( کەمتابێژ ) کەمێك لەشتێك : [ کەم تابێژ ] یێك دانیشت یاقسەی کرد یا خواردی .
( کەمتار ) ل . کەمتیار .
(کەمتەرخەم) کەسێکە شتی زۆر

مەبەست نەبێ .
( کەمتەرخەمیی ) کوێ نەدانەشت
( کەمتیار ) دەعبایەکی کێویی یە یالو سمی لە هی کەر ئەچێ .
( کەمتیین ) گیانداری بێ‌هێز .
( کەمچك ) ل . کەوچك .
(کەمچە) ئاسنێکی درێژە دەسکەکەی دارە ئاکری توونی پێ ئەکرێ.ماڵە[د]
( کەمچییکڵدانە ) بـریتی یە لە مەردومی توورە .
(کەمخۆر) گیانداریکە کە خواردنی کەم بێ .
( کەمخـە ) ز . کاڵایەکە کە لە ئاوریشمی سووری رەشباو دروست کرابێ .
(کەمدوو) کەسێکەکە کەم قسەبێ .
( کەمر ) بەرد .
( کەمراوێژ ) کەمتابێژ .
( کەمروو ) بریتییە لەمەردومی شەرمن .
( کەمرە ) کەمرە .
( کەمقنیات ) کەمخۆر .
( کەمکردن ) لاوازبوون . کورت هێنانی شت .
(کەمکۆل) توێکڵی سەوزی گوێز. کەر کۆل .
( کەمۆ ) دەستەمۆ .
( کەمۆت ) ز . بێ‌گوێی لاسار
( کەموسکە ) زۆرکەم لە شتێك .
(کەموکوورر) شتی کەمی نیبوە چڵ
(کەموکووریی) بریتی یە لە نادارایی
( کەمۆلە ) کاسەی‌کەورەی داریین
( کەمە ) کەلە بێژنك . تەختەی کەوانە داری ئەم سەرو ئەو سەری بێشکە . پەررەی خەررەك .
( کەمەچکرن ) ز . هەڵپاچیینی کەمێك لە خوریی پشتی مەرر بۆ نیشانە کردنی .
( کەمەر )ناوقەدی‌شت. خررەبەرد
( کەمەربەست ) کەمەربەستە .
( کەمەربەستن ) خۆ ئامادە کردن بۆ پچووکی یەکێك .
(کەمەربەستە) بریتی‌یە لە بەندە . بریتی یە لە کەسێك کە ئـامادەی فرمانێك بێ .
( کەمەربەن ) کەمەربەند .
( کەمەر بەند ) جۆرە پشتێنێکی دوو توێیە دراوی تێ ئەکرێ .

( کەمەرچین ) جورە پالتۆیەکی ژنانەیە کە بە سورمەدا دروابێ .

( کەمەردووخ ) د. بەرەتەشی .

( کەمەرکەش ) د. دەرپێیەکی کورتە، لەژێرشەروالەوە لەپێ ئەکرێ

( کەمەرە ) پشتێنێکی زیوین یا زێرینی گۆدارە ، ژنان ئەیبەستنە پشتیان . لاوانەیە کە لە ناو قەدی منارەدا بانگدەر بانگی لەسەرئەدا. ناوقەدی شاخ . چەند تەختەیەکە ئەدرێن لە رووکاری دۆلیانی ئاش. نارەرراستی زەویی .

( کەمەك ) کەمێك .

( کەمەن ) کەمەند .

(کەمەند) گوریس یا زنجیرێکی درێژە ئەم سەرو ئەوسەرەکەی بە سنگێکەوە ئەبەسترێ ، ئنجا بە ریزە وولاخی پێوە ئەبەسترێتەوە . شتێکە وەك عەگال لەکاتی دانیشتنا ئەکرێتە پشتو بەرئەژنو ، بۆئەوەی کە بەم لاو بەو لادا نەکەوێ .

(کەمەندکێش) بریتی‌یە لەکەسێك کەرەوودەوکرەتاری رەووشت و خووی بەرزی پیاوێکی خواشناس بووبێ .

( کەمەندهاویشتن ) هاویشتنی کەمەند بۆ گرتنی شتێك .

( کەمیك ) ز. دەسەسرری دەم‌و چاوسرریین .

( کەمێل ) تیسکە خوریی‌یەکە لە ژێر دووگێ ئاژاڵەوە رییخی پێوە ووشك بوو بێتەوە .

(کەمێلە) کەمێل . قەرتماغە [د].

( کەمیی ) بوونی شت بە کەم .

( کەمیین ) حەشار .

(کەمیینگا)شوێنی‌خۆتیاحەشاردان.

(کەن) کەنە [د] . پێکەنین [ز].

( کەنار ) قەراغی شت . مۆرد .

(کەناراو) بریتی‌یە لەناودەستخانە.

( کەنارگرتن ) خۆ دوورخستنەوە لە کارێك .

(کەنارە)کەنار . لاکێشی بارییك کە لەم لاو لەولای میان فەرشەوە رائەخرێ . پەراوێز .

(کەنارەگیر) کەسێکە کە هەمیشە خۆی کەنار بگرێ .

( کەنارەگیریی ) گۆشەگیریی .

( کەناریی ) با . دررکەزیی .

( کەناو )دادررگەی ئاو .

( کەند ) کەنك .
( کەندال ) ز . تەپۆلکە .
(کەندال) کەندەلان [د]. کێژ [با].
( کەنداو ) شوێنێکە لە قەراغی دەریاکە ئاودای دررببێ ، وەماوەیەك چووبێتە ناوەوە « خلیج » .
(کەندرر) بوو درزێکە لە زەویی، کە ئاو دای دررییی بێ .
( کەندن ) هەلکەندن . بەردانە وەی ترریاتس .
( کەندۆ ) مانگایەکی قسرە کە یەشتا ووشکی نەکردبێ .
(کەندوو) شتێکی بۆشی بەرزیی گەورەی پێچکەدارە لەقوور درەست ئەکرێ بۆ دەغڵ و دان تێکردن .
( کەندەسمە ) بالندەیەکە لە ریشۆلە گەورەترە هەر بەقەد کەندەوە هێلانە ئەکا .
( کەندەکار ) کەسێکە کە کاری هەر هەلکەندن بێ .
(کەندەلان) قەد پالێکە ئاو بۆشی کردبێو دای دررییی بێ .
( کەنراوە ) ئاژالێکە کە قەلەو بووبێ و بەخۆیا هاتبێ : ئەم مەررە باشی [ کەنراوەتەوە ] .
( کەنسی ) د . رژدی چرووك .
(کەنەتە) جێی خواپەرستی جوولەکە
( کەنك ) کەندەلان .
( کەنکر ) کنکر .
( کەنکەلان ) کەندەلان .
( کەنگێ ) کەی .
( کەنگیین ) کەی : کەنگیین تۆ رۆیشتی هەنگیین منیش دێم .
( کەنگیینێ ) کەێ .
( کەنن ) د . هەل کێشان .
داکەندن . پێکەنیین . کردنەوەی بەری میوەو سەوزایی .
(کەنۆ) کەندۆ. گوێرەکەی یەك سالە
( کەنۆش ) د . کون دووش .
( کەنوو ) کەندوو . پێکەنیین .
کەلوی شانی هەنگوێین [د] .
( کەنە ) کنە .
( کەنەسمە ) د . کەندەسمە .
(کەنەفت) زەبوونی بێدەسەلات ،
[ کەنەفت بوون ] زەبوون بوون ،
[ کەنەفت کردن ] زەبوون کردن .
( کەنەفتیی ) زەبوونی .
( کەنەك ) . کەند [د]. کابەرد.

(کەنەنە) ئەشوێیەکی پچکۆلانەی دەم کەوانەیی‌یە ، ناوی کەوچك و ئەسکوێی پێ هەڵئەکەندرێ ، ئنجا بە لێسك لووس ئەکرێ .

( کەنێر ) دارێکی کوێستانی‌یە، گەڵای وەك داری کەووت وایە ، ل کاتی سووتانا بۆنی خۆشە .

( کەنێرە ) گیایەکی بەهاریی بۆن خۆشی گوڵ زەردی گەڵا خڕە .

(کەنیشك) مێیینەیەکە کە یەشتا شووی نەکردبێ نەوەی مێیینەی باوك و دایك .

( کەنیشکە ژاك ) د . کچەزا.

(کەنیشکیی) کچێنیی. کچێنەی چاو.

( کەنیی ) ووتەیەکە وەك ووتەی [ کچێ ] بەکاردێنرێ .

( کەنییز ) ل . کەنییزەك .

( کەنییزەك ) کارەکەر .

( کەنیلە ) د . کەنیی .

(کەنیین) پێکەنیین . بەردانەوەی ترروتس .

( کەو ) باڵندەیەکی خاڵو مییل داری قاچ و دەنووك سووری بۆرە، لەکۆتر گەورەترە . شتێکە لە[کلکییر]

شاش ترە ، خەرمانو پێ پوختە ئەکرێ. هەڵکوشیینی بریین بۆ پاك‌بوونەوەی.

( کەوا ) جۆرە کاڵایەکی قۆڵ و چاکەلداری درێژە .

( کەوابوو ) کەواتە .

( کەواتە ) ووتەیەکە بەکاردێنرێ لە وەرامی ووتارێکا کە لەبەر ئاشکرایی فررێ درابێ : [کەواتە] وەرە لام، لە وەرامی یەکێکا کە بڵێ ئیمشەو ئیشم نی‌یە ، واتە کە ئیشت نی‌یە وەرە لای من .

(کەوان) دارێکی چەوتاوەیە تییری پێ ئەهاوێژرێ. دارێکی درێژی کەمێك خوارە ژێیەکی پێوەیە هەلاج چەکەی پیا ئەماڵێ لە کاتی هەلاجی‌دا ، دارێکی کەوانەدارە چەرمێکی درێژی بەسەرەوەیە لە [ مەتە ] ئەئاڵێنرێ و داری پێ کون ئەکرێ . نیشانەیەکە وەکو : ( ) بە گردی ووشەیەك یا ژمارەیەکا ئەنوسرێ کە گرنگی یەکی ببێ .

(کەوان پییتك) د. شتێکە وەك‌دار لاستیك بەردی پێ ئەهاوێژرێ .

( کەوانگۆشە ) نیشانەیەکە وەکو:

[ ] کە ئەمیش وەك کەوان بەکار
دێنرێ .
(کەوانە) کەوان . دارێکی دوو
لقە بەکوریەسێکی باریک ئەبەسترێ
بە هەردوو پێچکەی شەخرەوە ، بۆ
ئەوەی قرچەی پێ بکوێزرێتەوە بۆسەر
خەرمان . پێچ و دەرەی سەربەرەو
ژوورە . هەموو شتێکی کەوانەیی .
لای ژوورووی هەموو شت . دوو
تەختەی پان و درێژە ئەبەسترێن بە
ژێر پێوە بۆ ئەوەی بە سەر بەفرا
بڕۆن و نەچەقن .
( کەوانەدار ) شتی کەوانەیی .
( کەوانەیی ) شتێکە بەرزێکیی
چەوتابێتەوە .
( کەواو ) کەباب .
( کەواوچیی ) کەبابچی .
( کەواوخانە ) کەبابخانە .
( کەوایە ) کەواتە .
( کەوبارر ) بەچکەکەو .
( کەوباز ) کەسێکە کە حەز ل
ڕاکرتنی کەو بکا .
( کەوبووار ) شوێنێکە کە کەو
پیا بڕوا. کاتێکە کە پۆلەکەو بەرەو
کوێستان ئەگەڕێتەوە .
( کەوبەدار ) بەهارێکی درەنگە
کە کەو لەبەرگەنەشێنکە هەڵنیشێتە
سەردار .
( کەوتن ) بەلادا هاتنی شتێك بۆ
سەرزەویی .
( کەوتنەخۆ ) خۆ ئامادەکردن .
( کەوتنەخوارەوە ) کەوتنی شتێك
لە بەرزیی یەکەوە بۆ نزمی یەك .
( کەوتنەوە ) دواکەوتنی کەسێك
لە ڕۆیین و مانەوەی: نیازم بوو بچم
بۆ لادێ کەچی [ کەوتمەوە ] وانە
پەکم کەوت . وازهێنانی یەکێك لە
شتێك: لێم [بکەوەرەوە]. هەڵدانەوەی
گرانەتا لە گرانەتێدار دوای ئارەق
کردنی .
( کەوتوو ) کەسێك یا شتێکە
کە کاوتبێ .
( کەوتوویی ) گرانەتێ .
( کەوجز ) د . کەوجێز .
(کەوجێز)د. ئاوگردان . ئەسکوێ
( کەوچ ) م . مەنی پێوانە .
( کەوچك ) شتێکی کلك داری
دەم پانە شتی پێ ئەخورێ .

(کەوچکتاش) کەسێکە کە کەوچك دروست بکا لەدار. لێسکە . ناوی دێ یەکە لە شارەزوور .
(کەوچکە) کەوچکێکە ئەبەستری بە [چەرەخۆرە] ەوە ، دانەوێلەی لێ ئەچێتە گێری ئاشەوە .
( کەوچە ) د . کەوچك .
( کەوداو ) ماکەوێکە کە بنرێتەوە بۆ ئەوەی نێرەکەو دەوری بدەن تا راوبکرێن . چەنداوێکە دائەنرێن لە نزییك ماکاوێکەوو بۆ ئەوەی ئەگەر ماکەوەکە خوێندی کەوی تر بێن بە دەنگی یەوەو بکەونە ناوئەوداوانەوە .
(کەودەری) جۆرە کەوێکی گەورەیە زۆر حەزی لە ناو بەفرە .
( کەودەن ) مەردومی نازییرەك .
(کەورك) ز. جۆرێکە لە هەرمێ .
( کەورنکان ) ز . جۆرە دانەوێلەیەکە لەگرانی دا تێکەڵی گەنم ئەکرێ و ئەخورێ .
( کەورێشك ) کەروێشك .
( کەورێشکە ) د کەروێشکە .
( کەوسەل ) ز . کیسەڵ .
( کەوش ) جۆرە پێڵاوێکی بێ پاژنەی لووت هەڵگەڕراوەیە . سەر بەرەو خوارە . هەنگڵی گیاندار .
( کەوشدروو ) کەسێکە کە هەر کەوش دروست بکا .
( کەوشدۆز ) کەوشدروو .
(کەوشکەن) شوێنێکە کەکەوشی تیا دابکەنرێ .
( کەوشەك ) یاریی سێ بازد.
( کەوشەن ) مەیدانی کشت وکاڵ و ئاژاڵ و لەوەڕراندنی ئاوایی یەکا .
( کەوشێن ) کەوشەك .
( کەوك ) ل . کەو .
(کەوکردن) لەکەودانی دانەوێلە.
(کەو کەمانە) برینێکە لەمەلاشوودا پەیدا ئەبێ .
(کەوکەندەر) با . جۆرە کەوێکی گەورەی زەرد باوە .
( کەوکیر ) شتێکی کلك درێژی دەم پانی کون کونە لە مس یا لە فافۆن چێشتی توندەی پێ تێ ئەکرێ و کەفی چێشت وگۆشتی پێ ئەگیرێ.
( کەوکیرە) برینێکە بەقەد دەمە کەوکیرێك پان و کون کونە .
( کەول ) پێستی گیراوەی هێندێ

گیاندار . شتێکە وەك پاڵتۆ پێستی تووکداری خۆشەکراوی بەبەرانەکیرێ وە بۆکەرمیی بەزستان لەبەرئەکرێ.
کەول پۆست . مشەمما یا تەنراوێکی چوارسووچە لەسەرتەنوور دائەخرێ بۆ نان لەسەرکردنی .
( کەولپۆست ) کەوڵێکی تایبەتی خۆش کراوی تیسکنەبۆلەسەردانیشتن.
(کەول کردن) گورروونی گیاندار . بریتی‌یە لە بەیدەستو زەبوونکردنی گیاندارێك: فەرهادنەریمانی کەول کرد.
(کەولۆس) شوێنێکەئاودای‌درریی‌بێ‌ ناوی دێیەکە لە ناوچەی خورمال.
(کەولە) د . شتی شینی‌کەوەلە.
شوێنی رووتەنی زیبخەڵانی شین .
(کەولەکۆن) بریتی‌یە لە مەردومی پییرێ قرخنی پەك کەوتە .
( کەولێدان ) کەوکردن .
(کەومار) جۆرەمارێکە وەك کەو ئەخوێنێ .
( کەون ) کۆن .
( کەونە ) کۆنە .
( کەونەفرۆش ) کۆنە فرۆش .
( کەونیینە ) بە شتی کۆن ئەڵێن.

(کەووت) دارێکی‌سەختە کەوچکی لی‌دروست ئەکرێ .
( کەوور ) بزنی سپی .
( کەوورك ) ئەشکەوت .
( کەووك ) د . شتی شین .
(کەوە) کەووك . کەوی دەغڵ‌ پێوان
( کەوەت ) کەووت .
( کەوەر ) گیایەکی توونی کەڵا پانی بێ‌لقە . کە وورك [د] .
(کەوەرزۆژ) رۆژێکە کە بەری ئاسمان تەنکە هەوری بێ‌وسەرمابێ .
(کەوەررێ) بێزار بوون لەلەشی‌خۆت: لەلەشی خۆم کە وەررێ بووم ، بەڵام نابێژرێ لەفلاْنشت‌کەوەررێ بووم .
(کەوەسێر) مەررێکە توو کی دەمو چاوی سپی‌یەکی شین باوبێ .
( کەوشەن ) سنوور .
(کەوەکیی) د . کەنەیەکە ئەداتە مەررو بزن .
(کەوەل) جۆرێکە لە بەری مازوو دار کەڵا پان و توو کنە .
(کەوەلە) گیاندارێکی وورده وەك ررشك ئەداتە ئاژاڵ. شتی شیینکار.
زەوی‌ی‌و شاخی رووتەنی شیینکار .

( کەوەمار ) شینە مار .
( کەوێ ) کەوا .
( کەوێژە ) کەوچکەی ئاش .
(کەوێل)خانووی ناوباخ. ئەشکەوتی پچووك .
( کەویە ) نزم .
(کەویی) باڵندەیەکە لەماڵا دەستەمۆ بووبێ ، [ کەویی بوون ] دەستەمۆ بوون [ کەویی کردن ] دەستەمۆ کردن . رنووی بەفر .
( کەوییچە ) کەوێژە .
( کەوییر ) د. دەشتی زییخەڵانی بێ ئاوو بێسەوزایی .
(کەوییژ)دەفرێکە شتی پێ ئەپێورێ: چ کەوییژێ چ مەوییژێ .
( کەوییژە ) کەوێژە .
( کەه ) ل . کا .
( کەهال ) د. تەمەڵ .
( کەهروبان ) ز . کارەبا .
( کەهرێز ) کارێز .
( کەهرییز ) ل . کارێز .
( کەهنیی ) ز. کانیی .
( کەهیا ) گەورە . سەرۆك .
( کەهێـڵ ) مەردومی سست و تەمەڵ لە کارا .
( کەهیی ) با . گیاندارێکە کە لە ماڵا رام بووبێ .
( کەی ) پیتی پرسیار لەکات : [ کەی ] ئەرروێت . یاریی و کایە [م] . شا : کەی خوسرەو .
( کەیارك ) ز. کارك .
(کەیاندن) ز . ژەندنی مەشکە .
(کەیبانوو) ژنێکەلەماڵاسەرپەرشتی ئیش و کار بکا .
( کەی بەکەی ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ بۆ باسی ماوەیەکی زۆر لەمە پێش لە کات : [ کەی بەکەی ] هاتووم ، واتە زۆر دەمێکە .
( کەیس ) با . هەل .
( کەیف ) خۆشیی دڵ : فیسار کەس بە[کەیف]ە یا بێ [کەیف]ە .
(کەیف کردن) بەخۆشیی رابواردن.
( کەیك ) کێچ .
( کەیکف ) کێکف .
(کەیکووا) د. مەردوومی کارزانی راوێژ پێ کراو .
( کەیل ) پرر : دلم [ کەیل] ە واتە پررە لەخەم وخەفەت ، [ کەیل

بوون ] دل پڕربوون لەخەموخەفەت ،
[کەیل کردن] پڕرکردنی دڵی یەکێك
لە خەم و خەفەت . کەلاوە.
( کەیلان ) د . ئافرەتی تەڕرلان .
( کەینوبەین ) ئەگبیر و ڕازێکە
کە بکرێ لە ناو چەن کەسێکا بۆ
کردنی کارێك بەپەنهانی: چ [ کەین و
بەین ] ێکتان بە دەستەوەیە ؟
( کەینێ ) کەی .
( کەیوان ) ئەستێرەی [زوحەل]
( کەیوانوو ) کەیبانوو .
( کەیەل ) خانوویەکە بەهاوینان
لە ناو باخا ئەکرێ .
( کەیی ) کەویی .
( کەێیر ز . درەختی مۆرد .
( کێ ) پیتی پرسیارە بۆدەست
نیشان کردن «تعیین» ی تاقەکەسێك:
کێ بوو هات ؟ . دێ : [ کێ ]
خوا ، واتە کوێخای دێ . پیتێکە
بۆخۆشەویستیی ئەنرێ بەدوای هێندێ
ووتەوە: کناچە [کێ] واتە خوشکە ای .
پیتێکە ئەنرێ بەو کارانەی کە لە
یاریی دا ئەکرێ و ئەیکا بە مصدری
یاریی:چاوشار[کێ] ، دایە لۆ [کێ].

( کیار ) ھ . بێستانی کاڵەك و
شووتی و ترۆزیی و خەیار و بامیە و
باینجان و تەماتە .
(کیاستن) ناردنی یەکێك بۆشوێنێك
( کیانا ) ھ . ناردن .
( کێتك ) با . پشیلە .
(کێچ) گیاندارێکی ڕەشی ووردی
قاچ بڕرگە بڕرگەی بەئالۆشی خاوەن
قەلەمبازە ، بەهاران ئەژێتەوە .
( کێچ کەوتنە کەول ) بریتی یە
لە پەلە پەل پێ کەوتنی یەکێك .
(کێچە ڕەشکە) دەعبایەکە بێستان و
شینایی ئەخوا .
(کێچ هەڵهێنان) بریتی یە لە پەلە
پەل پێ کەوتنی یەکێك بۆبەجێ هێشتنی
شوێنێك .
( کێخا ) د . کوێخا .
( کێخوا ) د . کوێخا .
( کێر ) جێگای ئەتەوە خستنەوەو
مێیێ کردنی نێرینە. کار، کەڵك[ز] .
کێرد [ز] . شتی کاڵی نەکەیشتوو .
(کێران)ز. داری درێژی ئەستوور.
( کێرخۆر ) بریتی یە لە ئافرەتی
جۆشن .

(کێرد) تیغێکی دەم پانی مشتوو دارە ئانوشتێتەوە .
( کێردگەر ) کەسێکە کە کێرد دوروست بکا .
( کێرر ) خەتی کێشراو لە سەر زەویی یا کاغەز .
( کێررا ) کوێررا .
( کێرزل ) بریتیی‌یە لە مەردومی زۆردار .
(کێرزلیی) بریتیی‌یە لە زۆرداریی.
( کێرسم ) ز. شێوەی ئادەمی‌زاد
( کێرك ) ز . کێردی پچووك .
( کێرکەر ) کارەکەر .
( کێرکەڵە ) د . گیاکەڵە .
( کێرهاتن ) ز . بەکارهاتن
( کێرەفیێل ) بریتیی‌یە لە قامچی هۆنراوە کە ئەکرێتە دەست .
(کێرەکەڵەکا) گیایەکی یەك لقە باڵای هەمووی‌کوڵە ، وە لەناوتووتنا دەردێ و زەبوونی ئەکات .
( کێریشك ) با . کەروێشك .
( کێز با . کووخلێنکە .
( کێزان ) ژەندنی مەشکە .
( کێزاندن ) کێزان .
( کێزر ) کۆمەڵە خەڵفێکە کە بە پرریی لە زەویی هەڵبێتە دەرەوە . کەسێکە لە کردارا هەڵەشەبێ و بە خودسەریی ئیش بکا .
( کێزریی ) هەڵەشەیی‌وخودسەریی لە کاروبارا .
( کێزك ) ز . کێز .
( کێزم ) با . ئاقە دارێکە کە مێوێکی خرابێتە سەر .
( کێزە ) با . قالزنچە .
( کێزەر ) کێزر .
( کێزەریی ) کێزریی .
( کێزێن ) ز . لولەیەکە بەژێر زەویی‌دا برابێ بۆ ئاوپیابردن .
( کێزیی ) ز . کەسك .
( کێژوولە ) چۆلەکە .
( کێس ) کەس [ز] . کێیس [ا]
( کێش ) رەشتیی . تەوانایی : لە [کێش] ی منا نی یە . نۆرەیەك لە شتی‌بەترازوو کێشراو : ئەمە دوو یا سێ [کێش] ە . وەزنی شیعر . مشکیی. پێز: ئەم هەویرە بە[کێشە] .
( کێشان ) راکێشانی شت . قوم دان لە جگەرەو سەبیل‌و نێرکەڵە . ئەندازە گرتنی شت بە سەنگ و ترازوو. پەرراندنی وولاخی نێرلەمێ.

( کێشانن ) د . کێشان .
( کێشانه ) ئەندازه گرتنی شت
بە سەنگو تەرازوو .
( کێشانە کردن ) کێشانە .
( کێشانەوە ) هێنانەدواوەی شت :
ئاگرەکە یا لەشکرەکە [بکێشەرەوە].
( کێشران ) کێشان .
( کێشراو ) شتێکە کە کێشرابێ.
( کێشك ) ئێشك . ووتەی پرسیارە
وەك ووتەی [چی] [ز] .
( کێشکچیی ) ئێشکچیی .
( کێشکردن ) ڕاکێشانی شت .
( کێشککرتن ) ئێشك کرتن .
( کێشکە ) با : چۆلەکە .
( کێشماکێش ) د. کێشمەکێش
( کێشمان ) کشان و فراوان
بوونی شت:فانیلەکە[کێشمان]ی دێ
( کێشمە کێش ) بگرەو بەردەو
دەردی سەریی .
( کێشـندە ) هێزێکە لە هێندێ
شتا هەیە شتی ترڕانە کێشێ بەلای خۆیا
( کێشواکێش ) د. کێشمەکێش
( کێشولە ) چۆلەکە .
( کیشوەر ) حکومة .

( کێشە) بردنی کولۆشە لەشاراوە
بۆسەر خەرمان . هەراو کێشمەکێش.
( کێشهاتن ) کێشمانی شت .
( کێشە کێش ) کێشمە کێش .
( کێشەوبەرە ) کێشمەکێش .
( کێشە وە ) کواستنەوەی شتێك
لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر .
( کێشەوێ ) کێشەوە .
( کێشیاگ ) د. کێشراو .
( کێشیان ) کێشان .
( کێف ) کێو .
( کێفرۆشك ) ز . کەروێشك .
( کێفزال ) ز . قرژال .
( کێفژالە ) کێفزال .
( کێفسار ) د. کێوسار .
( کێفسان ) د . کێوسال .
(کێفش)ز. شتی ئاشکرای نمایان
( کێفکی ) با . شتی بۆکەن .
( کێفیی ) کێویی .
( کێفیلە ) د . کێوییلە .
( کێفریشك ) با . کەروێشك .
( کێڤی ) ز . کووپەلۆکە .
( کێڤیی ) ز . دەفرێکی کلیینە
ڕۆن یا هەنگوینی تێ ئەکرێ .

( کێکف ) تیرو .

( کێکوو ) د . کێکف .

( کێل ) دوو تەلەبەرد یا دوو میلە لە سەرێن و پێیینی گۆڕەوە دائەچەقێنرێ . شتی بەرز[ کێل بوو نەوە ] بەرزبوونەوە [ کێل کردنەوە ] بەرزکردنەوە .

(کێل)کەیەل [ە] . میلی رەنگاو رەنگی بەررە . کێل [د] .

( کێلان ) بەرگی خەنجەروشیر.

( کێلاّن ) هەڵگێرانەوەی زەویی بە کاسن بۆ کشتوکاڵ .

( کێلانە ) کێلان .

( کێلدان ) ز . دروومان .

( کێلران ) کێلاّن .

( کێلراو ) شوێنێکە کەکێلرابێ

( کێلك ) ز . کەلەکە .

( کێلکە ) زەویی‌یەکە دەست بدا بۆکێلاّن . زەویی کێلراو .

(کێلوك) با . ژنێکە کەموسوڵمان نەبێ .

( کێلوون ) ئاسنێکی زمانەدارە ئەدرێ لە دەرگاو سندووق و بە کلیل دائەخرێ .

( کێلە ) د . کەوییژ .

( کێلە بەردانێ ) یاری‌یەکی دوو دەستە یێ یە ، هەر دەستەی چەند کەس بێ ئەبێ ئەوەندە تەنکە بەردی بچووکی بەقەد دەستێك ئامادەبکەن ، دەستەیەکیان بەردەکانیان‌دائەچەقێنن و دەستەکەی تر تەنکە بەردەکانی خۆیانی تێ‌ئەگرن .

( کێلەندیی ) ز . جۆرە داسێکی گەورەیە بە هەردوو دەست ئەگیرێ و دروێنەی پێ‌ئەکرێ .

(کێلێژە) کۆڵەکەی چارداخی‌تووتن

(کێم) خوێنی گەرراوەی خەستی سپی‌یەلە برینێ دێتەدەرێ .کەم[ز].

( کێماسیی ) ز . کەمایەسیی .

( کێماو ) کێمی روون .

( کێماهیی ) کەمیی .

( کێمایی ) کەمیی .

( کێمپەرر ) تەنینەوەی برینێ بە هۆی کێمەوە .

( کێمکردن ) پەیابوونی کێم لە برینێ .

( کێمیی ) کەمیی .

( کێندەر ) کوێندەر .

( کێندەرێ ) کوێندەرێ .
( کێو ) چیای بەرز .
(کێوسار) د . شوێنی شاخاویی .
( کێوسان ) کوێستان .
( کێومال )هەرەوەز کردن بەدووی شتێکی وون بوودا لەدەشت و کێو .
( کێووژ ) کەوییژ .
( کێووستان ) کوێتسان .
( کێوە ) بۆ کوێ .
( کێوی ئاگرپژێن ) کێوێکە بە هۆی جۆش و خورۆشی ناویەوە لەت ببیء و ئاگروشتی تواوەی لێ بێتەدەرەوە.
(کێوی ئاگرفشان) کێوی ئاگرپژێن.
( کێویی ) گیا یا گیاندارێکە کە هەر لەکەژو کێوا بێ . بریتی یە لە مەردومی سرکی سڵ کردوو لەشت.
( کێوییلە ) سەوزیێ و دارو درەختێکە کە لەدەشت و کێو روابێ و بەدەست نەچەقابێ .
( کێهانە ) کامیان .
( کێی ) ل . کێ .
(کێیتەڵە) گۆزەی بچووکی خررەڵە.
( کێیر ) کێری گیاندار . کێردو چەقۆ [ز] .
( کێیرنج ) با . هەلاج .
( کێیرە ) جۆرە دەنگێکە لـە یەك کەوتنی هێندێ شتەوە پەیائەبێ، [ کێیرە کێیر ] کێیرەی یەك لەدوای یەك .
( کێیژ ) کچ .
( کێیژۆڵە ) کچۆڵە .
( کێیس ) جۆرە بلۆقێکە لـەبن دان پەیا ئەبێ .
( کێیسك ) ز . کێیسە .
(کێیسکردن ) پەیا بوونی کێیس لـە ژێر دانـا . بریتی یە لە پێش خواردنەوەی یەکێك لە ررقانا .
( کێیسۆ ) ز . رەقە .
( کێیسە ) توورەکەیەکە شـتی تێ بکرێ .
( کێیسە برر ) د . گیرفان برر.
( کێیسەکێش ) ناترێکە لەژووری حەماما بەکێیسەیەکی تایبەتی مەردوم بشوا .
( کێیسەکێشان ) هێنانی کێیسە بەلەشا بۆ لێ کردنەوەی چڵك .
( کێیسەڵ ) دەعبایەکی دیمی یـە وەك رەقەی ناو ئاو .

( کییسه‌ڵه ) دارێکی قوقزه‌ئه‌درێ له‌پشتی ده‌رگاو شمشێره‌ی پیا ئه‌کرێ. دارێکه [ مـازه ] و [ لاجـامه ] به‌یه‌که‌وه ئه‌نووسێنێ .

( کییسه له‌مل ) بریتی‌یه له‌کچی جوانکییلانه .

( کییسه‌و که‌مه‌ر ) جۆره که‌مه‌ر به‌ندێکه ، چه‌ن کییسه‌یه‌کی پێوه‌یه شتی تێ ئه‌خرێ .

( کییسه‌هه‌ڵدرون ) بریتی‌یه لـه ته‌ماداریی یه‌کێك بۆ شتێك : فیسار که‌س [ کییسـه‌ی بۆ هه‌ڵدرووه ] واته به‌ته‌مایه‌تی .

( کییف ) چه‌رمێکی دوو توێی هه‌ڵدرواوه ، هێندێ شتی تێ ئه‌خرێ.

(کییفاندن) د . فییکه کردنی مار.

( کییفانن ) کییفاندن .

( کییفکردن ) هه‌ڵ کفانی شت .

( کییفن ) شتی هه‌ڵ کفاوی پفه‌ڵ.

( کییفۆك ) پیشۆك .

( کییفه ) د . فییکه‌ی مار .

(کیڤار) با ، کررێشی ئه‌ستووری سه‌ری که‌چه‌ڵ .

( کییڤیی ) با . گیانداری کێویی.

( کییلۆ ) سـه‌نگێکه که هه‌زار غه‌رامه .

( کییله ) ئه‌ندازه‌یه‌که بۆ دانه‌وێڵه که چوار ته‌نه‌که‌یه .

(کییله‌رك ) با . گه‌نجیینه‌ی ژوور.

( کییم ) کێم .

( کییمیا ) زانیاریی‌یه‌که باس له‌دروست کردنی هێندێ شت ئه‌کا بـه‌لێکدان و جوێ کردنه‌وه‌یـان . دروسکردنی ئاڵتوون‌وزیو به‌ده‌رمان.

(کییماگه‌ر) که‌سێکه‌که کییمیایی بکا.

( کییمیاگه‌ریی ) خه‌رییك بوون به‌کییمیاوه .

( کییمیایی ) کییمیاگه‌ریی : ئه‌م پیشه‌یه [ کییمیایی ] یه .

( کیین ) رق .

( کیینه ) کیین .

( کیینه‌دار ) خاوه‌نی کیینه .

( کیینه‌کێشان ) رق کێشان له‌دڵا له یه‌کێك .

( کیینه‌کێش )که‌سێکه که کیینه‌ی زۆر بێ له‌گه‌ڵ مه‌ردوما .

( کییوار ) گیـایـه‌کی بـه‌رزی کوێستانی به‌هاریی‌یه ، گه‌ڵای وه‌ك

بێی وایە ، ئەکوترێو ئەدرێ بە وولاخی بەرزە . جۆرە جەوی‌یەکە لەلا قەدی کیای کێوا پەیدا ئەبێت دوای برێندار کردنی ، وە دوای مەیینی وەك بنێشت ئەخورێ.

( کێیوون ) پییك .

# پیـــتی گـاف

## ( گ )

(ك) کشت :[ك] جارێ یا [ك] جۆرێ واتە هەموو جارێ یا هەموو جۆرێ . پیتێکە لە شوێنێ [و] ی إسمی مفعول ئەنووسێ بەدوای هێندێ ووتەوە : کەیێ [ك] ، رویێ [ ك ] واتە کەییو ، رۆییو .

[ کا ] رەشەوولاخێکی نێرە کە پێی نابێتە سێ ساڵە . پیتێکە بە هەر ناوێکەوە نرا ئەیکا بە إسمی مکان: رێ [کا] ، سەیران [ کا ] واتە جێی رێ رۆین و سەیران.

کات : هەر [کا] واتە هەرکات .

( گانەنگێو ) جۆرە مارێکە وەك زەردەمار بەلام ئەم شینەو بێوەزەندە

( کابررەساوزە ) کیایەکی ئاوی‌یە لە لەبان ئەچێ بەلام ئەم سێ کووزەو کەلای تەنکە .

( کاوررر ) بۆررە بۆرری کا کەلە لە سەر خوێنی رەشـە وولاخێکی سەر برراو. بریتی‌یە لەکریانی چەن کەسێك بە دەنگی بەرز بەهۆی مردنی خۆشەویستێکیانەوە .

( کابەرد ) بەردی زۆر گەورە .

( کاپەل ) جۆرە کۆترێکی شینی کێویە .

( کاپێ ) بریتی یە لە مەردومی تەمەل لە رۆینا .

( کاپێل ) کایەکە کە شاخەکانی

چەمابنەوە بە دەوری گوێ یا چاویا بە جۆرێك کە پێویست بێ بەبڕرینەوە .
( کانوو ) شاتوو .
( کاجفت ) د . کاجووت .
(کاجووت) کایەکە لەوانە بێ کە جووتی پێ بکرێ .
( کاچاڵ ) د . چاڵی زۆر گەورە .
( کاچاوە ) جۆرە کوڵێکە لەشتی چنراو دروست ئەکرێ لەوێنەی چاوەکا.
(کاچوان) کۆچانی زلی ئەستووری ناقۆڵا .
(کاچێرین) ز. کلك هەڵسەنکێنە.
( کادار ) ز . شوێنی لەوەڕری کاکەل .
( کادانە ) د . کزن .
(کادمە) کیایەکە وەك هەڵەکۆك، بەڵام ئەم سەڵکی نییە ، وە بۆ ژانە سك ئەخورێ .
( کادۆش ) دەفرێکی گڵینە وەك دیزە ، دوو قولفی هەیە ، پەتی تێ ئەخرێ و پێی هەڵ ئەگیرێ .
( کادۆشکە ) جامی شیر دۆشین.
(کادەمە) کیاکی کەڵاپانی پایزیی زۆر تاڵە ، ئەکوترێ و ئەکرێتە کۆماوەوە بۆ ماسیی کوشتن .
( کادێریی ) ز . کاوان .
( کار ) پیتێکە ئەنرێ بەهێندێ ناوەوە ئەیکا بەئیش کەر: ئامۆژ[کار] پارێز [ کار ] ، کرد [کار] . بە هێندێ ناوەوە ئەنووسێ ، ماوەیەك لەکات پیشان ئەدا : رۆژ [کار] شەو [ کار ] .
( کاران ) ز . کاکەل .
( کاراندن ) کارە کردنی مریشك.
( کارانن ) د . کاراندن .
( کاررام ) د . کاڵۆك .
( کار ان ) کاکەل . دارێکی درێژی ئەقیزەدارە ، جوتیار لەجووت کردنا کای پێ لێ ئەخورێ . ناوی دێیەکە لەناوەندی [سنەو]و [ مەریوان ]دا .
( کارس ) با . مەرزن .
( کارنگ ) ز . کووکرە .
( کارە ) دەنگی مریشك ، [کارەکار] کارەی یەك لەدوای یەك.
( کاریە ) دەفرێکی تایبەتی گەورەیە ، پڕر ئەکرێ لە ناو و ئەنرێ لە وولاخ .

( گاریتە ) با . گاریتە .
( گاز ) قەپ‌کرتن لەشت بەدان. ئاسنێکی دوو دەمی کەوانەدارە ، دانو بزماری پێ هەڵئەکێشرێ . توزنك پووشوو کە بۆ داگیرساندن بکرێتەوە . بانگەواز . باسکی ئادەمی‌زادو گیاندار[ز] نەوت. هەڵم.
( گازاندە ) گلەیی : گازاندەم لێمەکە .
( گازرکردن ) شتنی جاو و هەڵکوتانێتی بۆ سپیی بوونەوە .
( گازرکەر ) کەسێکە کە شت گازر بکات .
( گازك ) با . مەقاش .
( گازکردن ) بانگ کردن بە دەنگی بەرز .
( گازگاز ) ز . هاوارکردنی‌زۆر.
( گازگرتن ) قەپگرتن بەدان .
( گازن ) ئاسنێکی دەم تییژە ، زیین‌دروو چەرمی پێ‌زوییڵ زوییڵ ئەکات . گلەیی [ز] .
( گازندۆك ) ز . کەسێکە کە زۆر سەرکۆنەی مەردوم بکا .
( گازندە ) گلەیی .

( گازۆز ) ز . مۆریانەیەکە کە ئەداتە کاڵا .
( گازۆلك ) گروخلێنکە .
( گازووك ) قامیشێکی ئەستووری درێژە کەسەرێکی دادرابێ‌و دوو فاق کرابێ بۆ مارکرتن‌و کوشتنی.
( گازەرا ) ناوەراستی شت .
( گازەندە ) گازندە .
( گازی‌پشت ) موورەغەی‌پشت .
( گازیی ) ز . هاوار . بانگ.
( گازییز ) ز گازۆز .
( گازییکرن ) ز . هاوارکردن . بانگ‌کردن .
( گازیی‌کەر ) با . بانگ‌کەر.
( گاسك ) با . گازك .
( گاسکە ) دەنگی هێندێ گیاندارە لەکاتی کەساسیی‌دا ، [کاسکەکاسك] کاسکەی یەك لە دوای یەك .
( گاسن ) ئاسنێکی پانە وەك بێڵ ئەکرێ بەهەوجاررەوە و جووتی پێ ئەکرێ .
( گاسنۆق ) د . یەغدانی‌گەورە.
( گاشە ) کەشاکەش و دەردی سەریی . خررە بەرد .

( کاف )ناوە بۆ پیتێك لە بیست‌و حەوت پیتەی کوردیی .
( کاف ) ز کات . هەنگاو .
( کاڤان ) ز . کاوان .
( کاڤانی ) ز . کاوانی .
( کاڤدان ) ز . هەنگاوەنان .
( کاڤەك ) ز . کات .
( کاڤرر ) کاڤرران .
( کاڤرران ) دەردەکا .
( کاڤۆرر ) کابۆرر . کاتی ووشك بوونی ئاو لە دەمە دەمی پایزا
(کاکوتر) جۆرە کۆترێکی کێوییە.
( کاکوچك ) د . کابەرد .
( کاکێفیی ) د کاکێوییی .
( کاکێوییی ) دەعبایەکی کێوییە لە کا ئەچێ بەڵام ئەم زلترە .
( کاکا ) چار چار : [ کاکا ] ئەچمە دەرەوە . د م دەم: شاو[کاکا] ئەنووم و [ کاکا ] هەڵ ئەستم .
(کاکوزرر) د . کوزرێکی گەورەیە کە لە تەنیشتەوە لادرر بکرێ و ئەلحەدی بۆ هەڵ نەکەنرێ .
(کاکوز) شتێکە وەك پۆلکە بەڵام ئەم دەنکی گەورەترە .

( کاکۆلکێ ) رۆیشتنی منال لە سەرچوار چنگۆلە لەپێش پێ گرتنیا .
( کاکۆلە ) کاکۆلکێ .
( کاکێ ) گیایەکی کوێستانییە لە کوێی کا ئەچێ .
( کاک ل ) کۆمەڵی کاو ما بکاکە بلەوەرر ێنرێ .
( کاکەلە ) د . کاکەل .
( کاکێرە ) گایەکە کە بەنایبەتی کێرەی پێ بکرێ .
( کاڵ ) هەرزن .
( کاڵتە ) ووتن یا کردنی شتێك بۆ پێکەنین .
( کاڵتەچیی ) کەسێکە کە زۆر کاڵتە بکا لەگەڵ ئەمو ئەوا . کەسێکە کە کاڵتەی پێ بکرێ: بۆچ [کاڵتەچی] تۆیە ؟
( کاڵتە پێ کردن ) کاڵتە کردن بە شتێك .
( کاڵتەکردن ) ووتن یا کردنی شتێك بە تەشمەریی .
( کاڵتەلێ‌پژان ) وەرگرتن و زانینی هەموو کردار و گوفتارێك بە کاڵتە .

( کالتێن ) شتێکە کە بکرێ لە رووی کالتەوە .
( کالدان ) هاندانی کەسێك لە کەسێك بۆ زیان پێ کەیاندنی .
کالکالیی ) جۆرە کولێرەیەکی پچووکە لە هەویرو رۆن دروست ئەکرێ وە زەردێنەی هێلکە لە رووی ئەدرێ .
( کالۆش ) د . کالۆش .
( کالۆك ) کۆچان .
( کالە ) ل . خشتی کال .
(کالە بەنك) د . جۆرە لەوەرێکە کە خواردنی کێژیی ئەدا .
( کالە پێ کردن ) حەشر کردن بە شتێك .
( کالە دان ) داخستنی دەرکا .
( کالە کردن ) کردنی کارێك بە چابوکی و چالاکیی : فیسار کەس [ کالە ] ئەکا ، واتە کارەکەی چاك ئەکات .
( کالەکال ) دەنکە دەنك .
( کالەوکیفە ) هەراو هەررەشەو خۆتووررە کردن .
( کالیسکە ) عەرەبانەیەکە کە بە کا بڕوا
( کالینە ) نانی هەرزن .
( کامارۆ ) بالندەیەکی مەلەوانی رەشی کونج کونجی ناوچەوان سپی یە بە قەد [ قەلمراو ] ئەبێ .
( کامل ) ز . دوور خستنەوەی شت بە شان .
( کامەلاس ) مانگرتنی کاو خۆ بەزەویی دادانی . جۆرە یارییەکی دوودەستەیی یە .
( کامێش ) جۆرە رەشە وولاخێکی مەلەوانە ، لە کا کەورەترە .
( کامیێش ) کامێش [ل] .
(کان) دروست بوونی نێر لەکەل مێدا . کیان : ماساغەکە [ کان ] دەدا ، واتەکیان ئەدا .
( کاندەر ) کەسێکە کە کان بدا .
(کانکەر) کەسێکە کە کان بکا .
(کانەکۆل) بریتی یە لە بەزموهەرا : ئەم [ کانەکۆلە ] چی یە .
( کاو ) کات . پێینەی کاسەوتەشتی . هەنکاو .
( کاوارە ) د . بێشکەی منال .
( کاواسن ) کاسن .

( گاوان ) کەسێکە کە گاکەل بلەوەڕرێنێ .
( گاوانە ) ھ . گلێنە .
( گاوانیی ) مزێکە کە ئەدرێ بە گاوان. ریشۆڵە[د] . ناوی دێیەکە لە ناوچەی بازیان .
( گاوخان ) د . گاوەخان .
( گاو دانە ) د . بەری گیایەکی بەھارییە ئەدرێ بە رەشە وولاخ.
(گاودومە) د . گیایەکە وەك کلکی گاوایە بۆسووتاندن بەکارئەھێنرێ .
( گاوزاڵك ) ل . قالۆنچە .
( گاوشە ) د . گزرەی گەورە .
( گاوور ) کەسێکە لەسەر ئاینی عیسا پێغەمبەربێ . بێباوەڕ [ز]
( گاوەس ) گاوەس .
( گاووکەردوون ) قوربانیی : بە [ گاوو کەردوونت ] بم ، واتە بە قوربانت بم .
( گاووڵکێ ) د . گاکۆڵکێ .
( گاوەخان ) دووکێڕرە جووتیار لیی ئەدا لەم سەرولەو سەری زەویی یەوە بۆ ئەوەی کە لە کاتی جووتا لیی نەچێتە دەرەوە . گەوورێکە گاو مانگای تێ بکرێ .
( گاوەزبان ) گوزروان .
( گاوەزوان ) گاوەزبان .
( گاوەس ) مەشکەیەکە لە پێستی گا کرابێ .
(گاوەسپووك)ھ گیایەکی کوێستانییە گوڵێکی سوور ئەکرێ بنکێکی سپی ھەیە وەك پیێزۆك ئەخورێ .
( گاوەسن ) د . گاوەس .
( گاوەسەر ) د . تۆپز
( گاوەکیی ) د. ئێستره گایلکە.
( گاوەناز ) برینێکە لە قوورگی رەشە وولاخ خرر ئەبێ .
( گاویلکە ) باڵندەیەکی پچووکە ھەمیشە بە شوێن ھێلی جووتیارا ئەگەڕێ بۆ کرم خواردن .
( گاھ ) گات .
( گاھەس ) د . شایەد .
( گای بنە ) ئەو گا کێرەیەیە کە ئەکەوێتە لای خەرمانەوە . بریتییە لە یەکێك کە پەنجەی لەکارێکابێ: ھەمووی قەباحەتی گای بنەیە .
( گایلکە ) جۆرە ئێسترێکی باڵا پچووکە .

( گاینجه ) دارێکه وەك خەنجەر ئەکرێ بەگونی مژانا بۆنەوەی که له [ ویژانبەر ] دانەم لێ .

( گایەل ) گاگەل .

( گایین ) پەرریینی نێر له مێ .

( گپ ) گووپ . پییت [ل] .

( گت ) د . شتی قوت . ویستاز و ئیست کردن .

( گتایی ) د . قوتیی شت .

( گته ) د . شتێکی قوته که له دوورەوە دیاربێ .

( گجك ) دوگمەیێ که له زێی مانگادا وەك گولەنگ بۆوولاخی بەرزە

( گجیی ) ه . کراس .

( گچچه ) روتە یەکە رەشە وولاخی پێ لێ ئەخورر رێ .

( گچك ) پچووك .

( گچکۆکه ) پچکۆله .

( گچکوله ) گچکۆکه .

( گچکه ) پچووك .

( گچکەلە ) گچکه .

( گچکەیی ) پچووکیی

( گلاندن ) ز . کۆکردنەوەی خواردەمەنیی به سوال .

( گدووك ) ز . گردۆلکه .

( گده ) گدێ .

( گدێ ) د . بزن

( گدێ گدێ ) گدیی گدیی .

(گدیی) ووتەیەکه بزنی پێ بانگ ئەکرێ : [ گدیی گدیی ] لەکاتێکا که بتەوێ بزن بانگ بکەیت . ووتەیەکه بۆمدح و زەم بەکاردێنرێ بەم رەنگه بەپیاوی گێل ئەووترێ : [گدیی گدیی] وانه وەك بزن وایت ، یا به منالی خۆشەویست ئەووترێ [گدیی گدیی] لەخۆشەویستیدا [ز] .

( گدیی گدیی دان ) خوتووکەدان .

(گر) پییتێکه به هێندێ ناوەوه ئەنووسێ ئەیکا به صنعتی مشبهه : بەرگه [ گر ] ، فره [ گر ] . رق : فیسارکەس زۆر به [ گر ] ە وانه رق ئەستووره . هێز : فیسارکەس زۆر به [ گر ] ە وانه زۆر بەهێزه. فێڵ : [گر]یدا وانه هەڵیخەڵەتان . گەرر [ز] . تەپۆلکه [ با ] . شتی زلی زر [ز] .

( گرار ) با چێشتی توندە .

(گراز)ز. چێشتی ساوەریا برنج .

( گراکر ) ز . گەورەوسەرکۆمار

٠( گرامەفۆن ) سندووقی گۆرانی .

( گران ) شتی قورس . شتێکە لەکرڕینا بە پێی خۆی نرخی زۆر بێ ، [ گران بوون ] سەرکەوتنی نرخی شت ،

( گرانکردن ) زۆرکردنی نرخی شت . کونچکەی قورس و سەنگین . شتێکە کە تێ‌کەیشتنی سەخت بێ : وانەکەی ئیمرڕۆمان زۆر [گران بوو] . مەردومی قورس و قەمەر .

( گرانایی ) قورسایی .

( گرانبار ) بریتی یە لە کەسێك کە باری ژیانی قورس و گران بێ .

( گرانبایی ) گرانایی .

( گرانبەها ) شتی زۆر بە نرخ

( گرانجان ) کەسێکە شت بە گران بفرۆشێ .

( گرانمایە ) گران بەها .

( گرانە ) با . رووتانەوەی مووی پێشی ناوچەوان تا ناوەڕاستی سەر « أصلع » .

( گرانەتا ) تایەکی زۆر بە تینە تووشی هەرکەس بێ تا ئارەق نەکا یا باوێشك نەدا یانەپژمێ بەری نادا .

( گرانەتێ ) گرانەتا .

( گرانەوە ) گێڕرانەوە .

( گرانیی ) کاتێکە کە هەمووشت تیایا کەم و گران بێ . گرانایی .

(گراو) ئافرەتێکە کە حەزت لێ کردبێ « معشوقە » [ز] . کەسێکە کە گیرابێ .

( گراوە ) د. جزیرە .

(گراویی) دلداریی و خۆشەویستیی بە دل . دەزگیران . دلدار .

(گرپە) گرفەی ئاگر ، [گرپەگرپ] گرپەگرپی زۆر .

( گرتك ) پارچە ئیسقانێکە کە گۆشتی پێوەبێ . پریاسکە [د] .

( گرنکە ) جێگایەکە لە شاخ و دەشت کە بزن و مەڕرەکێویی تیا نوستبێ و سمکۆلی تێدا کردبێ ، وە لە بەر ئەوە لە بەهارا گیای لێ نەڕوابێ . گونکە هەوییر [د] .

( گرتن ) دەست بگییر کردنی شتێك و هێنانە ژێرچنگ : ئەو شتەم

نەکرێ. مەردومی ئازا [ز]حوشتری ڕەسەن [ ز ] حوشتری نێر .
( لۆکاندن ) کەوزاندن و دەست بازی کردن. بریتی‌یە لەکایین [ز]
( لۆککردن ) لۆکنان بەکاغەزو شتی ترا .
( لۆکە ) بەری پەموو .
( لۆلکە ) قەیماغی زەیستان .
( لۆلۆ ) ز. جۆرە گۆرانی‌یەکە .
(لۆلە)ووتەیەکەلەرووی‌خۆشەویستی یەوە بە منداڵ ئەووترێ .
( لۆلەپ ) لۆرە لەپ .
( لۆمە ) سەرزەنشت .
( لۆنک ) کەولپۆست ( ھ ) . پەشتەماڵ [ د ] .
( لۆنە ) لۆی شتی بارییکی ڕیسراو لەدەزوو یا بەن یا لەشتی‌تر: کشتەکی دوو [ لۆنە ] یا سێ [ لۆنە ] .
( لوو ) گۆشتپارەیەکی خڕی ڕەقە لەئەندامی ھێندێ گیاندار پەیا ئەبێ . ووتەیەکە بەکاردێنرێ لەجیاتی ووتەی [ ئەو ] بۆ نێرینەیەک کەنادیاربێ ، یا رووی گوفتو

گۆی تێ‌نەکرێ [ز]. گیای لۆ [د] .
( لووا ) بەرگن .
( لووان )گونجان و ھەڵسووڕران : بۆم [ نالوێ ] . ڕۆیشتن [ھ] .
( لووای ) ھ . ڕویشتن .
( لـووت ) ئەندامێکی بەرزە بە ناوەڕاستی دەموچاوی گیاندارەوە ، دووکونی تیایە بۆنی لێوە ئەکا .
(لووتاویژ) د . لووت ھەڵ کردن لەشتێک لەبەر حەز لێ‌نەکردنی.
(لووت‌بەبەرخۆدا ھاتنەوە) بریتی‌یە لەعارنان و پەشیمان بوونەوە لە شتێک .
( لووت بە خۆدا ھاتنەوە ) لووت شکان .
( لووتپژان ) خوێنی لووت بەر بوون .
(لووتچووزانەوە) بریتی‌یـە لە زۆر پێ‌ناخۆشبوونی قسەیەک .
(لووتخواریی) بریتی‌یە لـەدڵگیریی ونارەزایی لەشتێک : فلان کەس لووتی لێم خوارە .
(لووتداژەندن) بریتی‌یـە لەماتی و زویریی .

(لووتسۆڵانەوە) د. لووت چووزانەوە.
( لووتشکان ) بریتی یە لەدەماخ شکانی یەکێك .
( لووتشکاندن ) بریتی یە لەدەماخ دانی یەکێك .
(لووت لێخوران) بریتی یە لەئارەزوو کردنی شتێك .
(لووت لێخوریان) لووت لێخوران.
( لووتو بزووت ) ووتەیـەکە لە هێندێ شوێنا بەکار دێنـرێ لە جیاتی ووتەی [ کوتوپرر ] : دوێنێ [ لووت و بزووت ] تووشی فیسار کەس بووم .
( لووتو پووت ) بریتی یە لەبرتوبۆڵ.
( لووتوو ) جۆرە ماسی یەکی زلی لووت درێژە .
( لووتە ) مەردومی لووت کورتی پچکۆلە . لوتکە [د] .
( لووتهاتنە خوارەوە ) د . لووت شکان .
( لووتەلا ) مەردومێکە کەلووتی لێت خواربێ .
( لووتەلایی ) بوونی یەکێـك بە لووتەلا .
(لووتەوانە)ئەڵقە، یاسنگێکی زێرر، یا زیوە ، ژنان ئەیکەنە لووتیان.
زبانەیەکی دارینە لە سەر باری درێـژیی ئەدرێ لە دوودەریی و پەنجەرە بۆنەوەی نەکرێتەوە .
(لووتهەڵکردن) بریتی یە لەزوییریی ودڵگیریی لەیەکێك .
( لوورانەدن ) تێهەڵکردنی سەگ و گورگ بەلوورە .
( لوورانن ) د . لوورانەدن .
( لوورر ) با . ژاڵە .
( لووررك ) با . لوورر .
(لوورە) جۆرە دەنگێکی درێژە لە سەگ و گورگەوە دێ ، [ لوورە لوور ] لوورەی یەك لەدوایەك .
( لوورە کردن ) لوورانەن .
(لووزەو ) رێژەوی زۆر « تیار » . بەتوندیی هەڵ رژان .
( لووس ) شتێکە کەزبر نەبێ . تاقکە . بریتی یە لەکوررێك کە مووی لێ نەهاتبێ .
( لووساووك ) پلوسك .
(لووسایی) شوێنی لوس لەشتێك .
(لووسکاریی) پەرداخکردنی شت .

(لووسکردن) نه‌هێشتنی زبریی شت.
(لووس و پووس) شتی زۆر لووس .
( لووسیی ) لووسایی .
( لووشاندن ) لووشه کردن .
( لووشه ) ده‌نگێکه له‌ده‌مه‌وه‌دێ له کاتی هه‌ڵقوراندنی شتی شلا ، [ لووشه لووش ] لووشه‌ی یه‌ك له دوای یه‌ك . گیایه‌کي به‌هاریی که‌ڵا پانه ، ئه‌کرێته دۆکوڵییوه‌وه . جۆره ده‌ردێکه تووشی ووڵاخی به‌رزه ئه‌بێ .
(لووشه کردن) په‌یاکردنی لووشه له‌ده‌مه‌وه .
( لووشیین ) د . لووشه کردن .
( لووق ) با . قونه‌ی باڵدار .
( لووکیی ) مه‌ردومی سه‌رسه‌ریی.
(لوول ) شتێکه له‌خۆیا کرژبێ و پێچی خواردبێ . مه‌ست [د] .
( لوولاق ) ئێسقانی خوار ئه‌ژنۆ تا قوله‌پێ .
( لوولبوون ) کرژبوون و پێچ خواردنی شت . بریتی یه له قه‌ڵه‌و بوون .
( لوولدان ) لولکردنی شت . بریتی‌به له‌خواردنی شتێك به‌هه‌ڵپه‌و ده‌ست‌و برد .
( لوولك ) جۆره لووله‌یه‌که له قامیش ، یا شتێکی‌تر ، چه‌ن کونێکی تیایه ، فووی پیا ئه‌کرێ وده‌نگێکی خۆشی لێ په‌یا ئه‌بێ . لوولوو .
( لوولکردن ) پێچانه‌وه‌ی شت .
( لوولك ژه‌ن ) که‌سێکه که‌لوولك باش لێ‌بدا .
( لوولکه ) لوولوو .
( لوولـك ) لوولك .
( لوولوو ) به‌ تره‌یه‌که که ریسی له‌سه هه‌ڵکرابێ بۆخستنه ناومه‌کۆی جۆلاییه‌وه .
( لووله ) جۆره شتێکی بۆشی بارییکی کوناوده‌ره‌ی راسته .
( لووله‌به‌ند ) لووله‌و زنجییر .
( لووله‌دار ) بزن‌و مه‌ڕێکه که گووانی ئه‌ستوورو درێژبێ .
( اووله ژه‌ن ) لوولك ژه‌ن .
( لووله‌ساز ) ئاسنکه‌رێکه که‌لوو له‌ی تفه‌نگ دارڕێژێ .
( لووله‌ك ) لووله‌یه‌کی بۆشه ، هه‌ردووسه‌ری کراوه‌یه ، به‌ڵام ئه‌م که‌وره‌یه وه‌ك بۆرریه‌ی سۆپا«اسطوانه»

( لووله کردن ) لوولکردن .

( لووله‌کی ) شـتێکه وه‌ك لوو له‌ك وابێ .

( لووله‌و زنجیر ) جۆره‌خشڵێکی زێرینه چه‌ن لووله‌یه‌کی تیایه ژنان راستو چه‌پ ئه‌یکه‌نه ملیان .

( لووله‌ینه ) د . لووله‌ینه .

( لوولێ ) هـ . لوولك .

( لوولیان ) د . پێچران‌ولوولبوونی شت .

( لوولێنه ) کۆزه‌ڵه‌ی ده‌سك و لووله دار .

( لونچ ) له‌وێچ .

( لونخه‌رروو ) ل . رییخۆله .

( لونشك ) با . کولێره . لووشه.

( لۆیه ) ووته‌یه‌که به‌کار دێنرێ له‌جێی ووته‌ی [ بۆیه ] .

( له ) پیتێکه بۆگه‌لێ مه‌به‌ست هاتووه ، [١] بۆده‌ستکردن به‌شتێك که‌خاوه‌نی برانه‌وه‌بێ له‌شوێنێکه‌وه بۆشوێنێك یا له‌کاتێکه‌وه بۆ کاتێك : [ له ] سه‌ره‌تای کتێبه‌که‌وه تادواییم خوێنده‌وه ، یا [ له ] به‌یانی‌یه‌وه تا نیوه‌رۆ رۆیشتم . [٢] به‌معنی [ هێند ] هـاتووه : [ له ] هه‌موو مییوه‌یه‌ك بخۆ واته له‌هه‌ر جـۆره هێندێك . [٣] بۆباسکردنی‌ئه‌سڵی شتێکه : ئه‌م گواره‌یه [ له ] زێرر وه‌ئه‌م بازنه [ له ] زیوه ، واته له زێررو زیو دروستکراوون . [٤] ئه‌چێته سه‌ر هۆی شت : [ له ]به‌ر تۆ هاتم ، واته بوونی تۆ مایه‌ی‌هاتنی من بوو . [٥] ئه‌چێته سه‌ر باو به سـه‌را دراو « مفضل علیه » : نووسیینی من له‌هی‌تۆ جوانتره : [٦] له‌سه‌ره‌تای ووتاره‌وه به‌گه‌لێ مه‌عنای تر دێ وه‌ك بڵێیت : [ له ] کوێ بوویت ؟ یا [ له ] چێ ئه‌گه‌ررێت؟ یا [ له] به‌رت مرم ، یا [له]چاوی منت که‌وێ . [٧] زیاد ئه‌بێ له ووتارا به‌م‌ره‌نگه له‌فررێ‌دانیازیانێك په‌یا نابێ مه‌گه‌ر له‌هۆنراوه‌دا نه‌بێ که‌وه‌زنه‌که‌ی تێك بچێ : [ له ] بۆ خه‌ڵقی خه‌ڵات به‌خشانی ماچه ،واته بۆخه‌ڵقی .

( له‌ئاودان ) بریتی‌یه له‌فیررۆدانی شت .

( لهـازه ) با . نوێڵ .

( لەب ) لێو .

( لەبا ) بەبا : ئەو دەڵەسەکە [ لەبا ] یە ، واتە بەبایە .

( لەباتیی ) لەجیاتی .

( لەبادە ) د . لبادە .

( لەبار ) شتێکە کەبۆکارێك باش بکونجێ : نەرییمان بـۆ خوێندن [ لەبار ] ە .

( لەبارابوون ) تەوانایی یەکێك بۆ کارێك : سالار [ لەبارپایەتی ] بخوێنێ .

( لەبار بوونەوە ) د . بریتی‌یە لە منالبوونی ئافرەت .

( لەبارچوون ) منالّ فرێ دان بە نەبەکامیی .

( لەبارچوونەوە ) د . لەسـك وەستانەوەی ئافرەت .

( لەبارە ) لەبابەت : دوێنێ لە بارەێ فلان کەسەوە دوایت ، واتە لەبابەت ئەوەوە .

(لەبان) کیایەکی کەلاّپانی ئاویی درێژە حەسیری لێ‌دروست‌ئەکرێ.

( لەبرر ) لەکۆترە : [ لەبرر ] ئەم کارەم بۆ بکە .

(لەبرر بوونەوە) بریتی‌یە لە لەرر بوون‌ولاوازبوون بەهۆی‌نەخوشی‌یەوە.

( لەبرریژ ) شتێکە کەپرربێ و بەلێواریا بێتە خوارەوە .

(لەبرەچوون) زۆر برژانی هێلکە. زۆر سوورەوە بوونی [ کلّ ]بەجۆرێك کەزۆر لەئەندازەی خۆی‌تێپەرریی‌بێ

( لەبرێتی ) لەبرییتی .

( لەبریی ) لەجیاتی .

( لەبرییتی ) لەباتی .

( لەبزەرریینە) د . چێشتێکە لە ساوەرو نیسك دروست ئەکرێ .

( لەبزیینە ) جۆرە خواردەمەنی یەکی شیرینە ، لەشـەکرو ئاردو کوێز ، یابادام دروست ئەکرێ .

( لەبلەب ) جۆرە کۆترێکە .

(لەبلەبی) نۆکی سوێرکراوی‌برژاو.

( لەبۆ ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ لەجیاتی ووتەی [ بۆچی ] . بۆ .

(لەبە) کۆشتی چەوری بەزاویی .

( لەبەر ) ووتەیەکە هۆی شتی پێ‌باس ئەکرێ: [ لەبەر] تێهاتم . ووتەیەکە پرسیاری هۆی شتی پێ ئەکرێ: [ لەبەر ] چی هاتیت ؟ .

( لەبەرچاو ) شتێکی دیاری ئاشکرا یە کەبەرچاوی هەمووکەس بکەوێ .
( لەبەرچاوکەوتن ) بێزرانی شت لەمەردوم .
( لەبەرچوون ) سووکیی کارێك لە سەرشان وتەواوبوونی بەئاسانی : کاری تۆم زوو [ لەبەرئەچێ ] یائەم فرما نەم هەر [ لەبەر ناچێ ] .
( لەبەرچوونەوە )د . لەبارچوونەوە .
( لەبەرچی ) بۆچی .
( لەبەرد دان ) بریتی‌یە لەبەفیڕۆ دان و لەناوبردنی دارایی : فیسار کەس هەرچی بوو [ لەبەردی دا] .
( لەبەر رۆیشتن ) لەبەرچوون .
( لەبەر رۆین ) لەبەر رۆیشتن .
( لەبەرکردن ) پۆشینی کالآ . خستنە یادو جێ‌گیر کردنێ شتی نووسراو ، یا بیستراو لەمێشك‌ودلآ: دەرسەکەم [ لەبەرکرد ] .
( لەبی ) لەبێ .
( لەبێ ) با . بەلێ .
( لەبیتاندن ) ز . جوولآندن .
( لەبیتین ) ز . جوولآن .
( لەبیبخە ) با . لەپەیەکە لەئارد، یا لەبرروێش ، کەبخرێتە سەرپارچە قوماشێك ، بۆئەوەی کەلەسەر ئێش وئازارێك دابنرێ .
( لەبیر بوون ) مانی شتێك لە بیرت .
( لەبیر چوون ) دەرچوونی شت لەیـاد .
( لەبیرچوونەوە ) لەبیرچوون .
( لەپ ) بەری دەست . لێوی ئەستوور [د] . [ لەپە لەپ ] پەلە کوتێ .
( لەپارە ) پارچەیەکی پانی ئەستوورە لەهەموشتێك کەبەقەد لەپەدەستێك بێ . کوژمەی کوێزو توو [ ھ ] .
( لەپاش ) ووتەیەکە بەکاردێنرێ لەکاتی تەواوبوونی ووتارێك ودەست کردن بەووتارێکی‌تر .
( لەپاشا ) لەپاش .
( لەپاشان ) لەپاش .
( لەپاشانا ) لەپاشان .
( لەپاکەوتن ) د . لەپێ کەوتن .
( لەپان ) د . پاژنەی پێ .
( لەپرر ) ناکاو .
( لەپررا ) لەپرر .

( لەپکە ) جۆرە کووژەکەیەکی شینە بەناوچەوانی منالاّ هەل ئەواسرێ بۆچاوەزار ، گوێچکە ماسی .

( لەپمال ) سواغدان بـە لەپی دەست .

( لەپۆرت ) هـ . پەپکە هەنجیر .

( لەپولەوس ) دەم وقەپۆز .

( لەپە ) چێشتی ئەزۆرشلی ئەزۆر توند . لەنکە نۆك . سواغ [ د ] . لەبرزێژ « د » .

( لەپەتیر ) ز . کەشکەك .

( لەپەکوتێ ) دەست کوتان لەبەر ئەبینین .

( لەپەوررەو ) بەسەردەما پالکەو تن

( لەپێست چوونەدەرەوە ) بریتی یە لەتووررە بوون و دلتەنگ بوون لە شتێك : لەداخی ئەریمان کە نا ـ خوێنێ وەختە لەپێست بچمە دەرەوە .

( لەپێست دەرچوون ) لە پێست چوونە دەرەوە .

( لەپێش ) ووتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ بوونی شتێك لەپێش شتێکی ترا : ئەو لەپێش ئەما هات .

( لەپێـك ) ز دەستکێشێـکە ئەکرێتە دەست .

( لەپێکردن ) پێ کردن بەپێلاّوو گۆرەویی و دەرپێ دا

( لەپێکەوتن ) نەمانی هێزی رۆیین.

( لەت ) کەرتی شت [ لەت لەت شتی لەت و پەت .

( لەتان ) بێدەنگبوون ئەجوولاّن.

( لەتاو ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ لەجیاتی ووتەی [ لەبەر ] وە هەمیشە پێویستە هۆکەی لەدوایەوەبێ : [ لە تاو ] ئازار خەوم لێ ناکەوێ .

( لەتاوا ) لەتاو ، بەلاّم ئەم هۆکەی پێشی ئەکەوێ . ئێمشەو سەرم زۆر ئەیەشا [ لەتاوا ] خەوم لێ نەکەوت .

( لەتاوان ) لەتاوا .

( لەتاوانا ) لەتاوا .

( لەتبوون ) دووکەرت بوونی شت .

( لەتر ) رەت : بە [ لەتر ] رۆی .

( لەتر بردن ) رەت بردن .

( لەتردان ) رەتدان .

( لەتك ) د . لەتی بچووکی شت .

( لەتکردن ) دووکەرت کردنی

شت .

(لەتکە) لەتی هەرمێ ، یا تەمـاتەی ووشك کراو .

( لەتکە نۆك ) نـۆکێ دوو لەت کراوی پووش لێ گیراو .

( لەتکەوە چوون ) بەمنالێکی یەك سالانە ، یا دووسالانە ئەووترێ کە بگری بەکول بە جۆرێك کە چەند هەناسەیەك دەنگی دەرنەچێ لەبەر چەختیی گریانەکەی .

( لەتوپەت ) شتی لەت لەتی وونجرر وونجرر ، [ لەتوپەت بوون ] لەت بوونی شت بەزۆریی ، [لەتوپەتکردن] لەت کردنی شت بەزۆریی .

( لەتوکوت ) لەتوپەت .

( لەتە ) د . لەت .

( لەتەچن ) د . سوالکەرێکە کە لەتە نان بچنێتەوە .

( لەتەچنیی ) د . سوالکردن بۆ کۆکردنەوەی لەتە نان .

( لەتەر ) لەتەرە . بەلەك .

( لەتەرە ) هـ . تەشیی .

( لەتەرە بزق ) د بریتیی یە لە هەردومی سك زل .

( لەتەك ) د . لەگەل .

( لەجووت چوون ) باش ئیش نەکردنی ئاشـە بە هۆی نارریکی تەوەرەوە : ئەم ئاشە لەجووت چووە .

( لەجەر ) گیـانداری لاواز . رژدی چرووك .

( لەجیانی ) لەباتی .

( لەجێ چوون ) ترازانی جومگەی ئەندام .

( لەجێگەچوون ) د . لەجێ چوون .

( لەچاو ) ووتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ بەرامبەریی کـردنی دووشت بە یەك لەشتێکا : ئەمە [ لەچاو ] ئەوا باشە یا خراپە .

( لەچاوچوون ) بەچاوەوەبوون : زۆر خۆت هـەل مەکێشە [ لەچاو ئەچییت ]

( لەچاوگیران ) ووتەیەکە چاکەی یەکێکی پێ ئەدرێتەوە بەچاوی یەکێکا کە سوپاسی ئەوچاکەیە نەکا .

( لەچك ) پارچەیەکی چوارگۆشە یە لەسەرو مل ئەئالـێنرێ وکرێ ئەدرێ . دەسمالی کولی ژنان .

( لەچك بەسەر ) لەچك بەسەرە .

(لەچك بەسەرە) بریتی یە لەئافرەت

( لەچك كردن ) ئالاندنی لەچك لەسەروملەوە .

( لەچەر ) رژدی چرووك .

( لەچەریی ) رژدیی و چرووكی .

( لەچەك ) لەچك .

( لەچی ) لەبەرچی .

.( لەحییم ) شتێکە لە قەلایی و ئەوشاتر دروست ئەكرێ ، ئەنەكەو مس و هێندێ شـتی تری بە ئاگر پێ لێك ئەدرێ ، [ لەحییم كردن ] پێكەوەلكاندنی دووشت بە لەحییم .

(لەحییمكاریی) كاری لەحییم كردن

[ لەخرتكە چوون ] لەجێ چوونی جومگەی ئەندام .

( لەخریین ) با . كەسێكە كە بەیانیی هیچی نەخواردبێ .

( لەخشان ) لەخشیین .

( لەخشتە بردن ) بریتی یە لە هەل خەلەتاندن و لەرێ دەر كردنی یەكێك .

( لەخشتە چوون ) هەلخەلەتاندن .

( لەخشە ) جوولەی شت لەجێی خۆی .

( لەخشیان ) د . لەخشان .

( لەخشیین ) تێكچوون و جوولانی شت لەجێی خۆی .

( لەخۆبووردن ) دەست هەلگرتن لە ژیانی خۆت لەسەر شتێك .

( لەخۆ ررابینیین ) دەسەلات و بەخۆدا راپەرموون لە كارێكا .

( لە خۆرراديیتن ) لە خۆ ، ررابینیین .

( لەخۆبوونەوە ) عوزر هێنانەوە بۆ یەكێك لەگەل تەریقی دا .

( لەخۆچوون ) بێهۆش كەوتن .

(لەخۆخەفتن) كەسێكە كە ئاگاداریی پاك و تەمیزی خۆی بكات .

( لەخۆدەرچوون ) د . بریتی یە لە فیز پەیاكردن .

(لەخورێن) لە خریین : لەخورێنی چامە خۆرەوە .

(لەخۆكردن) دلگیر كردنی یەكێك لە خۆت .

( لەخۆكوژران ) بریتی یە لەفیز پەیاكردنی یەكێك .

( لەخۆوە ) بەشتێك ئەووترێ كە كەس دەستی تیا نەبێ : لەخۆمەوە

چووم ، یا لەخۆیەوە هات .
( لەخەم رەخسین ) بریتی‌یە لە کزربوون و پێ‌کەیشتنی شتێک .
( لەداردان ) هەڵواسینی مەردوم بە دارا .
( لەداودەرهاتن ) د . رزگاربوون لە تەنگانەیەک .
( لە دوودان ) لغاو شل‌کردن بۆ یەکێک .
( لە دەستچوون ) بریتی‌یە لە نەمان و لەناوچوونی شتێک .
(لەدەستدان) بریتی‌یە لە لەناوبردنی شتێک .
( لە دەستدەرچوون ) دەرچوونی شتێک لە ژێر دەست کە بۆی پەشیمان ببیت .
( لە دەست‌کەفتن ) د . لەدەست کەوتن .
( لەدەستکەوتن ) بریتی‌یە لە دەوڵەمەندبوون .
( لەدەست هاتن ) دەسەڵات و تەوانائ ، یەکێک بەسەر کاریکا : فیسار ئەس لەدەستی دێ یارمەتیت بدات .

( لە دەفیی ) د . هەرزەیی .
(لە دەمدەرپەرریین) دەرپەرریینی ووتە لە دەم بە رەنگێک کە لێی پەشیمان ببیت .
( لە دەمدەرچوون ) لە دەمدەر پەرریین .
( لە دەماخدان ) شکاندنی لووتی یەکێک و لەکەیفدانی .
( لە دەماغدان ) لە دەماخدان .
( لە دەمەوەدان ) دووچارکردنی یەکێک بە تێ‌چاندن بۆی لای یەکێکی تر .
( لەدەورگەرران ) خۆگێرران بە دەوری یەکێکا بۆ ئەوەی بەڵاکەی ئەو لەوکەسە کەوێ .
( لەراندن ) جووڵاندنی شت .
( لەراندنەوە ) جووڵاندنەوە .
( لەرانن ) د . لەراندن .
( لەراننەوە ) د . لەراندنەوە .
( لەرانەوە ) لەریینەوە .
( لەرر ) گیانداری لاواز . ناوی تیرەیەکی گەورەیە لە کورد [ز].
( لەررك ) لاکی لەرری لاواز.
( لەررووو ) شتێکە بە رووەوەبێ‌و

دیاربێ .
( لەرووداداماان ) رووگیربوونی یەکێك بەرامبەر بە یەکێك .
( لە روودان ) دانەوەی شتێکی ناشیرین بە رووی یەکێکا .
( لەرەبا ) جۆرە بادارییەکە دووچاری گیاندارئەبێ ، وە تا دێ لەرری ئەکا .
( لەررێ دەربردن ) بریتییە لە هەڵخەڵەتاندن و هەڵفرییودانی یەکێك .
( لەررێ دەرچوون ) بریتییە لە لادانی یەکێك لە رەووشت و خووی جوان .
( لەررێ لادان ) لەررێ دەرچوون
(لەرریی) لەجەرییو گەم گۆشتیی .
( لەرز ) نەخۆشییەکە دووچاری هێندێ کەس ئەبێ هەموو لەشی دێتە لەرزە لە سەرمانا .
( لەرزان ) شتێکە کە بلەرزێ : لەرزانە ئەوریشە .
( لەرزانە ) پۆیلەی سەری ژن .
جۆرە گۆرانییەکی کوردییە [د] .
( لەرزانەوە ) لەرزینەوە .
( لەرزبررین ) نوشتە نووسین بۆ یەکێك ، کە تووشی لەرز بووبێ .
( لەرز بۆ بررین ) بریتییە لە تۆقاندنی یەکێك .
( لەرزك ) با . لەرزۆك .
( لەرزگرتن ) لەرزهاتن لە یەکێك
( لەرزوتا ) جۆرە نەخۆشییەکە لە پێشەوە بە لەرزو لە پاشا بە تا ئەیگرێ .
(لەرزوتادار) کەسێکە دووچاری لەرزوتا بووبێ .
( لەرزۆك ) گیاندارێکە کە ئەندامی بلەرزێ .
( لەرزە ) لەرینەوەی ئەندام یا شتی تر ، [ لەرزە لەرز ] لەرزەی یەك لە سەر یەك .
( لەرزهاتن ) لەرزگرتن .
( لەرزەك ) بوومەلەرزە . زەویی سستەك .
( لەرزین ) جوولانەوەی ئەندامی گیاندار ، یەك لەسەر یەك لەسەرما یا لە ترسا .
( لەرزینەوە ) لەرینەوە .
( لەرۆك ) شتێکە لەوانەبێ کە بلەرێتەوە .

( لەرە ) جوولەولەرینەوەی شت ،
[لەرە لەر] لەرەی یەك لە دوای یەك .
( لەرینەوە ) لەرە لەری شت .
( لەز ) یا . پەلەو خێـرایی :
نەریمان بە [ لەز ] ە . واتە بـە
دەستو بردە
( لەزاندن ) ز . پەلەکردن .
( لەزك ) نزیك : لەزك بوو بێم
بۆ لات .
( لەزکرن ) ز . لەزاندن .
( لەزك وەستانەوە ) سك نەکردنی
ئافرەت لەبەر پیریی .
( لەزك وێستانەوە ) لەزك وەستا
نەوە .
( لە زکەوچـوون ) د . لەسـك
وەستانەوە .
( لەزکوەستانەوە ) لەزك وەستانەوە .
( لەزکوێستانەوە ) لەزك وێستانەوە.
( لەزکیین ) کەسێکە کە زۆر بە
پەلەبێ .
( لەزیین ) ز . لەزاندن .
( لەسەر ) ووتەیەکە بۆبلندیی بە
کار دێنرێ : باکردینەکە [ لەسەر]
بسانە .

( لەسەرچوون ) د . لەبیرچوون
( لەسەرخۆ ) گیانداری هێدیی و
شێنەیی ، [ لەسەرخۆبوون ] بوونی
گیاندار بەهێدیی وشینەیی .
( لەسەرخۆچوون ) بێهوشکەوتنی
گیاندار .
( لەسەرخۆیی ) هێدییتی وشینەیی.
( لەسەردەستان ) ژنێکە کە زانی
پیا بێ و منالی بێ .
( لەسەر ررۆیشتن ) بریتیێیە لە
درێژە دان بەقسەیەك .
( لەسەر ررۆین ) لەسەررۆیشتن.
( لەسەر قەراخ ) بـەرداشێـکە
کەلەبەر زۆر ئیش کردن ناوەراستە
کەی چال بووبێ ، وەزەبر هەر لە
سەر قەراغی بێ : ئەم ئاشە لەسەر
قەراغە
( لەسەرکردن ) کردنی یەکێك
بەهـاوبەش ، یا هاوبیری خۆت لە
شتێکا .
( لەسەرکردنەوە ) یارمەتی دانی
یەکێکی زەبوون کەزۆرێکی بۆهاتبێ.
( لەسـەرگرێ ) بەرداشێکە کە
ناوەراستەکەی قۆقز بێ : ئەم ئاشە

لەسەر گرێیە .
( لە سەرەوکـردن ) د . لەسەر کردنەوە .
( لەش ) جەستەو ئەندامی گیاندار. بریتی‌یە لەپاش‌و پێشی مەردوم .
( لەشبەبار ) بریتی‌یە لەکەسێك کەهەر نەخۆش‌و دەردەداربێ .
( لەشبەدۆشاو ) بریتی‌یە لەیەکێك کەبەبایەك نەخۆش بکەوێ .
( لەشپیس ) کەسێکە بە هۆی چوونە لای خێزانی یا بەهۆی شەیتانی بوونیەوە مەلەی کەوتبێتە سەر .
( لەشپیسی ) بوونی مەردوم بە جۆرێك کە مەلەی لەسەربێ .
( لەشی سووك ) کەسێکە زۆر بە سووکی هەڵسووڕێ .
(لەش‌قورس) بریتی‌یە لەمەردومی تەمەل .بریتی‌یە لەمەردومی لەش‌پیس
(لەشقورسیی) تەمەلیی.لەش‌پیسیی.
( لەشکر ) کۆمەڵی سەرباز .
( لەشکر ئارا ) گەورەی لەشکر.
( لەشکردار ) لەشکرەوان .
( لەشکر شکێن ) مەردومی ئازای جەنگاوەر .

(لەشکرکاریی) لەشکر کۆ کردنەوەو هێنانو بردنی .
( لەشکرگا ) شوێنی لەشکر .
( لەشکرەوان ) د . سەرلەشکر .
( لەشکرێن ) سەرباز .
( لەشکەر ) با . لەشکر .
( لەشکران ) لەشقورس .
( لەشکرانیی ) لەشقورسیی .
( لەشۆر دەرکردن ) بریتی‌یە لە دەرکردنی شت لە ئەندازەی خۆی
( لەشولار ) جەستەو ئەندامی جوانی ئادەمیی .
( لەشیر برڕینەوە ) برڕینەوەی منالی شیرە خۆرە لەمەمك .
(لەعل) جۆرە بەردێکی ئاڵی بەنرخە
( لەعلە ) د . لالە .
( لەعوزر چوونەوە ) لە خوێن وەستانەوەی ژن لەبەر پیریی .
(لەعوزروەستانەوە)لەعوزرچوونەوە.
( لەغاو ) لغاو .
( لەغاوە ) لغاوە .
( لەغاوە بڕ ‌کێ ) لغاوە بڕرکێ.
( لەغاوە بڕرێ ) لغاوە بڕرێ .
( لەغاو هەڵبرڕین ) لغاوهەڵبرڕین .

(لەغاوهەلکێشان) لغاوهەلکێشان.

( لەغەر ) ز . کیاانداری لەرر . کوشتی اەرر .

(لەغەم) قومووشی‌قوولی سەرکێراو

(لەغلێدان) هەلکەندنی قومووش

( لەڤان ) ز . بێدەنـگ بوون و دامرکان .

( لەڤەن ) با . قامییش .

( لەق ) شتێکە کە لەجێی خۆی بجوولێ . لق [د] . کاز [با] .

( لەقاندن ) جوولاندنی شـت لە جێی خۆی .

( لەقانن ) لەقاندن .

( لەقاو ) شتی لەقییو . لغاو .

( لەقبوون ) شل بوون و جوولانی شت لەجێی خۆی .

(لەقکردن) شل کردن و جوولاندنی شت لە جێی خۆی .

( لەقلەق ) بالندەیەکی لۆق و دەنووك و مل درێژی رەش و سپییە. چیشتێکە لەکەنم و کونجیی دروست ئەکرێ [د] .

( لەقلەقیی ) جۆرە ترێ یەکی بۆل زلی خرری پێست ئەستووری بۆرە

( لەقمال ) شل بوونی دەستەدووی هەوجارره بەجۆرێك کە کاسن باش نەچێ بە زەوییدا .

( لەقم کردن ) با . پاچە کـۆلە کردنی بنـکی کالەك و شووتییو ئەماتەوهێندێ شتی‌تر ، وەپالختنی لقەکانی و خۆل کردن بە سەریا بۆ ئەرزهاویشتن .

( لەقولۆق ) چەن شتێکن کە لە جێی خۆیان ترازابن ولەق بووبن : دانەکانم [ لەقولۆق ] بوون .

( لەقو لەوار ) لەق و لۆق .

( لەقە ) لێدان لەشت بەلاقێك . جوولە ، [ لەقەلەق ] جوولەجوول .

( لەقەشێـل ) شتێکە بە لەقە شێلرابێ .

( لەقە فرتێ ) لەقە داوەشاندنەوەی زۆر لەپالەوە .

( لەقە فررە ) لەقە فرتێ .

( لەقە فررێ ) لەقە فرتێ .

( لەقەم کرتن ) رەخنەگرتن .

( لەقە وەشێن ) وولاخی چەمووش.

( لەقین ) بزووتنی شت لەجێی خۆی .

( لەك ) ناوە بۆ سەد هەزار . ناوە بۆ تیرەیەك لەکورد .

( لەکارتە ) د . بێکارەی لەکار کەوتە .

( لەکارخستن ) یەك خستنی شت لەکار .

( لەکۆلبوونەوە ) لەکۆل کەوتن .

( لەکۆلخستن ) بریتییە لەرزکار کردنی یەکێك لەشتێکی ناخوش .

( لەکۆلکردن ) بەکۆل هەلگرتنی یەکێك .

( لەکۆلکردنەوە ) لەکۆلخستن .

( لەکۆلکەوتن ) بریتییە لەرزکار بوونی یەکێك لەشتێك .

( لەکۆلگرتن ) لەکۆلکردن . بەستنە کۆلی کۆلوانە .

( لەکوێ ) ووتەیەکە پرسیاری پێئەکرێ بۆدیاریی کردنی شوێن .

( لەکە ) پەلەی چلکنی شت .

( لەکەرەم کەفتك ) د . لەکەرەم کەوتوو .

( لەکەرەم کەوتن ) لەکار کەوتن.

( لەکیسچوو ) شتێکە کەلەدەست چووبێ .

( لەکییسچووك ) د . لەکییس چوو .

( لەکییسچوون ) لەدەستچوونی شتێك .

( لەکام ) کەسێکە کەزۆر کلکە لەقێو رووپامایی بکات .

( لەکان ) لەکەن .

( لەکرسە ) د . شتی مەیبو وەك خوێن .

( لەکرە ) ئێرە .

( لەکرەودوا ) لەئێستا بەدواوە .

( لەکژ ) خەریبك : چووم بۆلای نەریمان دییم لەکژ دەرسەکەی بوو .

( لەکلەك ) ز . لەقلەق .

( لەکژچوو ) ئەندامێکە لەسەرمانا سرربووبێ .

( لەکژچووك ) د . لەکژچوو .

( لەکوچوون ) سرربوون لەسەرمانا.

( لەکۆررهاتن ) بەرامبەریی کردنی یەکێك و زال بوون بەسەریا .

( لەکژ کەوتن ) لەکژچوون .

( لەکووپدان ) ووتەیێکە بەیەکێك ئەووترێ لەرووی سووکییەوە کەلە

بابەت شتێکەوە نائومێد بووبێ : برۆ هەر لە کووپی خۆت بدە .
(لەکەچوون) دەرچوونی جومگەو لەجێ چوونی .
( لەگەل ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ بۆ بوونو هاوڕێیی شتێك لەگەل شتێکی تـرا : [ لەگەل ] نەریمانا رۆیشتم .
(لەگەن) دەفرێکی مسینی دەموالە .
( لەگیر چوون ) د . لەگۆچوون .
( لەل ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ بۆ دەربڕینی مەبەست یادەرنەبڕینی: ناتوانییت بڵییت ( لەں ) یامن ئەو کارە ئەکەم تۆ ئەتوانییت بڵێ [لەل] .
( لەلۆ ) د . لەلوو .
( لەلوو ) ه . جۆلانە .
( لەلووك ) جۆلانە .
(لەلە) کەسێکە کەتەرخان کرابێ بۆ ئامۆژگارییو ئاگاداریی کردنی منال . شوێنێکە لەشت کەوا بڕرابێ ، [ لەلە کردن ] دابڕینی هێندێ شت بۆ مەبەستێك .
(لەلەیی) ئامۆژکارییوسەرپەرشتیی منال لەلایەن یەکێکەوە کەبۆ ئەوە تەرخان کرابێ .
(لەم) سك [ه] . بڕرکی ترۆزیو کوولەکە ( ز ) .
( لەماکۆزدان ) درویێنەی دەغڵو گیایە بەکەرەنتوو .
( لەمپا ) چرای بۆریەدار .
( لەمپە ) پا . لەمپا .
( لەمپەر ) شتێکە بکەوێتە ناوەندی دووشتەوە بەرەنگێك کە لەیەکیان جیا بکاتەوە «حاجز» .
( لەمسانەن ) ز . هەردوودەست خستنەبەر باخەڵ لەسەرمانا .
( لەم لاوە ) ووتەیەکە ئـامـاژە « ئیشارە »ی پێئەکرێ بۆلایەکی نزییکتر لە لایەکی تر .
( لەمەرر ) ووتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ پەیوەندیی شتێك بە شتێکەوە : ئەمەووڵاخەکەی [لەمەرر] فەرهادە .
( لەمەزەرریینە ) ه . نیسکێنەی سەر بەرڕۆن .
( لەمەوبەر ) بەر لە ئیستا .
( لەمەودوا ) لەمەولا .
( لەمەولا ) لە ئیستا بەدواوە .
( لەمەولاوە ) لەمەولا .
( لەمێ ) لێرە .
( لەمیانە ) لەمێ .

( لەمێژ ) ووتەیەکە بەکاردێنرێ لەجێی ووتەی [دەمێکە] . نوێژ و خواپەرستیی [ز] .

(لەن) زییخەڵان و ووشکەڵانێکە لە ناو چەم و رووبـارا وەك درگە « جزیرە » پەیابووبێ بە هۆی جیا بوونەوەی قوڵێکی کەم لە ئاوەکە.

(لەناوبردن) بریتی‌یە لەنەهێشتنی شتێك لە ئارادا.

( لە ناواچوو ) شتێکە کە نەمابێ لە ئارادا .

( لە ناوچووك ) لەناوچوو .

( لەناوچوون ) بریتی‌یە لەنەمانی شتێك .

( لەناودان ) لەناوبردن .

( لەنج. ) د. رق و قین .

( لەنجباز ) د. قین لەسك .

( لەنجە ) خۆبادان لە رۆینا .

( لەنجەولار ) خۆلار کردنەوەو خۆبادان بە ناز .

( لەند ) دەشتایی‌یەکی نەختێ بەرزە لە ناو کێلگەدا کە ئەم لاو ئەولاکەی ئاو گرتبێتی‌یەوە ، بەڵام ئەوشوێنە بەووشکی مابێتەوە «جزیرە»

( لەندك ) ز. لانك .

( لەندە هوور ) مەردومی درێژی زلی کەتە .

(لەنگ) شەل . شیعری نارێك . وێستان لە شوێنێك .

( لەنگووچك ) فەقیانە .

(لەنگە) لەنگین ، [ لەنگەلەنگ] شەلەشەل . نوێل .

( لەنگەر ) ئاسنێکی قورسە بە زنجیرێکی ئەستوورەوە کەشتیوان لەکاتیوەستاندنی کەشتیا داررۆچکەی ناو ئاوی ئەکا بۆئەوەی کە بوەستێ .
وەزنوکێش: ئەم‌دووشیعرە هاولەنگەرن

(لەنگەرگا) شوێنێکە کە کەشتی لەنگەری تیا بهاوێ .

(لەنگەرفرێدان) لەنگەرهاویشتن

( لەنگەرگرتن ) وەستان و نەبزووتنی باڵدار لە حەواو کەشتیی لە ئاوا .

( لەنگەرهاویشتن ) لەنگەرگرتنی کەشتیی .

(لەنگەریی) شتێکی دارینە وەك سینیی، دانەوێڵەی پێ تەتەڵە ئەکرێ .

( لەنگەکردن ) شەلین لەرۆینا

(لەنکێزە) بارانی خوررەمی بەتاو.
( لەنکیی ) شەلی .
( لەنکین ) شەلین .
( لەنێوبردن ) لەناوبردن .
( لەنێوچوون ) لەناوچوون .
( لەو ) لێو [ل]. لە ئەو : لەوی وەرگرە ، واتە لە ئەو .
(لەوازە) ئەو تێـلایانەن کە وەك [لەنکە] بە یارمەتی [ گردەڵە ] وە بەرداشی پێ دائەگرن وسەری ئەخەنەوە
( لەواسە ) بەری دەستوپێ .
(لەواش) پەلی کیاندار .لەواشە [د].
(لەواشە)جۆرە نانێکی ئەستوورە. دارێکی دووفاقە ئەگرێتە لچی کەرو ئێسترەوە لەکاتی ناڵ کردنیانا ، وە سەرەکەی توند شەتەك ئەدرێ .
( لەوان )لەبان، ووتەیەکە ئاماژەی پێ ئەکرێ بۆچەند کەسێکی نادیار .
( لەوانە ) ووتەیەکە ئاماژەی پێ ئەکرێ بۆ چەند کەسێکی دیار .
( لەوتاندن ) با . پیسکردن .
( لەوج ) د . کەوج .
( لەجرر ) چەنەباز .
( لەوچە ) قەوچە ، [لەوچەلەوچ] لـــە وچەی یەك لە دوای یەك . چەنەباز [ز] .
•( لەوح ) تەختەی پان .
•( لەوحە ) لەوح .
( لەودوا ) د . لەوەدوا .
( لەوەدە ) د .کاڵتەچی . کەوج . لۆدە .
( لەورە ) لەوێ .
( لەوزینە ) د . لەبزینە .
( لەوس ) لچ : دەمو [لەوس]ی خواتەوە .
( لەوساوە ) لەودەمەوە .
( لەوسن ) با . لێو ئەستوور .
( لەولاو ) د . لاولاو .
( لەولاوە ) ووتەیەکە ئاماژە « ئیشارە »ی پێ ئەکرێ بۆلایەکی دوورتر لە لایەکی تر .
( لەوما ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ وەك ووتەی [ چونکە ] .
( لەون ) جۆر : بەم لەو نەنابێ.
( لەوە ) ووتەیەکە ئاماژەی پێ ئەکرێ بۆ تاقە شتێکی دیار .
( لەوەبەر ) لە پێش ئێستاکەوە .
( لەوەپاش ) لەمەودوا .
( لەوەپێش ) لەوەبەر .

( لەوەدوا ) دوای ئەوە .
(لەوەرر) گیاوپووشێکە کە ئاژاڵ بیخوا . لەوەرریین: ئاژاڵەکە چووەە بۆ لەوەرر .
( لەوەرران ) لەوەرریین .
( لەوەرراندن ) بردنی ئاژاڵ بۆ لەوەررخواردن .
( لەوەرراندن ) بردنی ئاژاڵ بۆ لەوەررخواردن .
( لەوەرران ) لەوەرراندن .
( لەوەررگا ) شوێنێکە کە ئاژاڵ تیا بلەوەررێ .
( لەوەرریان ) د . لەوەرریین .
( لەوەرزیین ) خواردنی گیاو پووش لەلایەن ئاژاڵو وولاخەوە بە دەمی خۆی .
(لەوەن) قامیش [ز] . سوزانی
( لەوەند ) شوخ و شەنگ .
(لەوەندە) لەوئەندازەیە .
( لەوەندیی ) با . فەقیانە .
( لەوهەندە ) لەوەندە .
( لەوێ ) ووتەیەکە ئاماژەی پێ ئەکرێ بۆشوێنێکیدوور .
( لەویانە ) لەوێ .

( لەوێچ ) قوولیی تەنها دەستێك کە پەنجەکانی پێکەوە بنوسێنرێ : پرر [ لەوێچ ] ێك مێوژم بدەرێ .
( لەوێررا ) لەوێوە .
( لەوێندەرێ ) لەوێ .
( لەوێنە ) لەوێ .
( لەهلهاك ) ل . مارمێلکە .
( لەهن ) ز . لانی وورچ .
( لەهۆشخۆچوون ) بوورانەوە .
( لەهەڤهاتن ) ز . رێکەوتن و ئاشت بوونەوە .
( لەی ) ه . بەررە .
( لەیرت ) مەردومی شاقلداری چوارشانە .
( لەهێکررا ) لەپرر .
( لەهیی ) لافاو . سێلاو .
( لەیرە ) ئێرە .
( لەیز ) ز . یاریو کاڵتە .
( لەیزووك ) با . لەیزیین .
( لەیزیین ) ز. یاریی کردن .
( لەیستن ) ز . یاریی کردن .
( لەیلاخ ) کوێستان .
( لەیلوپەرر ) لییل و پەرر .
( لەیلووك ) جۆلانە .

( لەیلەدۆنێ ) د . ژنی هەرزەی کەرزۆك .

( لەیم ) ز . لەحیم .

( لەینە ) لەوێ .

( لەیەك بوون ) لێکبوون .

( لە یەکبەربوون ) جیابوونەوەی شت لەیەك . بەیەکا هاتنی دوو کەس و بەگژیەکا چوونیان .

( لەیەکبەردان ) جیا کردنەوەی دووشت لە یەك : کورسی یەکەی [ لەیەکبەردێ ] . بەگژیەکا کردنی دووکەس یا زیاتر .

( لەیەکچوون ) چوونی دووشت لە یەك .

( لەیەکدان ) تێکەڵاوکردنی دوو شت لەگەڵ یەکتریی : گەنم وجۆکە [ لەیەکبدە ] . دروونی دووشت بە یەکا : تەختەکانی جاجمەکە [ لە یەکبدە ] .

(لێ) ووتەیەکە مێیینەی ئاودەمیی پێ بانگ ئەکرێ [ز] . بەڵام [ز] . ووتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی ووتەی [ با واش بێ ] . پێیتێکە بە دوای هێندێ ووتەوە ئەنووسێ خۆشەویستی ئەو شتە ئەگەیەنێ : بابە [لێ] ، دایە [لێ] . پێشگرێکە ئەچێتە سەر هێندێ کردار ، وەك لێخستن ، لێکردن ، لێبردن .

( لێبردن ) پیابردن . بریتی یە لە هەڵخەڵەتاندنی یەکێك : چاکی [ لێبرد ] .

( لێبرران ) کورت هێنانی شتێك لەشتێك: جاجمەکە بەنی [لێبرراوە] . دەستدانە کارێك و پشتێن بەستن بۆ کردنی بەراستیی : فیسار کەس چاك بۆخوا [ لێبرراوە ] .

( لێبرریان ) د . لێبرران .

( لێبرریین ) بڕینی شتێك لە یەکێك .

( لێبووردن ) لێخۆشبوون .

( لێبووردوو ) کەسێکە کە زۆر چاوپۆشیی بکا .

( لێبوورده ) کەسێکەلێ بوردنی زۆربێ .

( لێبوونەوە ) تەواو کردنی کارێك و دەست لێهەڵگرتنی . جیابوونەوەی شتێك لەشتێك: کتێبەکە پەڕەیەکی [ لێبۆتەوە ] .

( لێپ ) ز. فیل و کەڵەکە .
( لێپرسراو ) کەسێکە کە ئەرکی جێبەجێ کردنی کارێکی بەسەرەوەبێ
( لێپرسراویی ) مسۆلیتی یەکێك لە کارێك .
( لێپرسینەوە ) پرسیارکردن لە یەکێك یا لە شتێك بە ووردیی .
( لێپۆك ) ز. کەسێکە شێوەی خۆی بگۆڕێ بە جۆرێك کە پێی پێ بکەن .
( لێپێچانەوە ) لێپرسینەوە .
( لێپێیسکردن) گۆڕرانی نەخۆشیی بە نەخۆشێکی تر « مضاعفات »
( لێتۆژینەوە ) لێپرسینەوە .
( لێتێکچوون ) شێوانی کارێك لە یەکێك .
( لێچ ) ز. گوڵاو .
( لێچوو ) شتێکە کەشتێکی تری پێ بشوو بهێنرێ .
(لێچوواندن) تەشبیە کردنی شتێك بە شتێکی تر .
( لێچوون ) دەڵاندنی دەفرێك کە شتی شلی تیابێ . بریتی یە لە پەرریینی ووڵاخی یەك سم لە مێ کەی .
چوونی شتێك لە شتێك لە دیمەنا: پەروویین و نەرمیین [ لەیەك ئەچن ]
(لێچوونەوە) لەهێلکە وەستانەوەی مریشك . بریتی یە لە یەکێك کە نوێژکەر بوو بێ و دەستی لێ هەڵگرتبێ .
( لێخراو ) کەسێکە لە پیشەیەك دەرکرابێ .
( لێخستن ) دەر کردنی یەکێك لە پیشەکەی . هێنانی شتێك بە سەر شتێکا . لێدان [ز] .
(لێخشاندن) هێنانی شتێك بەسەر شتێکا بە ئاستەم .
( لێخواردن ) بریتی یە لە لایەن بەردانی یەکێك : من لە فیسارکەس [ ناخۆم ] واتە لایەنی بەرنادەم .
(لێخورر) کەسێکە کەئوتومەبیل و فرۆکەو هەموو جۆرە مەکینەیەك بیا بەرێوە .
( لێخوورریین ) بە رێکادا بردنی چوارپێ . تێخوررین وهەررەشەکردن
( لێخۆشبوون ) خۆشبوونی یەکێك لە شتێك .
( لێخەفتان ) لێخەفتن .
(لێخەفتن) ئاگاداریی پاك و تەمیزیی

( لێدان ) کێشانی دەست یا قاچ یا شتێکی تر بەشتێکا . بە ناو ئاو رۆیین و پەڕینەوە : ( لە چەمەکە بدە ) . بریتی‌یە لە دزیین : فیسار کەس چاکی [ لێدا ] بریتی‌یە لە تررکەندن .

( لێدزیینەوە ) کلدانەوەو بردان : دیبوارەکە قەنگا سەبەرە بەرە [ لێ ی بدزەرەوە] ، یا کالاّکە فراوانە لە دروونا [ لێ ی بدزەرەوە ] یا لە رۆژانەکەت [ بدزەرەوە ] بۆ دوا رۆژت .

(لێدوان) دوانی یەکێك لە یەکێك یا لە کارێك .

( لێدەر ) مەردومی بزەن .

( لێدەرکردن ) دەرکردنی شتێك لە شتێك .

( لێر ) ل . لییك .

( لێرانە ) لێره .

( لێرر ) کەلەپوور . لێررەوار

(لێررەوار) دارستانی پرری چرر.

( لێرك ) ز. رشتنی ئاو .

( لێره ) ووتەیەکە ئاماژەی پێ ئەکرێ بۆ ئەو شوێنەی کە تۆی تیایت .

( لێره بە دواوە ) لەمەولا .

(لێزان) کەسێکە لەکارێکاشارەزابێ

( لێزانیین ) شارەزایی لە کارێکا .

( لێزگە ) مووڕووی هۆنراوە .

( لێزم ) د . لێزمە .

( لێـزماو ) د . لافاوێکە کە لە بارانی لێزمەوە پەیدا ببێ .

( لیزمە ) بارانی بە خورر .

( لێزیین ) ز . یاریی کردن .

( لێژ ) سەربەرەوخوارە .

(لێژایی) شوێنی سەربەرەو خوارە

(لێژنە) داری سووتاندنی لەسەر یەك هەڵچنراو . ئەنجومەن .

( لێژیی ) لێژایی .

( لێسانەوە ) د . لێسانەوە .

( لێسانەوە ) لستنەوە .

( لیسب ) لۆی هۆنراوەی پرچ . لۆی هۆنراوەی قۆچەقانی .

( لێسپا ) سێپای ئاگر .

( لێستن ) د . لستنەوە .

(لێستنەوە) لستنەوە .

( لیسك ) کورزەی تیشکی خۆر.

( لێسك ) تیغێکی کەوانەیی‌یە ئاو کەوچك و کاسەی پێ هەڵ لە کۆلرێ .

( لێسکە ) لێسك .
( لیسۆکە ) بەردێکە کە لەچەما ئاوەسووبووبێ ، وە زۆر گەورەنەبێ
( لێسە ) بریتی‌یە لەخواردەمەنی زۆری خۆررایی : فیسارکەس هەر [لێسە]ی بێ بەسیەتی . بەردێکی لووسی‌کردە شتی پێ‌لووس ئەکرێ . مالەیەکە زەوی کێلراوی پێ تەخت ئەکرێ .
( لێشاو ) ئاوی زوربەی زۆر . بریتی‌یە لە هەمۆو شتێکی زۆر .
( لێشررێ ) ه قازیاخە .
(لێشێوان) شێوازو تێکچوونی‌شتێك لە یەکێك .
( لیغاب ) ز . لغاو .
( لیغیێ ) ز. شتی لینج .
( لێف ) لێفە .
( لێفکە ) لفکە .
( لێڤۆك ) با . کەسێکە کە زۆر داوای شت بکا لە مەردوم .
( لێفۆکە ) لێفەی پچکۆلە .
(لێفە) پێخەفێکی بەروپشت‌داری لۆکە ، یا خوری لە ناوی ، پرر تەرییە .
( لێفە دروو ) کەسێکە هەر لێفە بدروێ .
( لێڤ ) با . لێو .
( لیڤا ) ز . بەرخ .
( لێق ) د . لیێق .
( لێقزمیان ) د . لێقەومان .
( لێقە ) د . لیێقە .
( لێقەومان ) سەرلی‌شێوان و تێکچوونی ژیان لە یەکێك .
( لێقەوماو ) کەسێکە ژیانی لێ تێکچووبێ .
( لێك ئانیین ) ز . رێك‌خستنی دوو کەس .
( لێکبرران ) دوورکەوتنەوەی دوو گیاندار لەیەکتریی بەرەنگێك کە دەنگیان بە یەکا نەکا .
(لێکبوون) جیابونەوەو لێکبررانی دوو کەس بە زۆریی .
( لێکبوونەوە ) یەکالابوونەوەی هێندێ‌شت: مەشکەکە [لێکبووەوە] . جیابوونەوەی دوو گیاندار لەیەك لە کاتی بە کژ یەکا چوون .
(لێکترازان) ترازان‌وجیابوونەوەی دووشت لە یەك .
( لێك‌خەفتان ) بە دووی سەری

یەکتریی‌دا گەرران .
( لێکدا لێکدا ) پەیتا پەیتا .
( لێکدان ) لە یەکتریی دانی دووگیاندار . ئاوێتەو تێکەڵ کردنی دووشت بەیەکا . گۆررینەوەی دوو شت بەیەکتریی لەگەڵ باقی دانەوەدا
(لێکدانەوە) بیر کردنەوە لەشت و وورد کردنەوەی لە دڵا .
( لێکردن ) باراش ڕۆکردن لە سەر ئاش بۆ هاررینی . خستنی شتێك بۆسەرپشتی وولاخ : زیینەکە یا کورتانەکە یا بارەکەی [لێکە] . تەکاندنەوەی یەکێك لەیەکێك: چاك فیسارکەست [ لێکردم ] .
( لێکردنەوە ) کردنەوەی شتێك لە شتێکی تر .
( لێکررەوییەوە ) دوور کەوتنەوەی پارچەی شت لەیەکتریی: کورسی یەکە [لێکررەوییوەتەوە] واتە پارچەکانی لێك ترازاوون . رەپ بوونی ئەندامی گیاندار لەبەرقەڵەویی یا ئاوساویی .
(لێك کران) رەنجاندنی دووکەس لە یەك .
( لێك کردنەوە ) جیاکردنەوەی دوو شت لە یەك .
( لێك کەوتن ) کەوتنی دووشت لە یەکتریی .
( لێکنان ) قووچاندنی چاو یا دەم . پێوەدانی کتێب: کتێبەکە [لێك نێ]
( لێکوپێکبوونەوە ) هەڵوەشان و پارچە پارچەبوونی شت .
(لێکۆڵینەوە) پۆست کەندەکردنی شتێك .
( لێکهاتن ) ز. ڕێکەوتنی دوو کەس یا زیاتر .
( لێکەفتێك ) د . لێکەوتە .
( لێکەفتن ) د . لێکەوتن ، لێك کەوتن .
( لێکەفتە ) د. لێکەوتە .
( لێکەوتن ) وون کردنی شت : پارەکەم [ لێکەوت ] . لێك کەوتن. نەمانی دارایی یا پیشەی دەوڵەتیی یەکێك : فیسارکەس [ لێکەوتوە ] واتە هەژاربوە یا لێ‌خراوە .
( لێکەوتوو ) لێکەوتە .
( لێکەوتە ) کەسێکە دارایی یا پیشەی دەوڵەتیی نەمابێ . مەردومی دەستەوسان .

( لێکرتن ) لە دلەوە زویر بوون
لە یەکێك : فیسارکەس منـالە
[ لێی مەکرە ] . هەر لە نەبـوونا
بەکار دێنرێ .
(لێکرتنەوە) لێدزینەوە . بڕینی
مووچەی یەکێك .
( لێکۆرران ) گۆڕرانی شتێك لە
یەکێك .
( لێکەرران ) وازهێنان لە شتێك .
( لێکێرانەوە ) کەم کردنەوەی
شتێك لە یەکێك .
( لێل ) ناوی لیخن . بریتی یە
لە مەزدومی زویـیر ، [ لێلبوون ]
بریتی‌یە لە زویربوون .
( لێلافك ) با . لاولاو .
( لێلاڤ ) ز. بەفری تواوە .
( لێلاو ) لێلایی .
( لێلاویی ) لێلایی .
( لێلایی ) کوێرایی .
( لێلایی داهاتن ) کوێربوون .
( لێلکردن ) ز. لابردنی توێکلی
سەوزی گوێزو فندق .
( لێلە ) کاتێکە لە بەیانیان و
ئێوارانا کە جیهان نەزۆر تاریکو
نە زۆر رووناك بێ . خلتەی بنکی
هەنگوین و شـتی تر. تورراوێکە
ئەکرێتە سەر سەوزایی بۆبەهێز بوونی
( لێلیی ) لیخنیی .
( لێم ) لەمن : [ لێم ] لادە .
( لێمشت ) با . لافاو .
(لێنان) دەمکردنی چایی . خستنە
سەر ئاگری چێشت بۆ کولاندنی .
دەرمان خستنە سەربرین. نووساندنی
هێندێ شت بە شتێکەوە : دەسکی
[ناڵەکوزەکە] . بارخستنە سەرپشتی
وولاخ .
( لێنیان ) د. لێنان .
( لینج ) شتێکی تەررە کە دوو
شت بەیەکەوە بنووسێنێ وەك سریش.
( لینجاو ) شتی لینجی شل .
( لینجیی ) بوونی شت بەلینج .
( لینچق ) لینجك .
( لینچقاو ) لینچکاو .
( لینچك ) شتێکە کە کەمێك
لینج بێ .
( لینچکاو ) لینجاو .
( لیندوو ) لنکوو .
( لێنیان ) د . لێنان .

( لێنیشتن ) سواربوونی کوڕییس‌و چەرخ‌وفەلەك . دەست کردن بە نان کردنەوە . دەست کردن بە جل‌شتن.
( لێو ) قەراغی سەرەوەی دەم . لێوار .
( لێوار ) لچو کەناری شت .
( لێوارە ) د. لێوار .
( لێوان ) دەفرێکە تا لێوەکەی پرربێ لە شت . پەرداخ .
( لێوانلێو ) دەفری لێوان .
( لێوانە ) لێوانلێو .
( لێوبردن بە دەما ) بریتی‌یە لە توورە بوون بە جۆرێك کە لە عەزرەتا لێو بەرێ بە دەما .
(لێوبەبار) بریتی یە لە مەردومی خەفەتبار .
( لێودار ) شتێکە کە لێوی بێ .
( لێودان ) هاتنە خوارەوەی شتی شل لە لێوی دەفر بە ئاسانی کە نەرژێ .
( لێوکوروشتن ) لێو بە دەما بردن .
( لێوە ) شێت [ ل ] . فرۆیەکە کە شیری تێکەل کرابێ بۆ ئەوەی کە زۆر توند نەبێ . خاکە لێوە .
فێ [ د ] . خورپە [ د ] .
( لێوەرگرتن ) وەرگرتنی شتێك لە یەکێك یا لەشتێك: ئەم قسەیەم لەفلان کتێب وەرگرتووە ، وەکتێبە کەشم لە فیسارکەس وەرگرتووە .
( لێوەشانەوە ) لێوەشیینەوە .
( لێوەشیینەوە ) کونجانی کارێك لە یەکێك‌و لە بارابوونی .
( لێوەشۆ ) شوێنێکی زیبخەلانە کە بە دەم ئاوەوە خۆی نەگرێ .
( لێوە لەرزە ) لێوە لەرە .
( لێوە لەرە ) بریتی‌یە لەترسان بە جۆرێك کە لێوبێتە لەرزیین .
( لێوەلەرێ ) لێوەلەرە .
( لێویاك ) د. فێدار .
( لێویان ) د. فێ‌لێ‌هاتن . داخورپان .
( لێهاتن ) پەیابوونی ئازارێکی کوتووپڕی‌ی کوشندە لە گیانلەبەر . پێکەوتنی کالا لەیەکێك . وەشانەوەی شتێك لە یەکێك .
( لێهاتوو ) کەسێکە کە هەموو کارێکی باشی لە دەست بێ .
( لێهان ) د. لێهاتوو .

( لێهەڵسان ) تەوانایی و دەسەڵات بۆ کردنی کارێك: [لێمهەڵناسێ] خانووبکەم .
( لێی ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ لە جیاتی ووتەی [ئەو] بەڵام هەر بۆ مێیینە بەکار دێنرێ .
( لییپ ) پارووی گەورە فیِل . شەپۆل [ د ] .
( لییپان ) دەفری زۆر پرر .
( لییپانلییپ ) لییپاولییپ .
( لییپاو ) د. شەپۆل .
(لییپاولییپ) دەفرێکە کە پرر بێ لە شتێك تا لێواری .
( لییپلێدان ) پارووی گەورەگرتن .
( لییت ) ل . لووت .
( لییتاو ) لییتەی زۆر شل .
( لییتە ) قوڕری شل .
( لییچ ) حەوز [ز] . مێووژێکە کە کوترابێ بۆدۆشاو [با]. لینج .
( لییچاڵ ) د. مرەبا .
( لییخن ) ناوی لیلّ .
( لییر ) جۆرە ئاوساوییەکی پەڵە پەڵەی بەئاڵۆشە لەجەستە پەیدا ئەبێ.
( لییرکردن) لییردەرکردن .

( لییرك ) لییر . شەرا [د] .
( لییرکدار ) د . شەرابردوو .
( لییرە ) دراوێکی زێڕرینی بە نرخە .
( لییزك ) د . تیشـك ، تاڵێك لە بەن و شتی تر .
( لییس ) داری ئەستووری درێژی بێقۆرت و گرێ . کولانەی مریشك و باڵندە [ز] .
( لییس تێکوتان ) بریتییە لەزۆر هاتوچۆکردنی یەکێك بۆ شوێنێك .
( لییس تێهاویشتن ) لییس تێکوتان.
( لییفك ) ز. لفکە .
( لییفکە ) د . لفکە .
( لییفە ) د کیسەی حەمام . کەلکییت .
( لییڤ ) ز . لێو .
( لییق ) شتێکی نەرمە کەخۆی نەگرتبێ وەك ماستی تازە مەیو و گۆشتی لەجەر .
(لییقن) ترێیەکە کە لەبەر زۆر کەیین بڵ بووبێ .
( لییقە ) پارچەیەکی نەرم و شلە ئەخـرێتە ناو مەرەکەبی دوێتەوە .

گیایەکی پایزیی کەلاّ بارییکە بۆ ئاژالی ووردە خراپە .

( لییقە لییق ) پێکەنیین و هێلکە هێلك ، [ لییق و هوورر ] لییقە لییقی زۆر .

( لییك ) تفـو لینجایی‌یەکە کە بەدەما بێتە خوارەوە .

( لییکن ) کەسێکە کە لییکی زۆربێ .

( لییکە ) گیای ناسکی نازاو .

(لییلق)د . گۆشتی چەرمە چەقالّتە

( لییلك ) گیانداری تازەبووی شلە پەتە کە پەشتا خۆی نەگرتبێ .

( لییلوپەرر ) لییلوفەرر .

( لییلوفەرر ) گولێکە لەناو ئاوا ئەرروێ و بەرز ئەبێتەوە تا سەر ئاوەکە ئەکەوێ ئنجا گولێکی سپی ئەکا وەك دەرخۆنە .

( لییلەنگ ) خوم .

(لییمان)جۆرە تەرریی‌وزرینجکاوێکە لەگۆمی‌هێندێ مایەسیریی دارەوەدێ

(لییمۆ) مییوەیەکی خرری زەردی بۆنخۆشی ترش یا شییرییینە .

( لییمۆیی ) شتێکە کە رەنگی وەکو رەنگی لییمۆ وابێ

( لیینك ) با . کووپەی گەورە .

( لییو ) لم .

( لی‌یە ) ز . لاڤاو .

# پیتی میم

## م

( م ) راناوی لکاوە بۆقسەکەری تەنیا « متکلم وحـدە » ئەلکێ بە دوایی ناوو کردارەوە: کورر [م] ، رۆیشت [م] ئەررۆ [م] . ژمارەی ئەسلی ئەکا بە ژمارەی تەرتیبی : یەکە [م] ، دوە [م] .

(ما) منێ . ووتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی ووتەی [ بۆچی ] : [ما] وا ئەکەیت ، واتە بۆچی؟.دروستیی و پێکهاتنی دۆکولیو : [ ما ] ی دۆ کولیوەکەی هێنایەوە . شاخو کێو [د] . ئەشکەوتیکە لە کێو کە حەیوانە کێویی تی بچێ [د] .

(مات) گیانداری بێدەنگ . شتی چەسپی جێ گیر : ئەوبەردە [مات] کە واتە چەسپی کە ، [ مات بوون ] بێدەنگ بوون . چەسپ بوون .

( ماتانێ ) با . هەلماتین .

( ماتاو ) د . مانکەشەو .

( ماتکردن ) بریتییە لە کوشتن: مارەکەم [ ماتکرد ] واتە کوشتم. چەسپ کردن .

( ماتەدان ) روون بوونەوەو دەر کەوتنی نیشانەی گەیینی میوەودومەل: کالەکەکە یا ترێکە یا دومەلەکە [ ماتەی داوە ] .

( ماتەم ) شیوەن. پرسە .

(ماتەمات) خۆمت کردن و وورده وورده چوونە پێشەوە لە شتێك .

•( ماتەمیین ) مەردومی خەفەتبار

•( ماتەمیینی ) خەفەتباریی .

( ماتیك ) د . خەتاتی ژنان .

( ماتیی ) بوونی مەردوم بەمات

( ماجومیی ) جۆرە خواردەمەنی یەکی رەق و جیبرە لە شەکر دروست ئەکرێ .

( ماچ ) دەم نان بە شتێکەوەو شلپە لێ هەستاندنی بە لیو لە بەر خۆشەویستیی .

( ماچکردن ) ماچ .
(ماچوموچ) یەکتریی ماچ کردن .
( ماچە ) ئیستری مێ .
( ماچیك ) ز. ماچ .
( ماچین ) میچین .
( ماخۆ ) خاوەن .
( ماخولان ) نەخۆشی‌یەکە تووشی هەر کەسێك بێ هەمیشە ئەندامی ئەجوولێ .
( ماخولیا ) ماخولان .
(ماد)ناوی تیرەیەکە کورد ئەچێتەوە سەری کە ئەویش کوړری «مادا»ی کوړری «یاپث»ی کوړری «نوح» .
( ماداك ) ز . گامێشی مێ .
(مادام) جۆرە ئەنراوێکی سفتی ئەنکی دەزوویینە .
( مادە ) شتێکی خرری پانە لە پەررۆ دروست ئەکرێ و نانی پێ پێوە ئەدرێ . بریتی‌یە لە شەق : [ مادە ] یەکی پیادا ، وانە شەقێکی تێ‌هەڵدا . ئاشك [ د ] . دومەل [د] . لوو [د] .
( مادەرزا ) د . مادەرزاد .
( مادەرزاد ) شتێکە کە لە مەردوما بێ بە سروشت .
(مار) دەعبایەکی دریژی بێ پێی زەهرداری بەوەزەندە بەهەرگیاندارێکەوە بدا زۆرتر ئەیکوژێ .
(مارانگاز) کەسێکە کە مار پێوەی دابێ و لەوەوە چاوترسێن بووبێ .
بریتی‌یە لە یەکێك کە لە شتێك چاوترسێن بووبێ .
(مارپێچ) شتێکی دریژی کوندارە تیرکەلەی پێ ئەکێشرێ .
( مارت ) مانگی سێهەمە لەساڵی رۆژیی لە ناوەند شوبات و نیسانا وەسییەك رۆژە .
( مارتاك ) ز . خێزەرە .
( مارتوولە ) د . توولەمار .
( مارچێوە ) د . مارگیر .
( ماردەم ) ه . تفەنگ .
( ماررس ) گیانداری چەتوونی سەر رەق .
( ماررکە ) راوکە .
( مارره ) د . ماررکە .
( ماررێ ) ه . چوخم .
( مارریین ) شکاندن .
( مارگرە ) مارگیر .

( مارکیـلك ) با ، مارمێلکە .

( مارگیر ) کیایەکی کەلأخرری دررکاویی کەم کەلأیە ، بەرێکی سووری شیریینی هەیە پێی ئەلێن شێفەلە .

( مارمارۆکە ) شتێکە وەك مار لەهەوییر دروست ئەکرێ‌وئەبرژێنرێ بۆ منال .

( مارماسیی ) جۆرە مارێکی ئاویی بەسزمانە لە ماسیی ئەچێ .

( مارەزووك ) د . توولەمار .

( مارمژ ) کەسێکە جێکایەك لە ئەندام کە مارپێوەی دابێ، برینداری بکاو بە کەلەشاخ هەلی مژێ .

( مارمێلك ) مارمێلکە .

( مارمێلکە ) دەعبایەکی باریکی پچکۆلەی بۆرەقنەی چنگداری بەسزمانە .

( مارمیێلۆك ) مارمێلکە .

(مارنەگەز ) جزمە یا پووزەوانەیەکی لبادیینە ، ئەکرێتە پێ بۆ ئەوەی کە مار پێوەی نەدا .

(مارۆ) مەرریابزن یارەشەوولاخێکە کەخۆی رەش‌وناوچەوانی سپیی بێ .

( مارودوو ) شتی شەفتوول .

( مارە ) پەیوەندیی ژن و مێرد بە چەند ووتەیەکی ئاییینی .

( مارەبرر ) کچێکە بە منالی مارەکرابێ لە یەکێك .

( مارە برراَنە ) دراوێکە ئەدرێ بەو کەسەی کە مارە ئەبررێ .

( مارەبررین ) مارەکردن .

(مارەزا) پیسیی ساوای تازەبوو.

( مارەزیو ) هەزارپێ .

( مارەکردن ) بەستنی پەیمانی ژنو مێردیی بە چەن ووتەیەکی ئاییینی: رووخوشیان [ مارەکرد ] لە نەرییمان .

( مارەکۆل ) هـ . دووپشك .

( مارەگیرە ) مارگیر .

( مارەیی ) زێرر یا زیو یاشتێکی ترە کە ژنی لەسەر مارە بکرێ .

( مارییلە ) مارمارۆکە .

( مازك ) د . مازوو .

( مازلووخ ) هـ . بەرمال .

( مازماز ) د . بەران .

( مازوو ) شتێکی خرری سەختی تفتی‌قژقژاوییە لەگزگل پچووکترە .

دارێکە مازوو بگرێ .
( مازووبەرەڵا ) کاتێکە لە دوایی بەهارا کە مازووی تیا بەرەڵا ئەکرێ بەم رەنگە هەموو کەس ئەتوانێ بێ ترس و پرس بچێ بۆ مازووچنین . بریتی یە لە بەرەڵایی و بێ سەروبەر گیری لە شتا : کە چووم باخەکە [مازووبەرەڵا] هەرکەس بۆخۆی بوو
( مازووچن ) کەسێکە کە مازوو لە دار بکاتەوە .
(مازوودار) دارێکە مازوو بگرێ
( مازە ) تەختەی ناوی عەرەبانە . پشت [ ە ] .
( مازی ) پشت [ە] مازوو [با].
( مازیر ) ز . شەلکە .
( ماس ) ماست .
( ماسان ) ئاوسان .
( ماساو ) ماستاو . ماسیی [ە].
( ماست ) شیری گەرمکراوی هەوێن کراو ، کە ترش بووبێ .
( ماستاو ) ماستێکە بە ئاو شل کرابێتەوە بۆ خواردنەوە .
( ماستاو سارکردنەوە ) بریتی یە لە روو پامایی کردن بۆ یەکێک .

(ماستاوکردن) ماستاوساردکردنەوە
(ماستەرۆن) با . چیینێك ماستو چیینێك رۆنە کە لە پایزانا لە ناو دیزەدا هەڵ ئەگیرێ و لە زستانا ئەخورێ .
( ماسرێشم ) د . هێلمێکە لە پێستی ماسیی دروست ئەکرێ .
( ماسکە ) د . کەسێکە کە روخساری خۆی بگۆررێ .
( ماسولکە ) ماینچە . خەرمانێکە لە پاش شەنکردن بە درێژیی هەڵدرابێتەوە .
(ماسۆڵە)جۆرە ساجێکی ئەستوورە لەشاری [ماسۆڵە] دروست ئەکرێ .
مەکۆی جۆلا . قامیشێکە جۆلاهەودای لەسەر هەڵ ئەکاو ئەیخاتە ناو مەکۆکەیەوە بۆ تەنینی . ماسولکە
( ماسوور ) ز. بەری درەختێکی دڕکاوی یە لە عەنناب ئەچێ .
( ماسە ) د . ای وورد .
( ماسیان ) ئاوسان .
( ماسیەوچنە ) د . ماسییگرە .
(ماسیی) گیاندارێکی درێژ کۆڵەی پەررەداری مەلەوانی ئـاویی یە ،

گۆشتی خۆشە .
( ماسیخۆرە ) جۆرە مراویی‌یەکە زۆرتر ماسیی ئەخوا .
( ماسیگرە ) باڵندەیەکی قاچ و مل درێژە ، لە ریشۆڵە گەورەترە لە ناو ئاوا راوی ماسیی ئەکات .
( ماسیگیرە ) د . ماسیگرە .
(ماسیلە)د . شتێکە وەك مارمێلکە، لە شوێنی شێدارا پەیا ئەبێ .
( ماسین ) ئاوسان .
(ماسی‌یەپانکە) جۆرە ماسی‌یەکی پانکەلەی گۆشتنە .
(ماسی‌یەزەردە) جۆرە ماسی‌یەکی زەرد باوە .
( ماسی‌یەوان ) کەسێکە شارەزای راوەماسی بێ .
( ماش ) دانەوێلەیەکیووردی رەشە لە نیسك ئەچێ .
( ماشانن ) د . ماشینەوە .
( ماشاو ) جۆرە ئاوێکە ئەچێتە ناو پەردەی چاوەوە کوێری ئەکا ، وە میبل لێدانی دووبەختیی‌یە .
( ماشتن ) مالین و گەسکدان .
( ماشك ) ز . ماش .

( ماشلێن ) هـ . ماشێنە .
( ماشوبرنج ) بریتی‌یە لەریشێك کە دەنگێکی سپیی‌ودەنگێکی‌رەش بێ
(ماشە) قوولینەیەکی زۆر گەورەیە لە خوررگەی ئاودا دائەنرێ بۆئەوەی کە هەرماسیی‌یەك هات تێی کەوێ‌و دەرنەچێ . مەقاش . پێی تفەنگ.
( ماشەر ) بەنێکە لە سەر ئەژنۆ کرابێ بە قانکلە . ماشەرە .
( ماشە ررەش ) ماش .
(ماشەرە) جۆرە برینێکە بەدەم‌و چاو ئەکاو ئەتەنێتەوە .
( ماشەسپیی ) جۆرە ماشێکی دەنك گەورەی سپی‌یە .
(ماشێن) چێشتی ماش . مەکینەیەکە کە بە ئاگر برروا .
( ماشێنە ) چێشتی ماش .
( ماشین ) ماشێن [د] گەسکدان
(ماشینەوە) خواردن و لستنەوەی شت بە ناپلۆخیی .
( ماف ) حەق : [ماف]م بەرێ یا [ماف] ی منی پێوە نی‌یە .
( مافندیی ) مافنكیی .
( مافنكیی ) کەسێکە نابووت

بووبێ و هیچی نەمابێ .
( مافوور ) قالیی .
( مافوورە ) مافوور .
( مافەتا ) مافەتە .
( مافەتە ) جۆرە کرمێکە لەناو پۆرکێکی پووشاوییدا هەر حەلێك مەرر بیخوا ئەیکوژێ .
( ماقرر ) دراوێکی کەم نرخە وەك [ جلق ] .
( ماقۆرر ) بەردێکە کە چالێکی تیابێو ئاوی بارانی تیا بوەستێ .
•( ماقوول ) شتی پەسەند .
(ماك) ئەتەری هێندێ نەخۆشییە، کە بدانە شوێنێك لەئەندام [ماك]ی ئاولەکە یا سووریژەکە داوێتە چاوی یا قوررگی . جێگای لێك کەوتنی کناری ئاسمان بە کەناری زەویی کە پێشی ئەلێن ئاسۆ.کان : فیشارە شوێن [ماك]ی نەوتی تیایە. ریشەو بناغەی شت : [ ماکی ] دزیی لە ناو هێندێ تیرەدا هەر بنەبرنابێ. دایك . [با] . هەنگێکە کە پوورەئەدا
( ماکاو ) چەن کەلەبەرێکە لە جۆگەی تووتنو مەرەزەدا ئەبرری بەم بەرو بەو بەریا بۆ ئەوەی کە بە باشی ئاو بخواتەوە .
(ماکووز) گیایەکی ئاویی هەمیشەییە لەکووزەڵە ئەچێ ، بەڵام ئەمگەڵای پانترەو تاڵە .
( ماکەر ) دێلەکەر .
(ماکەرمەلە) بریتییە لەدەڵەچەیی و کلکە لەقێ بۆمەردوم بەسەرزاریی.
( ماکەو ) کەوی مێ .
•( ماکینە ) چەن پارچەیەکی لێك دراوە کە لەکارخانە دروست کرابێ بۆ جۆرە کارێ کردنێك .
( ماکینەچی ) کەسێکە کە بە ماکینە کاربکا .
( ماڵ ) خانووبەرە . بریتییە لە زێی ووڵاخ . دارایی .
( ماڵات ) ئاژاڵ .
( ماڵاوایی ) ووتنی [ماڵتئاوابێ] لەلایەن یەکێکەوە کە لەلات بێ و بڕروا .
( ماڵبڕر ) دیوار بڕر .
( ماڵبرریێن ) دیوار برریێن .
(ماڵپشکێن) د . پشکنینی ماڵان بۆ شتێك « تحري » .

(ماڵتاوسانیی) د . خانووی‌هاوینه .
( ماڵخۆ ) کەسێکە کە سەر بە
تۆبێ‌وخۆماڵیی‌بێ لەگەڵتا . خاوەن‌ماڵ
( ماڵدار ) ئاژاڵدار . دەوڵەمەند.
( ماڵداریی کردن ) پاشە کەوت
کردن بۆ دەوڵەمەندبوون .
( ماڵشت ) د . ماڵیین .
( ماڵشتن ) ز. ماڵشت .
( ماڵشتە ) کەسکدەر .
( ماڵکردن ) سەرکێڵ کردنی
کاسنە لەکاتی جووتا بەجۆرێك کە
زەوییەکە نەکێڵێ ، بەڵکوھەر رووی
سەرەوەی بررووشێنێ .
( ماڵکو ) دەسکی دیبەك .
( ماڵ اەیەك ) دووکەسن کە
ماڵیان لە یەکتریی دریغی نەبێ .
( ماڵم ) ماڵووم .
( ماڵماڵە سوورە ) ھ . خاڵخاڵۆکە .
(ماڵماڵانێ) با . جۆرە یارییەکە
لەلادێ ئەکرێ ، بەم رەنگە پرسیار
ئەکەن لە یەکتریی و ئەڵێن : ئەوە
چ ماڵێکە کە ژنێك و مێردێکن ،
یا دایك و باوکێك وکوررو کچێکن
( ماڵمیزك ) با . میزڵدان . بەر
موسڵدان .
( ماڵنج ) ماڵەی سواغ .
( ماڵوبرر ) کۆکردنەوەی داری
سووتاندن‌لەدراوسێ هەرماڵەی بررێك
بۆ سوور کردنەوەی تەنووری تازە .
( ماڵۆچکە ) خانووی پچکۆلانە.
( ماڵۆچە ) ماڵۆچکە .
(ماڵۆس) بەرازێ مێی سێ ساڵە .
( ماڵوسکە ) ماسولکە .
( ماڵۆسکە ) ماڵوسکە .
( ماڵ و منال ) خێزان .
(ماڵوو) ماڵەی زەوی تەخت کردن
.(ماڵووم) پیاوی ئاینیی‌وپێشەوای
جوولەکە .
( ماڵوێران ) کەسێکە کە ماڵی
لێ‌شێوا بێ بە ھۆی بەڵایەکی زۆر
گەورەوە .
( ماڵوێنچە ) ماڵەوێنچە .
(ماڵە)ئاسنێکی دەم‌پانی کلکداریینە
سواغی پێ‌ئەدرێ . چەپەرێکە زەویی
کێلراوی پێ‌تەخت ئەکرێ لەدوای
تۆو پێوەکردنی . نەخۆشییەکە دێ
بەسەرھێنفدێ ژنی‌ئاوسا لەشی‌پلپل‌ئەکا
( ماڵە پییتـان ) د. ماڵە پێیتك

پیتکێنە .

(ماڵە پیتك پیتکێنە) یاری یەکی منالانەیە بە چەند کەسێك ئەکرێ، وە هەر یەکە ئەبێ سێ کۆمەڵ بەردی ووردی لەبەردەما بێت کە ژمارەیان بە قەد یەك بێت ، بابڵێین هەر کۆمەڵەی پانزە بەرد بێت ، لەپێشەوە وەستاکە کۆمەڵە بەردی لای ڕاستی خۆی هەڵ ئەگرێت ، تەنیا بەردێك ئەبێت کە لەجێی کۆمەڵەکە بەجێی دێڵێت ، ئنجا هەر لەلای ڕاستەوە بەردەکانی ناو دەستی کە [١٤] ن دابەشیان ئەکات بە سەر کۆمەڵە بەردی یاری کەرەکانا ـ کە خۆشی یەکێکە لەوان ، دوا بەردەکەیان کەوتە بەر کۆمەڵە بەردی کامیان ـ یا هی خۆشی بێت ـ ئەو کۆمەڵە هەڵ ئەگرێ ، وەبەردێك بەجێ دێڵێ لەجێی خۆی، وەئەمیش لەڕاستەوە دابەش ئەکات بەسەر کۆمەڵە بەردەکانا تا ژمارەی هەموو کۆمەڵەکان لەسەر یەك کۆمەڵی یاریی کەرێك کۆئەبێتەوە، ئەو حەلە ئەو یاریی کەرە ئەبێ بە بەکەمی یاری یەکە .

(ماڵە پێتێنێ) ماڵە پیتك پیتکێنە

(ماڵەکاریی) ئیش کردن بەماڵە .

( ماڵەکردن ) ماڵەکاریی .

( ماڵەکێشان ) ماڵەکاریی .

( ماڵەوکەن ) د . دیوار برر .

(ماڵەوماڵکردن)چوون لەم ماڵەوە بۆ ئەو ماڵ .

( ماڵەوێنچە ) گیایەکی بەهارییە گوڵ و گەڵای وەك لاولاو وایە تەرز ئەهاوێ ، وە بە برژاویی و کوڵاویی ئەخورێ بۆ ڕەوانیی .

( ماڵەوێنچە ) ماڵەوێنچە .

( ماڵە هەنگ ) د . شانی هەنگ .

( ماڵیات ) ماڵات .

( ماڵیلە ) ز. دارێکە وەك نوێڵ بەردی پێ هەڵ ئەکەنرێ .

( ماڵینووس ) جۆرە دەرمانێکی سوورە شتی پێ ڕەنگ ئەکرێ و ئەشکرێتە چاوی ئێشاوەوە .

(ماڵیی) گیاندارێکە هۆگرو ڕامی ناوماڵ بووبێ .

( ماڵین ) پاك کردنەوەی شوێنێك بە گەسك یا بە بەفرماڵ. پیاماڵین

( ماڵینەوە ) پاك کردنەوەی

بەردەمی بەرداش له ئارد .
( مام ) برای باووك .
( ماما ) ه . نەنك .
( ماماله‌کێجێ ) ه . باوەخولێ .
( مامان ) ئافرەتێکه سەرپەرشتی زەیستان بکا له منال بوونیا .
( مامانه‌کێجێ ) د. خولخواردن
(مامانیی) بوونی ئافرەت بەمامان.
( مامبرایمه ) جـۆره ترێ یه‌کی سپی‌دەنك‌دریژی‌گەورەی هێشووشاشه
(مامجه ژنه) کیایه‌کی بەهاریی یه کەلای وەك شـوییت وایه ، کولی ووردی زەردوسپی ئەگرێ وەك مییِنا
( مامر ) مریشك
(مام ریواس)کیایه‌کی بەهاریی‌یه، لەبەهارانا ئەخورێ بۆکوشتنی کرمو رەوانیی .
(مامز) ئاسك. مامزه . ماسیی مێ.
• (مامزه) پارچه ئاسنێکی لووت تییژه سوار لەپاژنەی پێلاوی قایم ئەکا بۆئەوەی له کەلەکەی وولاخی پێ بدا بۆ لیخوررینی .
... شر ) بێدەنگی خامۆش [د] . بۆ تییرەیەك له کورد .

( مامشاخانه ) ئاودەستخانه .
(مامڵە پەشییمانی) دەست‌هەڵ گرتن لەئەندازەیەك لەپاره له مامەڵەیەکا، که تیا پەشییمان بووبیتەوەو شته‌کەت دابیتەوه بەسەر خاوەنیا .
( مامناوەندیی ) شتی ناوونجیی .
( مامۆ ) مام .
(مامۆتك)کزییرو دەم راستی دێ ، یا گەررەك . إختیار. أهلی خوبره .
( مامۆزا ) ئامۆزا .
( مامۆژن ) ئامۆژن .
( مامۆسا ) مامۆستا .
( مامۆستا ) خوێندەوارێکه که دەرس بلێتەوه .
( مامووته ) د . شییری خوژیلك
( مامەحووجیی ) تییکەی گەوره .
( مامه خولییـنه ) ه . پـییریژنه سەر ئاسنیینه .
(مامەخەمه) کەسێکه که بەهەموو شتێك خەفەت بخوا .
•( مامەله ) شت کررینو سەودا کردن لەگەڵ یەکیکا .
(مامەلەپەشیی انیی)مامڵە پەشییمانیی
( مامه لینچك ) برای تووته .

( مامێز ) د . ئاسنێکە بەپاژنەی قۆندەرەی سوارەوە ووڵاخی پێ لێ ئەخورڕێ .
(مامیلان) گیایەکی ئاویی هەمیشە سەوزی دڕە ، بەشتەوە ئەنووسێ ، گەڵای وەك مێو وایە ، ئەدرێ بەئاژاڵ
( مان ) لە ناو نەچوونی شت .
ئەبێ بەراناوی قسەکەری هاوڕێدار «متکلمی مع الغیر» ئەلکێ بەدوای ناوو کرداری تێپەڕەوە .(ماڵمان) ، کرد [مان] . نیشانەی مەسدەرە : کوربیسەکەکێش [مان] ی دێ ، تەنراوەکەد روو [مان] ی خۆشە .
( مانا ) مەبەست .
( ماندك ) ماندوو .
( ماندگ ) ماندوو .
( ماندوو ) گیاندارێکە لەبەر جووولانی زۆر ، ئەندامی کفت بووبێ
( ماندووبوون ) کفت بوونی جەستە
( ماندوونەبوونیی کردن ) ووتنی [ ماندوونەبییت ] بەیەکێك کە لە دوورەوە هاتبێ .
( ماندوویی ) ماندوێتیی .
( ماندوێتیی ) کفتیی وماندووبوونی جەستە .
( ماندیی ) ماندوو .
( مانگ ) ئەستێرەیەکی نزیکە لە زەویی ، بە $\frac{1}{3}$ ٢٧ ی رۆژێك چەرخەیەکی زەویی تیا ئەکات .
مادا [ز] . ماندوو [د] .
( مانگا ) رەشە ووڵاخێکە کە کەوتبێتە سکو زا .
( مانگار ) د . شتێکی کەمە کە مابێتەوە لەشتێکی زۆر .
( مانگانە ) مووچەیەکی هەمیشەیی یە کەمانگەو مانگ بدرێ .
( مانگامژ ) بەرخێکە بەگوزرپەیی دایکی نەمابێ ونرابێتە بەر مانگای شیردار .
( مانگامژە ) مانگامژ .
( مانگاوەس ) مەشکەیەکە لە پێستی مانگا کرابێ .
( مانگر ) گیاندارێکە کە مان بگرێ .
( مانگرتن ) خییش کردنی گیاندار و توورەبوون وئیش نەکردنی .
( مانگ گیران ) نەمانی رووناکی مانگ بەهۆی بەرگرتنی زەویی یەوە .

( مانگ گیریان ) مانگ گیران .
( مانگۆرر ) د . گەورە کچێکە کەمابێتەوەو شووی نەکردبێ .
( مانگەسەوە ) جۆرە بەردێـکە وەك ئەلماس لە هێندێ شاخ دوای تەرزەو باران دەرئەکەوێ .
( مانگەشەو ) شەوێـکە کەسەر زەویی تیا رووناك بێ بـە تیشکی مانگ .
( مانگەو ) ل . مانگا .
( مانگیی ) د . ماندوێتی
( مانگییلە ) مانگی یەك شەوە .
( مانن ) د . ماندوو بوون .
( مانە ) ه . هەمانە .
( مانەند ) شتێکە کەلەشتێکی تر بچێ : ئەم شتە بێ ( مانەند ) ە .
( مانەوە ) گلخواردنەوەی یەکێك لەشوێنێك . قەتیس بوون : قوتابی یەکە لەپۆلی شەش ( مایـەوە ) یا کچەکە (ماوەتەوە ) واتە قەدرەبووە وشووی نەکردووە .
( مانیاك ) د . ماندوو .
( مانیاکیی ) د . ماندوێتیی .
( مانیان ) د . ماندووبوون .
( مانیلووس ) د . مالینووس .
( مانیی ) جاسووس . هەمانە(ه).
( ماو ) د . ماوە .
( ماووت ) چۆغەیەکی تەنراوی خاوداری بەنرخە .
( ماووزەرر ) جۆرە تفەنگێکە .
( ماووش ) د . ئەشکنجەی دار تاش وئاسنکەر. کوتێکە کە بای پیا بچێ .
( ماووڵ ) د . ماوەی کات .
( ماوە ) مەیـدان و رێی هـەڵ سووررانی شت لەشوێن یا لەکات : ئەم خانووە بێ ( مـاوە ) یە ، یا لە ( ماوە ) ی مانگێـکا خانوویـەکم کرد . شتێکە کەمابێتەوە .
( ماوەدان ) چلەوشل کردن بـۆ یەکێك ورێدانی بۆهێندێ کار .
( ماوەوە ) شتێکە کە مابێتەوە .
.( ماویی ) جۆرە رەنگێکی شینی کاڵە .
( ماوییژ ) ل . مێووژ .
( ماه ) ماهیزەرد . مانگ .
( ماهاتنەوە ) دروسـت بـوونی دۆکولییو .

( ماهجه ) مانگی یەك شەوه . مانگی ناوبەیداخ .
( ماهوو ) ز . بەرازی مێ .
( ماهوور ) جۆره نقامێکی خۆشه.
( ماهەر ) ه . ماکەر .
( ماهێنانەوه ) تێکدانی دۆ کولییو ودۆ کەشك لەسەر ئاگر تادێتە کول، بۆئەوەی کەنەبزررکێ .
( ماهـیزەرد ) قەد شاخی لێژی بەردەلانی لووسی سەخت .
( ماهیی ) ماسیی [ل] . ئێسقانی ماسیی . شاخی کووړری سەخت .
( ماهیین ) با . ماین .
( مایچه ) د . ماینچه .
•( مایس ) مانگی پێنجەمە لەسالی رۆژیـی ، لەنـاوەنـدی نیسان و حوزەیرانا ، کەسییویەك رۆژه .
( ماین ) وولاخێکه لەوێنەی ئەسپ کەکەوتبێتە سك وزا .
( ماینبەز ) نێرەکەرێـکه کەاه ماین بپەررێ .
( ماینچه ) پارچه گۆشتێکی درێژ کۆلەی لووسی بێ دەماره ، لەدەست وقاچی هێندێ گیانداردا .
( ماینچەقەل ) شتێکه وەك چەرخ وفەلەك ، منالان سواری ئەبن بەلام بەگردی خۆیا ئەسووررێتەوه .
( ماینه ) د . مێیینه .
( مایه ) دراوێکه کەمەردمخررێید وفرۆختنی پێوه بکا . هەوێن (د) . هۆی شت . ماده [بەدالی کولۆر] .
( مایه بۆش ) مایه پووچ .
( مایه پووت ) مایه پووچ .
( مایه پووچ ) نابووت .
( مایه دار ) داری سووتـاندنی ئەستووری پتەو . خاوەن مایه .
( مایەسیریی ) جۆره نەخۆشـی یەکه لەکـۆمی هێندێ کەسا جار جار چەند دوکمەیەکی لێ پەیدائەبێ.
( ماییین ) ماین [د] . مان «بقاء» [ ز ] .
( مت ) شتی مات . رژاندن (ه).
( متبوون ) مات وبێدەنگ بوون .
( متربه ) ئەمامی موتوربه کـراو [ متربه کردن ] ئەمام کردنی درەختێك یا کولێك لەدرەختێك یاکولێکی تر .
( متك ) ز . تەپۆلکه .
• ( متمانه ) باوەررو دلنیـایی

یەشت .

( متوموورك ) د . متومووروو .

( متومووروو ) بـە چەند جـۆرە مووروویەك ئەڵێن کە ژنان ئەیکەن بەخۆیانا .

( متوموورە ) د . متوموورك .

( متبیل ) بەرگێنکی لاوەکی یە بە لێفەو دۆشەك وسەرینا ئەگیرێ .

( مجرۆ ) کوێر، [ مجرۆبوون ] ، کوێر بوون .

( مجرۆیی ) کوێرایی .

( مجرۆیی داهاتن ) کـوێرایی دا هاتن .

( مجریی ) د . سندووق .

( مجەوور ) کەسێکە کەهەمیشە خزمەتی مزگەوت بکات .

( مجیای ) ە . رژاندن .

( مجێفیی ) جۆرە هەنجیرێـکی سەوزی دەنك پچووکی شیرینە .

( مجێوور ) مجەوور .

( مچ ) زچ . قووری لینجی توند .

( مچاندن ) با . قووچاندن .

( مچۆڵە ) شتێکی نەرمە کە لە مشتا کۆبکرێتەوە بۆ ووشك کردنە

وەی : ماستەکە مچۆڵە مچۆڵە بکە بۆ ئەوەی ببێ بە کەشك .

( مچومۆرر ) مرروموچ .

( مچوولە ) د . ملوچە .

( مچە ) مووچەو بەرات .

( مچینك ) با . مووکێش .

( محال ) ناوچە ،

( محەجەرە ) لاوانەیە کە دروست ئەکرێ لە دار یا لە شیشی ئاسن، ئەگیرێ بە پێشی هەیوان و ئەملاو ئەولای قالدرمەی بەرزا ، بۆئەوەی کەسی لێ نەکەوێتە خوارەوە .

•( محەللەبیی ) فررنیی .

( مخابن ) با . ووتەی داخ و خەفەت .

( مخورر ) دەمووکانە .

•(مخەت)دارێکە چەرمی پـێ لووس ئەکرێ .

•( مدبەق ) ژوورێکە لەخانووکە هەر چیشتی تیا لێ بنرێ .

( مر ) مریشك .

( مرادخانیی ) جـۆرە کالایەکی قۆڵداری داوێن کورتی ناوداری دوکمەدارە .

( مرار ) با . مردارەوەبوو .
( مراز ) مراد .
( مراڤیی ) با . مراویی .
( مراندن ) کوشتن .
( مرانن ) مراندن .
(مراوکە) د . گیایەکە وەك کەلای قامییش ئاژال ئەیخوا .
( مراویی ) مەلێکی مەلەوانی دەنووك پانی پێ پەررەدارە ، نێریان سەری سەوزە .
( مرتوموورروو ) وورده موورروی ژنـان .
(مرچۆلە) د . چۆلەکەیەکی کێویی رەشی پچکۆلەیە .
( مرچە ) با . دەنگی ماچکردن [مرچە مرچ] مرچەی یەك لە دوای یەك
( مرچیلە ) د . باڵدارێکی رەشە لە چۆلەکە پچووکترە .
( مرخ ) تەماع: [مرخ] ی خوی لێ خـۆش کردووە ، واتە تەمـاع تێ کردووە . ئارەزوو : [ مرخ ] ی لێ ئەچوولێ .
( مرخاندن ) مرخەکردن .
( مرخ لێ پەرریین ) د . ئارەزوو کردنی شتێك .
(مرخ لێ چوون ) مرخ لێ پەرریین
(مرخن) گیاندارێکە کە بمرخێنێ
( مرخنە ) مرخن .
( مرخە ) پرخە ، [ مرخەمرخ ] مرخەی یەك لەدوای یەك ، [مرخ و هوورر] مرخە مرخی زۆر .
( مرخەك ) د . مەکۆی جۆلا .
(مرخێش) ووتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ کەسێك کە خەریکی کارێك بێ و باش دەرەقەتی نەیەت : [ مرخێش مرخێش ] رای کێشا .
( مردار ) مردارەوەبوو . بریتییە لە مووی بەر . بریتی یە لە گووی ئادەمیی .
( مرداربوونەوە ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ بۆ مردنی گیاندارێك کە ئادەمیی نەبێ . بریتییە لە مردنی ئادەمیی خراپ ، وە لە رووی سووکی یەوە ئەووترێ .
( مردارخۆر ) د . دالی کەرخۆر.
( مردارسەنگ ) د . مرداسەنگ.
( مردار کردنەوە ) سـەربرریـنی گیاندارێك کە گۆشـتی بخورێ بە

ڕەنگێك كە شەرعی نەبێ . بریتی‌یە لە كردنی كارێك كە زۆر بەگرانی‌و ناڕێكی لە ژێر دەست دەرچێ .
( مردارەوەبوو ) شتێكە كە مردار بوو بێتەوە .
(مردارەوەبووك) د. مردارەوەبوو .
( مردارەوەبوون ) مردار بوونەوە .
(مرداری) مردارەوەبوو . بریتی‌یە لە پیسی ئادەمی .
( مرداسەنك ) جۆرەكلێكی سوور گاری سەختە ئەكرێ بە هێندێ برینەوە بۆ ووشك بوونی .
(مرداو) د . كۆلاوێكە كە ئاوەكەی بەكاری خواردنەوە نەیەت .
( مردك ) مردوو .
( مردن ) گیان دەرچوون. نەمانی هێزی گەچ و قسل‌و جێیوە .
( مردن‌وسووتان ) هەول‌وتەقەلای زۆری بێ‌ئەنجام : مردم و سووتام فلان كتێبم دەست نەكەوت .
( مردۆخ ) مردەلۆخە .
( مردۆخە ) یا . مردەلۆخە .
( مردوو ) گیاندارێكە كە گیانی تیا نەمابێ . گەچ‌و قسل‌وجێیوەیە كە هێزی نەمابێ .
( مردووشۆر ) كەسێكە كە هەر مردوو بشوا . ئاتەشۆر .
(مردوومراو) كەسێكە كە مردووی مردبێ .
( مردوو مردوو ) د مردوومراو
( مردە ئارەق ) د . جواناو .
( مردەشۆر ) مردووشۆر .
( مردەلۆخە ) مەردومی بێكارەی سستی سیسەمارە .
(مردەڵە)مەردومی‌سستی ئیش نەكەر
( مردەماڵ ) قاپ‌و قاجاخ‌و شتی ناوماڵ .
( مردە مۆدار ) د . تەعزیەدار .
( مردەوزیندەكردن ) بریتی‌یە لە نوێ‌كردنەوەی شتێك یا شوێنێك .
( مردیی ) مردوو .
( مرر ) گیانداری تیری تەسەل . گیاندارێكە كە خۆی مەڵاس‌كردبێ بۆ پەلاماردان .
( مرراندن ) مررەكردن .
( مرران ) مرراندن .
( مرربردنەوە ) مرربوونەوە .
( مرربوون ) تیرو تەسەل بوون .

خزمت کردن .
( مرربوونه‌وه ) د . مۆرربوونه‌وه .
( مررمیاو ) ده‌نگی پشیله‌ی نێر
( مررناو ) د . مررمیاو .
( مرروشت ) مشتومرر .
( مررومۆچ ) مه‌ردومی مۆنی گرژ
( مررومووچ ) مررومۆچ .
( مررومووش ) ملومووش .
( مرروو ) مرره‌یه‌که که ئه‌دانه
هێـــندێ خوارده‌مه‌نی وه‌ك مێوژو
شانه‌ی هه‌نگ .
(مرره) جۆره ده‌نگێکه له سنگی
سه‌گو پشیله‌وه دێ له‌پێش وه‌ررین
و میاواندنا ، [ مرره مرر ] مرره‌ی
یه‌ك له‌دوای یه‌ك . ده‌عبایه‌کی پچکۆله‌ی
سوور که له‌یه وه‌ك ئه‌سپێ وایه ، ئه‌داته
گه‌نم و جۆی ڕوشك .
( مرغ ) ل . مریشك .
( مرقاندن ) مرقه کردن .
( مرقانن ) مرقاندن .
( مرقلێدان ) ده‌م هه‌ڵدانی کارو
به‌رخ له‌کوانی دایکی له کاتی مژینا
( مرقن ) که‌سێکه بمرقێنێ .
(مرقه) جۆره ده‌نگێکه وه‌ك ده‌نگی
سابرێن [ مرقه مرق ] مرقه‌ی یه‌ك
له دوای یه‌ك ، [ مرقوهـووڕر ]
مرقه مرقی زۆر .
( مرقه کردن ) مرقاندن .
( مرك ) ل . ئانیشك
( مرکاندن ) مرکه کردن .
( مرکانن ) مرکاندن .
( مرکه ) مرقه ، [ مرکه‌مرك ]
مرقه مرق ، [ مرکوهوورر ] مرقه
مرقی زۆر .
( مرکه‌کردن ) مرکاندن .
(مرمرك) ز . جۆره مێشووله‌یه‌که
( مرن ) ز . مردن .
( مرو ) ز . پیاو .
( مروار ) جۆره ئاوێکی روونه
وه‌ك مرواریی ، ئه‌چێته ناوپه‌رده‌ی
چاوی هێندێ که‌سه‌وه‌و کوێری ئه‌کا
به‌ڵام به میبل ای‌دان چاوه‌که روون
ئه‌بێته‌وه .
(مرواریی) جۆره به‌ردێکی جوانی
سپی زۆر به نرخه .
( مرۆچه ) هـ . مێرووله .
(مرۆچه کردن) هـ . مێرووله کردنی
ئاوله‌سه‌رئاکر . مێرووله کردنی ئه‌ندام
(مرۆخه) د . مووره‌فه‌ی پشت . مۆخ

( مرۆر ) دانەیەکی رەش باوی تاڵە لە ناو کەنما ئەرروێ .
( مرۆشیان ) د. خورۆشیان .
( مرۆغە ) د. موورەغە .
( مرۆف ) ز. پیاو. خـــزم . نادەمیی .
(مرۆڤاتیی) ز. پیاوەتیی . خزمایەتیی
( مرۆڤایەتی ) با . مرۆڤاتیی .
( مرۆکیی ) ز. پیاوەتیی .
(مرووچەباڵدار) د. مێروولەیەکە کە باڵی لێ روابێ .
( مرووچە رەشە )د. کەلەمێروو،
(مرووچەکردن) د. مرۆچە کردن
•( مرووەت ) وجدان .
( مروێ ) ھ. ھەرمێ .
•( مرەبا ) جۆرە خواردەمەنییەك وەك سێوو ھەڵووژەو کەلێ شتی تر کە لە ناو شیبیلەی شەکرا پەروەردە کرابێ .
(مرەررەشتیی)د. جۆرە مریشکێکی کونجکونجی سەر پچکۆلەی دەنك زلی دررە کە پێی ئەڵێن مریشکی ھیندیی .
( مرەررەشە ) جۆرە مراوییەکی کێوییە . مریشکە رەشە [د] .
(مرەکێفیی) د. مریشکە کێوییی
(مرێبا) با . کەسێکە کە مەرەزە بچێنێ .
( مریچڵە ) ھ . چۆلەکە .
( مریشك ) باڵندەیەکی ماڵییە وەك کەلەشێر بەڵام ئەم ھێلکەکەرە
( مریشکە رەشە ) جۆرە مەلێکی رەشە لەریشۆڵەزلترەوگۆشتی ئەخورێ
( مریشکەشامی ) مرە رەشتیی.
( مریی ) ز . مردوو .
( مرییچە ) ل . مێروولە .
(مرییچەرەشە) د.جۆرە چۆلەکەیەکی پچووکی رەشە .
(مز) کرێ . قوررقوشم. مزر[با].
( مزاژ ) مزەی ئاش .
( مزاش ) مزاژ .
( مزبەر ) کرێکار .
( مزدەر ) کەسێکە کە کرێی شتێك بدا .
( مزر ) شتی مێ خۆش .
(مزراح) پارچە دارێکی لەخەرت دراوی لوت درێژی تەمتەمە تێ براوە مەلالان بە کشتەك ئەی خواێننەوە .

( مزراحێن ) یاریی کردن بەمزراح
( مزراویلکە ) با . مزرۆکە ،
( مزرۆکە ) جۆرە چێشتێکە لە هێلکەو ترشاو دروست ئەکرێ .
( مزرەسێو ) سێوی مزر .
( مزرەقیی ) ووتەیەکە هەمیشـە لەگەڵ ووتەی [کوتو] دا بەکاردێنرێ: کوتو [ مزرەقیی ] وانە کوتوپڕ .
( مزریح ) د . مزراح .
( مزکانیی ) د . مزگێنی
( مزکت ) د . مزگەوت .
( مزگەر ) کەسێکە لەمس دەفر دروست بکات .
( مزگەریی ) خەریك بوون بە دروست کردنی دەفری مسەوە .
( مزگەفت ) مزگەوت .
( مزگەوت ) شوێنێکە کەدروست کرابێ هەر بۆنوێژتیاکردنی موسڵمانان
( مزگێنیی ) مژدە . مژدانە .
( مزگیی ) ھ . مزگەوت .
( مزگیینی ) با . مزگێنی .
( مزوانیی ) د . مزگێنیی .
(مزۆکڵە) دەعبایەکی پلپلی چوار پێی ڕەش و زەردە لەمارمێلکە ئەچێ

وەلەئاوی زۆر ساردا ئەبێ .
( مزوور ) نۆکەر . ناوی دێیەکە لەناوچەی ئامێدیی .
( مزووك ) ھ . مارمێلکە
( مزە ) دانەوێڵەیەکە کەئاشەوان لەباراشی هەموکەسێکی گل ئەدانەوە بەرامبەر بەهاررینی .
(مزەگرتن) سەندنی مزەی ئاش .
( مزەمز ) زۆر ڕرنکانەوەی شت.
( مزەمزکەر ). کەسێکە کە زۆر شت بڕرنکێنێتەوە .
( مزەورە ) چێشتی ترشی .
( مزیار ) کرێکار .
( مژ ) قوم : مژێکی لەئاوەکە یا جگەرەکە دا . تەم .
(مژان) دارێکی درێژی ئەستوورە سەرێکی بەندئەکرێ بە[ئێرەق]ەوەو سەرەکەی تری ئەکرێ بە [وێژانبەر] برژانك [ ل ] .
( مژاندن ) ز . مژیین .
( مژانك ) ز . برژانك .
( مژانە ) . مژان .
( مژدانە ) شتێکە پیدەیت بەو کەسەی کەمژدەیەکت ئەدانێ .

( مـژده ) خەبەرێکی خۆش کە پێت بدرێ .
( مژمژ ) د . پارچەیـەکە وەك کەتان بەڵام ئەم تەنکترە .
( مژمژووك ) ز . شانەی هەنگە کەهێشتا کە لووەکانی پرر نەبووبێ لە هەنگوین .
( مژمژە ) قەیسیی [ ز ]. جۆرە پەپوولەیەکی رەشی خررە هەڵاڵەی گوڵ ئەمژێ .
( مژمۆر ) مەردوومی مررومۆچ. مەردومی چاوپررو پووشاوی .
( مژمۆرر ) مژمۆر .
( مژن ) هـ . بێزوو .
( مژۆك ) کاغەزێکی ئەستووری بفەڵە مەرەکەب هەڵ ئەمژێ .گوڵێکی سپی بێ بۆنی درر کاویی بەهاری‌یە[با]
( مژۆڵ ) برژانگ .
( مژوو ) ز . نانی کۆنی تام‌ناخۆش
(مژوول) ز . ئادەمی‌و گیاندارێکە کەبەکارێکەوە خەریك بێ .
( مژوولاهیی ) ز . کارێکە کە مەردوم خۆی پێوە خەریك بکات.
( مژوولبوون ) . خەریکبوون .
(مژوولکرن) ز . خەریك کردن.
( مژە ) گوێرەکەکەنۆ. برژانگ .
( مژەك ) فررۆکی نەفاثە .
( مژیلانك ) با . برژانك .
( مژیین ) هەڵکوشیینی شت بەدەم.
( مژیبوەر ) د . گیایەکی کەڵا ووردە گوڵێکی شـیین ئەگرێ ، لە کەژو کێو ئەرروێ .
( مس ) شتێکە وەك ئاسن بەڵام ئەم سوورە ، مەنجەڵو دەفری تری لێ‌دروسـت ئـەکرێ . وەرگرتن : ( بمسە ) واتە وەری گرە ( هـ ) . بزنی نەخشیین .
( مساسك ) با ، نەقیبزە .
(مساسە ) ئەودارەیە کەسەرێکی پارچـە ئاسـنێکی پانی پێـوەیـەو سەرەکەی تری نەقیبزەیە ، بەسەرە پانەکەی جوتیار کاسـنی پێ پاك ئەکاتەوە وبەسەرەکەی تری کاجووتە کەی پێ لێ ئەخوررێ .
(مسافر) ز . کوررێکە کە هێشتا ژنی نەهێنابێ .
( مسای ) هـ . فێربوون .
(مست) ناوبەری دەستو پەنجە

کانێتی کەبەقوولیی بەیە کەوەبنوسێنرێن

( مستاخ ) ل مشتاخ .

( مستەقا ) جۆرە چێشتێکی کەم ئاوە ، لەسلق یالەسپێناخ یالەهێندێ شتی‌تر دروست ئەکرێ لەگەل گۆشتا.

(مستەکۆلە) دەستێکە پەنجەکانی قووچابێ : مستەکۆلەیەکی پیا مالی .

( مسدان ) ز . دەست هێنان بە نهێم بەسەر شتێکا .

( مسرانیی ) ز . چەن کونێکە لەدارێکا رەشمەی وولاخی پێ ئەبەسترێتەوە .

( مسریی ) با . ئافرەتی لاواز .

. ( مسقال ) ئەندازەیەکی کەمە لە کێشانەی ئالتوون و زیوو هێندێ شتی تر ، بەکار دێنرێ .

( مسقالیی ) جۆرە بلووریی‌یەکی ئەستوورە .

( مسك ) میسك .

(مسکە) جۆرە کوللەیەکی بۆری شلشلە .

( مسکیی ) لیمۆی ترش . جۆرە ترێ‌یەکە .

( مسگەر ) مزگەر .

( مسکەریی ) مزگەریی .

( موسلمان ) کەسێکە کە لەسەر ئایینی پێغەمبەری ئیسلام بێ .

( مشار ) ئاسنێکی دەمپانی کلك دارینی دانەدارە،داری پێ دائەهێنرێ.

( مشارە ) جۆرە ماسیی‌یەکە لە پەنا گوێچکەیا ئێسقانێکی بررگە بررگەی پێوەیە شتی پێ بریندار ئەکات. ئەندازەیەکە لەزەویی .

( مشت ) مست، شتی پرر (ز).

( مشتا ) د . مشتاخ .

(مشتاخ) شوێنێکە کەترێی لەسەر هەل بخرێ بۆ ووشکبوونەوەی .

( مشتاخنانەوە ) ترێ هەلخستن لەسەر زەویی‌یەکی تایبەتی بۆ بوونی بەمێووژ .

( مشتاخە ) ز . مشتاخ .

( مشتاك ) ز . تەختەیەکی پانە ئاردی پێ کۆئەکرێتەوە لەدەوروبەری بەرداش .

( مشتکردن ) ز . پرر کردن .

( مشتلێکرتن ) نیشان گرتن لە شتێك بۆ پێکانی .

( مشتن ) ز . مالیین بەکەسك

( مشتو درەوش ) بریتی‌یە لەدەمقا لی‌یەکی سەخت لەناو دوو کەسا : مشتو درەوشی چیتانە .
( مشتومرر ) دەمقالیی دووکەس لەسەر کارێك یا قسەیەك .
(مشتوو) دەسکی خەنجەرو کێردو چەقۆ .
( مشتوومال ) زاخاو دانەوەو پاك کردنەوەی خەنجەر وشێروچەقۆ .
( مشتە ) ئاسنێکی سەرپانی قنگ باریکی قورسە ، کلاشکەرو چەرم درو پەرزو چەرمی پێ ئەکوتنەوە .
( مشتەکۆل ) د . مشتەکۆلە .
( مشتەکۆلە ) مستەکۆلە .
( مشتبیلە ) دەستەدوو .
( مشك ) دەعبایەکی پچکۆلەی چوارپێی کلك باریکە ، دیوارو ناومال کون ئەکات .
( مشککرە ) بالندەیەکی گۆشت خۆری چنگ‌زەردی قاچ کورتەناتوانێ لەسەرزەویی‌راوبکات بەلکو بەحەواوە ئەیکات .
( مشکولیی ) ز . پێلووی چاو .
(مشکەخۆرە) د. جۆرە جانەوەرێکە راوی مشك‌و مار ئەکا بۆ خوارن .
( مشکەکۆرە ) مشکە کوێرە .
( مشکە کوێرە ) جۆرە مشکێکی کێویی کلك کولە ، لەمشکی مالی گەورەترە .
( مشکیی ) رەشتیی . خۆلەمێش .
(مشن)گیاندارێکە کەزۆر بەشێنێ .
(مشوور خواردن) بەتەنگەوە بوون بۆ شتێك‌و هەولدان بۆ پێك هێنان‌و راپەرراندنی .
(مشوور خۆر) کەسێکە کەبەتەنگ شتێکەوەبێ‌و هەولی بۆ بدا .
( مشە ) جۆرە دەنگێکە لەلووتی گیاندارەوە دێ ، [ مشەمش ] مشەی یەك لەدوای یەك ، [ مش‌وەوورر ] مشەمشی زۆر . زۆریی‌شت : ئەمسال ترێ [ مشـە ] یە ، واتـە زۆرە . دەردێکی کوشندەیە تووشی ئێستر ئەبێ ( د ) .
(مشەخت) ز . کەسێکە کەلەبەر چەپۆکی رۆزگار نیشتمانی بەجێ هێشتبێ .
( مشەما ) مشەما .
( مشەما ) تەنراوێکە کەمۆم یا

لاستیکی لێدرابێ کەئاو دانەدا .
(مشەمەر) زۆر : ئیمسال هەنجیر مشەمەرە .
( مفت ) شتی خۆررایی .
( مفتخۆر ) کەسێکە کەبەشوێن شتی خۆررایی‌دا بگەڕێ .
( مفته ) مفت .
( مفته خۆر ) مفت خۆر .
( مفتەگیی ) د . خۆررایی .
(مفسك) با. سوزکیی‌شت پالاوتن.
( مقاش ) مەقاش .
( مقام ) ئاوازی تایبەتیی بۆهەموو جۆرە گۆرانی‌یەك .
( مقامبێژ ) مقامزان .
( مقامزان ) کەسێکە کەمقامی گۆرانی باش بزانێ .
( مقاندن ) مرقاندن .
( مقانن ) مقاندن .
( مقاو ) دەردێکە تووشی وولاخی یەك سم ئەبێ وەك هەلامەت وایە بۆ مەردوم .
( مقکردن ) د . خۆکییف کردن.
(مقۆمقۆ) مشتوو مرری چەن کەسێك لەسەر شتێك .

( مقه ) د . مرقه ، [ مقەمق ] مرقه مرق .
( مقەبیا ) کاغەزێکی ئەستووری توێ توێی رەقە ئەکرێ بەبەرگی کتێب .
( مقەست ) مەقەست .
( مقەسته ) مەقەسته .
( مقەووا ) د . مقەبیا .
( مکاره ) ز . ئەسکەنە .
( مل ) لەچەناکە بەرەو خوار تا ئێسقانی چۆلەمە . شان ( با ) .
( مڵ ) شتێکی زۆر وورده کەلە بەر ووردیی کولۆ کولۆ بوەستێ . ملە [ د ] .
( ملاز ) د . مەلاس .
( ملاشك ) د . مەلاشوو
( ملاك ) کەوچك .
(ملاککردن) بریتی‌یە لەچەشتنی خواردەمەنیی : ملاکی ناکەیت .
( ملانه ) زۆرانی بەربەرەکانی‌و رقەبەریی .
( ملانێ ) زۆران .
(ملیان) بریتی‌یە لەمەردومی کەوج
( ملپێچ ) پارچەیەکی تایبەتی‌یە

لەسەرمادا ئەمل ئەپێچرێ .
( ملت ) د . ملتە .
(ملتاف) ز . نەخۆشیی قورس وگران.
( ملتە )خلتەی لینجی ناوشتی تەرر
( ملچ )د . ملچە .
( ملچاندن ) ملچە کردن
( ملچانن ) د . ملچاندن
( ملچۆك ) ملچیوك .
( ملچە ) دەنگی دەم لەکاتی شت خواردنا ، [ملچەملچ] ملچەی یەك لەدوای یەك [ ملچوهوورر] ملچە ملچی زۆر .
( ملچیوك ) کلچیوك .
( ملدان ) بریتی یە لەکوێڕایەڵیی و فەرمانبەر داریی .
( ملرراکیشان ) ملدان .
( ملشکاندن ) بریتی یە لەرۆینی یەکێك لەشوێنێك ، ئەم ووتەیە بۆ سووکیی ئەووترێ. بریتی یە لەخواردنی شتێك بەزۆریی : فیسار کەس شەش کولێرەی ( ملشکان ) .
( ملشۆرر ) سەرشۆرر [ ملشۆرر کردن ] سەرشۆرر کردن .
( ملشۆرریی ) سەرشۆرریی .
( ملق لێدان ) مرق لێدان .
( ملکانە ) بەشی خاوەن زەوی لەکشت و کاڵ .
( ملکەچ ) بریتی یە لەفەرمانبەری گوێ ررایەڵ .
( ملکەچیی ) فەرمانبەریی و گوێ ررایەڵیی .
( مل لەچەقۆ هەڵسوون ) بریتی یە لەخۆخستنە گێژاوو مەترسی یەوە .
( مل لەموو بارییکتر ) گەردن لەموو بارییکتر .
( مل لینان ) دەست کردن بە کارێك و مانەوەی لەسەری .
( ململانە ) ملەملە کردن .
( ململانێ ) ململانە .
( ملنان ) سەرداخستن و رۆین بە رێگایەکا بەبێ ئاوورردانەوە .
( ملنیان ) د . ملنان .
( ملۆ ) ل . کوللە .
( ملوان ) ملییوان .
( ملوانکە ) شتێکە بۆ جوانی بکرێتە مل .
( ملوانە ) ملوانکە .
( ملۆچە ) د . ملووچە .

( ملزره ) د . میرووله .
( ملۆزم ) کەسێکه مەردومتووشی زیان بکات .
( ملوموچ ) مررو مووچ .
(ملومووش) کەرران‌و مووشه کردن بەشوێن خواردن‌دا .
( ملۆمە ) ه . ئیرکی ناوەرراستی دەستاوری خوارو .
( ملوچه‌کردن )ئەزیین‌و میرووله کردنی ئەندام .
( مل وورر ) د . ملهورر .
( ملوەن ) د . ملوانکه .
٠( ملوێن ) هەزار هەزار .
( ملوێنك ) . ملوانکه .
٠( ملوێنەر ) که سێکه به ملوێن دارایی بێ .
٠( ملوێنێر ) ملوێنەر .
( مله ) لوتکەی سەر کردو شاخ .
( مله ) دەعبایەکی چنگ چنکه لەناو زەویی نمدارا رەگی سەوزایی ئەخوا . مشك ( ه ) .
( مله‌تاتکێ ) د . سەرەتاتکێ .
( مله‌چۆچه ) مله‌قۆته .
( مله‌خرره ) دەردێکه بەمل ئەکا لەئاستی قورر قورراکه ئەی‌ئاوسێنێ
( مله‌خرێ ) مله‌خرره .
( مله‌زەن ) د . چەردە .
( مله‌قوته ) مله‌قوتێ .
(مله‌قۆته) ملی باڵندەی سەربررا .
( مله قوتێ ) مل درێژ کردن و سەرخوار کردنەوە بۆ وورد بوونەوەو تەماشا کردنی شتێك .
( مله قۆرته ) مله قۆته .
( مله‌کا ) ه . مله .
( مله‌کۆ ) جۆره خشڵێکه لەزێرر وەك تەزبیحێکی د نك کەوره وایه ژنان ئەیکەنه ملیان .
( مله‌کەوێ ) ماله‌وێنچه .
( مله‌ما ) د. دەستکردنه ملی‌یەك
( مله‌ما ) کەلوکونی شت کەبای پیا بچێ : [مله‌ما] ی برریی واته کونبرری کرد .
( مله‌ماسێ ) د . مله‌خرره .
(مله‌مله‌کردن) بەرامبەریی کردن‌و بەرهەڵست‌وەستانی‌یەکێك بۆیەکێکی تر: [مله‌مله]م لەکەڵامه‌که . مسابقه
( مله‌نییر ) لبادی مله‌کا ، که له ژێر نییرەوه دائەنرێ .

( ملەوانە ) ملوانکە .

(ملهورر) زەلامی مل ئەستووری کەتە

( ملەوێچە ) مالەوێنچە .

( ملهیب ) ز. شەن .

•( ملیار ) هەزار ملیۆن

( ملیای ) هـ . رۆیشتن .

( ملێ ملێ ) د . مله مله .

•( ملیۆن ) ملوێن .

•( ملیونەر ) ملوێنەر .

( ملیۆنێر ) ملوێنێر .

( ملییوان ) جێگای مل لەکالادا

( من ) ووتەیەکە قسەکەر بەکاری دێنێ بۆ دەلالەتکردن لەسەرخۆی . مەنی پێوان .

• (منارە) پایەیەکی بەرزی قووچی گردی کەمەرە داری پێ پیلکەدارە بانگی لەسەر ئەدرێ .

(منال) کەسێکە تەمەنی نەگەیشتبێتە پانزە سال . رۆلە .

(منالانە) گوفتار یا کردار یاشتێکی ترە کەلەهی منال بچێ .

(منالبازارر) شوێنێکە کەهەر منالو کوررو کالی تێ چررابێ .

( منالبوون ) زانی ئافرەت .

( منالدار ) کە سێکە کە منالی ووردی بێ .

( منالدان ) ئەوشوێنەیە لەناوسکی مێیینەدا کەمنالی تیا بەرهەم دێ .

( منالۆچکە ) منالی پچکۆلانە . بریتی یە لە کەسێك کەبەتەمەن گەورەو بەکردەوە منال بێ : تۆ [منالۆچکە] یت وورررك ئەگرییت .

( منالومەزن ) کۆمەلێك کەتێکەلاو بێ لەمنالو گەورەی هیچو پووچ

( منالەبەر ) ئافرەتێکە کە منالی شیرە خۆرەی بەبەرەوەبێ .

( منالە وورتکە ) کۆمەلی منال.

( منالیی ) تەمەنێکە کە مەردوم تیا منال بێ .

( منامنا ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ بۆ شتی ئاشکرای نمایان . [ منامنا ] شتەکە دیارە کەچی بەدوویائەگەررێ.

( منتك ) نمتك .

( منجل ) پەلەیەکە لەهێندێ دەفر پەیائەبێ بەهۆی ترش تێ کردنیەوە : ئەم مەنجەلە [ منجل منجل ] بووە.

( منجە ) قسەکردن بە اووت و بە خاوە خاو . [منجەمنج] منجەی

یەك لە دوای یەك .
( مندال ) منال .
( مندالآنە ) منالآنە .
( مندالبازارر ) منالبازارر .
( مندالدار ) منالدار .
( مندالدان ) منالدان .
( مندالۆچکە ) منالۆچکە .
( مندالومەزن ) منالومەزن .
( منداڵە وورتکە ) منالە وورتکە
( مندالیی ) منالیی .
( منگ ) کسێکە کە بە لووت قسە بکا .
( منگن ) منگ .
(منکە) دەنگێکە کەلەلووتەوە بێتە دەرەوە ، [ منکە منگ ] منکەی یەك لە دوای یەك .
( منوتۆیی ) دووماڵەکیی [منوتۆیی کردن ] دووماڵەکیی کردن .
•( منەت ) چاکە : منەتم بەسەرا مەکە وانە چاکەم بەسەرا مەکە .
( منە کردن ) منەیی .
( منەمن ) منا منا .
(منەیی) کەرران بە دووی شتێکا بە پەنهانی : [ منەیی ] مەکە .

( منێ منێ ) د . منا منا .
( •و ) ل . من .
(مۆ) پەشتی تەشوێ و پاچ و تەور.
( موبل ) د . شتی ناومال .
( موتابچی ) کەسێکە کە موو لە شانە بداو بیرریسێ وبیکا بەخەرار.
(موتابخانە) شوێنێکە کە موتابچی کاری تیا بکا .
•( موتالآ ) خوێندنەوەی کتێب و لێووردبوونەوەی .
( موتوربە ) متربە .
(موتورفە)مەردومی زۆرجوان حتربە
( مۆتە ) چەمۆلە .
( مۆتەکە ) قورساییەکە لەخەوا ئەکەوێتە سەر ئەندامی مەردوم ناتوانێ جوولەوهاوار بکا تا تەواو بێدار نەبێتەوە
( مۆتیە ) ز . دۆشاو .
( مۆجکاریی ) ئامۆژگاریی .
( مۆچیاریی ) مۆجکاریی .
( مۆچ ) ماچ . مەردومی مۆن .
مۆچیاریی [د] . خەتی سەرپەنجەی دەست .
( مۆچانن ) د . ئامۆژگاریی کردن
( موچرك ) تەزوو .

( موچررکە ) موچررك .

(مۆچك) ز. پێوانەیەکی پچکۆلانەیە

( مۆچکردن ) ماچکردن .

( مۆچکرن ) ز. گوێ خەڤاندنی وولاخ لە ترسانا .

( مۆچکە ) د. ئامۆژکار

( مۆچە ) د. جۆرە گیایەکە وەك سپێناخ ، ئاژاڵ ئەیخوا .

( مۆچیاریی ) د. ئامۆژکاریی

(مۆخ) جۆرە چەورییەکی خەستی بۆرە ، وا لە ناو مێشك و ئێسقانی گیاندارا .

( مۆخدەرهاتن ) بریتییە لە تێپێ پێ کەیشتن و ماندووبونی مەردوم لە شتێکەوە .

( مۆخل ) ز. هێلەك .

( موخورر ) دەموکانە .

( مۆدنە ) شتێکی راستی کوناودەرە لە دار یا لەکارەدا جگەرەی پێ ئەکێشرێ . جێگا دەم لە قلیان

(مۆر)جۆرە رەنگێکە وەك رەنگی گوڵە وەنەوشە . شتێکە ناوی مەردومی لێ هەڵ ئەکەنرێ.مۆرانە[د].مێروولە[د].

(مۆرانە) گیاندارێکی ووردە کەڵو پەلی خوریی و داری گەندەڵ ئەخوا .

( مۆرتك ) مۆرد .

( مۆرخانە ) نقێمی ئەموستیلە .

( مۆرد ) درەختێکەکەڵایەکی بۆن خۆشی هەیە .

( مۆرر ) گیانداری مۆن

(مۆرربونەوە) چاوزەق کردنەوە لە یەکێك بە توورەیی .

( مۆرك ) ناوە بۆ جۆرە ترێیەك .

( مۆرکرن ) مۆرنان بەکاغەزا .

(مورك لە خۆنان) خۆ بەسەنگینو گرانگرتنی یەکێك کە لەخۆیا وانەبێ

( مورکومای ) سەنگینیو گرانی مەردوم

( مۆرە ) شتێکی پچووکی شەش رووەهەرروەی چەن خالێکی پێوەیە ، یاریی تاولەی پێ ئەکرێ . کولوییەکە کە دیواری پێ دروست ئەکرێ [د]. مۆورەغە [د] . مۆورەدار [د] .

( مۆرە بەسەرچوون ) بریتییە لە شتێك کە باوی نەمابێ

(مۆرەقە) جۆرە مورانەیەکە ئەداتە دەغڵ و دانو داروکەلێ شتی تر .

( مۆرە مۆر ) لە بەر خۆوە لۆرە

لۆر کردن .

( مۆرهەلکەن ) کەسێکە کە مۆر هەل بکەنێ

( مۆریان ) ئەسپێ .

( مۆریانە ) مۆریان [د] . مۆرانە

(مۆریی) مسقالیی موورووە. مێروولە[ز].

( مورییشیی ) با . کەنمە بەهارە

( مۆرییلە ) مێرووڵە .

( مۆز ) دەعبایەکێ کەوەلەی یەك رەنگە لە (خەرەنگەز ) پچوو کترە.

چۆلەکەیەکی پچووکی مێشوولە خۆرە.

جۆرە مییوەیەکێ درێژ کۆلەی گەرمیانییە

بە هێشوو ئەیگرێ زەردەوالە [ز].

( مۆزکردن ) رق هەستان و مۆرر بوونەوەی رەشەوولاخ . برێتییە لە رق هەستان و خییش کردنی ئادەمیی .

( مۆزگرتن ) مۆزکردن .

•( مۆزەخانە ) عەنتیکەخانە

( مۆزییك ) ز. پارێن .

( مۆزییقا ) مۆزییقە

(مۆزییقە) ئەئەکەیەکی بۆشە فووی پیائەکرێو دەنگێکی بەرزی لێوەدێ.

(مۆزییقەچیی) کەسێکە کە مۆزییقە لێ بدا .

( مۆزییقە لێدان ) فوو کردن بە بەمۆزییقەدا بەجۆرێك کە دەنگێکی تایبەتی لێوە بێ

( موژدە ) مژدە .

( مۆژگارییی ) ئامۆژگارییی

( مۆژیار ) ئامۆژگار .

( مۆژیارییی ) مۆژگارییی .

•( مۆغازە ) دووکانێکی گەورەیەکە هەموو شتێکی فرۆشتنی تیابێ

( مۆغەرە ) مووورەغە .

(موغەیرییی) کەلەبەرێکە لە دییوار ئاگری تیا ئەکرێ ەوەو لە سەربانەوە دووکەلەکەی دەرئەچێ

( موفت ) مفت .

( موفتخۆر ) مفتخۆر

( موفتە ) مفت .

( موفتەخۆر ) مفتەخۆر

(موفەررك) شتێکی کەمە لەیەکێك یا لە شوێنێکی موبارە ئەوە دەست بکەوێ

( موقرایی ) لێلایی

( موقراییداهاتن ). لێلاییداهاتن

( مۆقك ) ز پشکێ هێزەی .رۆن

(مۆل) شتی گردی کۆمەل. [مۆلبوون] کۆمەلبوون [مۆلکردن] کۆمەل کردن

( مۆلاقه ) مۆلەقه .

( مۆلعوار ن ) مۆلبوون .

(مۆلدان) کۆمەڵ کردن و خرر کردنەوە

(مۆلکه) جێگای مۆلدانی ئاژاڵ .

(مۆله) ر. قورری گیراوە بۆسواغ .

( مۆلەت ) ماوەدان بە ئیش

( مۆلەق ) ئەبلەق .

( مۆلەقبوون ) ئەبلەقبوون و چاو زەق بوونەوە .

( مولەقه ) دارێکی گردە بە قەد مەچەکێك ئەستوورە ، سەری لای خواروی رایەڵی جولاّی پێوەیە ، سەرەکەی تری بە [نەوەرد] ە وەیە

(مولەکردن) ز. سواغدان بەقورر.

( مۆم ) شتێکی درێژ کۆڵەیە لە پلیتەو پیو دروست ئەکرێ و لەجیاتی چرا دائەگیرسێنرێ. میوی هەنگوین

(مۆمدان) شتێکی بنکداری بەرزە مۆمی چرای سەر لەدائەنرێ

( مۆم کەر ) کەسێکە کە هەرمۆمی چرا دروست بکات .

(مۆمنایی ) شتێکە وەك قیر ، لە هێندێ شاخ و ئەشکەوتا دێتە خوارەوە بە قەد بەردا ، خواردنی زۆر باشە بۆ کەسێك کە کلا بێ یا نەیێمێکی پێ کەیشتبێ .

(مۆمیا) جۆرە دەرمانێکی تایبەتی یە ئەکرێتە ناو جەستەو لاشەی مردو وە وە ، دوای پاك کردنەوەی لەهەموو چەوریی و گۆشتێك ، بۆ ئەوەی کە بۆگەن نەکات .

(مۆمیاکاریی) بەکارهێنانی مۆمیا لە جەستەی مردوودابەوجۆرەی کەپێویستە

(مۆمیاکراو) مردوویەکە کە مۆمیا کاریی کرابێ .

( مۆمیینه ) د. مەمەما .

( مۆن ) مەزدومی رووگرژ .

( مۆنیی ) رووگرژیی .

( موو ) شتێکی لووسی بارییکە لەخوریی رەق ترە لەجەستەی هێندێ گیانداراتەرروێ. برینێکیبەناسۆرە لەئەندامی مەزدوم دەردێ . مۆ [د].

( مووبرر ) دەرگاو پەنجەرەیەکە کە زۆر جووت بێ و بانەدا .

( مووتاو ) د.. مووررێس .

( مووچ ) د. باسکی دەست

(مووچاخ)د . سەروپرچیدەستکرد کە ژنی کەچەڵ لەسەری ئەکەن .

(مووچاندن) د. چەماندنەوەی‌شت
( مووچانن ) د. مووچاندن .
( موچاننەوە ) د. چەوتاندنەوە .
( مووچانه ) شتێکه که به مووچه بدرێ .
( مووچررك ) موچررك .
( مووچرركه ) موچرركه .
( مووچنك ) ز. مووکێش .
( مووچه ) جومگەی لای مەچەك. جیبرە . چەن ماڵێکه که لەدێیەك جیابووبنەوە ، وە لەنزییك دێکەوە لەسەر ئاوێك خانوویان کردبێ یا هەواریان هەڵدابێ. بەشێکه لەزەویی که جیا کرابێتەوە بۆکشت‌وکاڵ .
( مووچه خۆر ) کەسێکه که له لایەن‌یەکێکەوە مووچەی‌بۆبررابێتەوە. فەرمانبەریی میریی به ڕۆژانه .
( مووچیا ) د. قولەپێ .
( مووچیاپەوە ) د. چەمیینەوە .
( مووخۆرکه ) برینێکی پچووکه بەسەری منال هەل ئەپەرێ‌و مووی پێوە ناهێلێ .
(موودار) چاوێکه که مووی بێ .
( موودنه ) د. مۆدنه .

( مووده ) ز. پالاوان .
( موور ) گردەداری ئەستوور . بارستەکردنی قورر لەسەریەك به درێژیی تا ئەبێ بەدیوار. بریتی‌یه له ڕۆژووەوان : زبانم به [موور]ه واته بەرۆژووه. سووچ‌و قوژبن[ه] .
( مووررراستەوەبوون ) بریتی‌یه له زۆر توورەبوون .
( مووررێس ) کەسێکه که موو بررێسێ بۆ خەرارو کورییس
( موورك ) د. موروو . مووریی
( موورکەبا ) د. مووررووەبا .
( موورنان ) نیشانەکردنی شتێك بۆ ئەمەی دەستکاریی نەکرێ .
( مووروو ) جۆرە شتێکی خرری کونداره ژنان بەهۆنراوەیی ئەیکەنه ملیان بۆ جوانیی .
( مووروولە ) بەرکۆڵەی جووت . هەموشتێك‌که وەك مورووخرر‌هەڵدرابێ
(مووررووەبا)جۆرە مووروویەکی‌سپی‌یه ژنان‌ئەیکەن به سەریانا بۆ باداریی.
(مووررووەشین) دەرمانێکی تیژی شینی رەقه بۆهێنندێ‌شت بەکاردێنرێ
( مووررووەشینه ) مووررووه شین.

(مووروەکەرانە) کووژەکە کەرانە
(. مووره ) موورك . پەلە پیتکە
(مووره سەنك) ئاسنێك یا بەردێکی
خڕه ، ئەبرێتە ناو [خوانکەوە] بۆ
ئەوەی[بلۆسك]ی لەسەربەسوورڕێتەوەو
خوانکەکە کون نەبێ .
( موورەغە ) تیرەغەی پشت .
(موورێمازیی) بڕبڕەی پشت .
( موورییی ) مۆریی .
( مووز ) ز. زەردەواڵە .
( مووزك ) با . کەوشی سوور.
( مووسایی ) جووڵەکە .
( مووسڵدان ) بەرمووسڵدان .
(مووش)شتێکەلەیاریمووشێنابەریزە
دائەکرێو بەهەڵمات تیێلی تێ ئەکرێ
( مووشانە ) مووشێن .
( مووشکردن ) د. خییشکردن .
( مووشن ) مەردوومی کوتوکوێر .
چلێس .
(مووشە) مووشەکردن: فیسارکەس
هەر خەریکی [ مووشە ] یە .
( مووشەدەمە ) دەمەی ئاسنکەر.
( مووشەك ) چلێس .
( مووشەکردن ) جوستوجۆکردنی
گیاندار بۆ چنینەوەی خواردەمەنی .
(مووشێن) جۆرە یاریی یەکە چەن
مووشێك بە ریز دائەکرێن ، وە لە
ئەنشەوە بەهەڵمات تیێلیان تێ ئەکرێ
هەرچەندێکیان بشەنگێورێن، ئەبرێنەوە
(مووکردن) بریتیی یە لە مەمنوون
بوونی کەسێك بۆشتێك کە لەپێشەوە
وا نیشان بدا کە پێی رازیی نیی یە،
و، لەدڵیشا زۆری پێ خۆش بێ . تیێژیی
تیێغ بەزۆریی بەجۆرێك کەموو بتاشێ
( مووکێش ) مەقاشێکی تایبەتی
پچکۆلەیە ، مووی پێ هەڵ ئەکێشرێ
( مووم ) مۆم .
( موومیی )ز. جۆرە سەرپێچێکی
پیاوانەیە .
( موونك ) ز. جومگەی پەنجە
( مووە ) مۆ . بریینی موو .
( مووەڕرزە ) د. نەخۆشیی یە کە
بەهەرکەسێك بکا مووی هەڵ ئەوەرێ
(مووینە) شتێکە کە مووی زۆربێ
(مووبین)شتێکەلەموودروست کرابێ
( مویش ) ل . مشك .
(مە) پیتی واز پێ هێنان دەنیی ەه:
[مە] کە ، [مە] خۆ . ئیمە .

( مهاردیٚ) ھ . مادەی نان پێوەدان.

( مهان ) ل . ماین .

( مهانە ) بەھانە .

(مەبادا) ووتەیەکە ئەکەوێتەناوەندی دوو ووتارەوە ، هۆیەتی « علیت » ووتاری دوای خۆی بۆ پێش خۆی ئەکەیەنیٚ: درۆمەکە [مەبادا] رووزەرد بییت ، یا بخۆ[مەبادا] برسیت بێیت

(مەبەس) شتێکە کە بتەویٚ ببیٚ.

( مەبەست ) مەبەس .

( مەت) پووری خوشکی باووك .

( مەتارە ) دەفرێکە لە لباد یا لە چەرم ئەگیریٚ و ئاوی تیٚ ئەکریٚ.

( مەتال ) قەلغان .

( مەتر ) میتر .

( مەترسیی ) ترسان لە شتێك کە پەشتا رووی نەدابیٚ: [ مەترسیی ] گرانیی ئەکەم ، واتە بیمی گرانییم هەیە

•( مەترە ) مەتر .

( مەترەبار ) ز. چەرچیی .

•(مەترەلوز) جۆرە تفەنگێکە هەتا فیشەکی بدرێتە بەر ، ئەی تەقێنیٚ

• ( مەترەلوێز ) مەترەلوز

( مەتك ) ز. مەت .

( مەتە ) ئاسنێکی لووت تیژە بە چەرخ یا بەژیٚ کەوان ئەخولێنرێتەوەو داری پیٚ کون ئەکریٚ . مەت .

•(مەتەریز) چەن کونێکە لەقەلاّ دا ئەهێلرێتەوە ، بۆ ئەوەی شەررە تفەنگی لێوە بکریٚ . سەنگەر .

( مەتەفەررەنگیی ) د . برغوو

( مەتەل ) ز. مەتەل .

(مەتەل) ووتارێکی مەبەست گرانی پێچراوەیە،مەردوم لەیەکی ئەپرسنەوە، بۆ بەراووردیی زیرەکیی یەکتریی.

( مەتەل داهێنان ) پرسینەوەی مەتەل لەیەکێك .

( مەتەلۆك ) مەتەلۆکە .

( مەتەلۆکە ) مەتەل .

( مەتەلە ) د. مەتەل .

( مەتیٚ ) ھ . درەوش . مەتیی .

( مەتیە ) د . مەتیی .

( مەتیی ) ھ . پوور .

( مەجرەف ) موورە دارێکە کە بەکاری لەوحو داهێنان بیٚ .

( مەجمەعە ) سینیی پچووك .

( مەجیدیی ) جۆرە هەنجیرێکە [با] .جۆرە دراوێکی زیوینی عوسمانییە

( مەچەك ) بارییکایی دەست .
(مەچەکە)دارێکە سەرێکی ئەبڕێتە
[دۆلیانەوە]بەنی[دایەلکە]ی تێ ئەپێچرێ
(مەچیر) ل . دەزوو .
( مەحچەچە ) خررنووك .
( مەحفیرك ) با . مافوور .
•ز مەحموودیی )جۆرە دراوێکی
زێررینی پانی عوسمانی‌یە .
( مەخابن ) با . بخابن .
( مەختە ) د . پەیمان و بررپار
لە سەر شتێك .
( مەختەر ) ز. مەیتەر .
•( مەخسەرە ) کاڵتەپێ کردن .
•(مەخشەل)ئاگری کرری زۆرخۆش
(مەخشەلان) چەن ئاگرێکی کرری
خۆشە ، کە لەلای یەکەوە بکررێن
( مەخمەر ) قەیفە .
( مەخمەل ) مەخمەر .
(مەخەر) ز.زەویی گەورەی تەخت
(مەخەل) با . ئەوشوێنە سێبەرەیە
کە نیوەرروان مەرروماڵات لەژێریا
کۆئەبنەوە بۆ دۆشین .
( مەدرەب )ز. دارستانی قەدەغە
کراو . زەویی بەراو .

( مەدفیینیی ) با . خۆرشتی پلاو
( مەدەر ) ز . تکا .
( مەدەك ) ز. ماداك .
(مەر) بێل [ز]. مەگەر.
( مەراق ) خەفەتی زۆر بەدەست
شتێکەوە .
(مەراقکردن) خەفەتچوونەسێك .
( مەرال ) ئاسك .
( مەران ) ز. درەختێکە لقەکانی
ئەکرێ بەدار قەنکە .
•( مەرایی ) رووپامایی .
(مەرتاندن) ز. رووشاندنی شتێك.
(مەرج) گرەو. شەرتو پەیمان .
( مەرجان ) جۆرە گیاندارێکی
دەریایی لق لقە وەك درەخت، خۆی
بە بنکی دەریا دا ئەنووسێنێ ، وە
خواردەمەنی وەرئەگرێ پارچەکانی
ئەکرێ بە مووروو .
( مەرحەبە ) پەشتەماڵ .
( مەرد ) پیاوی ئازای جوامێر
( مەرداسەنگ ) مرداسەنگ .
(مەردانە) کرداروگوفتاری پیاوانە
(مەردایەتی) پیاوەتی‌و جوامێریی.
( مەردم ) د . مەردوم .

( مەردوم ) ئادەمیی .
(مەردومازار) زۆرداری ستەمکار
(مەردومازایی)زۆرداریی وستەمکاریی
( مەردە ) ھ . مردوو .
( مەردەن ) ھ . مردن .
( مەردەنگیی ) د. جۆرە کووپەیەکە لە شووشە ، ناوقەدی تۆزێ ئەستوورترە لە سەرو قنگەکەی .
( مەردەمال ) د. دارایی یەکە کە کیـانی لەبەرا نەبێ ، وەك پـارەو کووتال و شتی تری وا .
( مەردەوزیندە ) د. بە شوێنێك ئەڵێن نەبەکاری زیندوو بێو نەبەکاری مردووبێ .
(مەردیی) جوامێریی و پیاوەتی
(مەرر)گیاندارێکی مێ یینەی خوریی داری دووگداری ماڵی یە ، کە پێی نابێتە ساڵی چوارەم . بێل [ با ] ئەشکەوتێکە لەشاخ و کێوکەمەررە کێویی تێ ئەچێ [د] .
( مەررانە ) سەرانەیەکە کە لە لایەن دەوڵەتەوە لەخاوەن [ مەرر ] ئەسێنرێ بەرانبەر بەمەررەکانی .
( مەرربەند ) زنجیرێکی درێژە سەرێکی ئەکرێتە دەستی وولاخەوەو سەرەکەی تری بەزەوییا دائەکوترێ
(مەرربێر) مەررەبێرە . خاکەنازی گەورە [با] .
( مەررك ) با . بێل
(مەررمەرر)جۆرە بەردێکی لووسی سەختی جوانە ئەتاشرێ و پایەو دیواری لێ دروست ئەکرێ .
(مەررمەرروکێ) جۆرە یاری یەکی منالانەیە .
(مەررە) جۆرە ھەنگێکی تەمەڵی کەم بەرھەمە .
( مەرربێرە ) بێرە . کاتێکە کە مەرری تیا ئەھێنرێتەوە بۆ بێرە .
( مەررەسوور ) دەعبایەکی کێویی شاخدارە ، لە ئاسك ئەچێ ، بەلام ئەم نەختێك گەورەترە .
( مەررە کێویی ) مەررەسوور
( مەرریای ) ھ . شکان .
(مەرریی) مەررە کێویی . چاوێکە نە زۆر ڕەش بێو نە زۆر کاڵ بێ .
( مەرز ) ھ . قەراغ و بەرری شت
( مەرزنجۆش ) گیایەکە کوڵێکی کوڵکنی پەمەیێ ئەگرێ ، بۆ ژانە سك جۆشی ئەدرێ و ئەخورێتەوە .

( مەرزوبووم ) زەوی‌وزار .
( مەرزە ) سنوور [ه] . گیایەکی هاوینی‌یە گەلای دریـژکۆلەیە وەك شویت ئەخورێ .
( مەرزەوان ) ئەوانەن کە سنووری خاکێك ئەپارێزن .
( مەرس ) گای بنە . مەردومی زوییری بێ‌دەنگ[مەرس بوون]زوییر بوون [ مەرسکردن ] زوییر کردن .
( مەرغوزار ) د . مێرغوزار .
(مەرکانە) دەفرێکی گلیینی سوورەوە کراوی قوولی دەم زلە .
( مەرك ) مردن .
(مەرکبرریین) کوشتن . بریتی یە لەکردنی کارێك بە چاکیی : وای دروست کردووە [ مەرکی برریوە ]
( مەرککردن بە جەژن ) بریتی‌یە لەئازاردانی یەکێك بە جۆرێکی وا سەخت کە مەرك لەچاویا جەژن‌بێ
( مەرکە ماسیی ) جۆرە زەهرێکە ماسیی پێ‌ئەکوژرێ .
( مەرکە ماهیی ) مەرکە ماسیی .
( مەرکەمووش ) جۆرە زەهرێکی کوشندەیە ئەدرێ بەمشك .

(مەرگەمەلە) مەلەیەکە کەخاوەنەکەی لە خنکان ڕزگار نەکا .
( مەرمەر ) د . مەرمەرر. هەلمات
( مەرمەرییشۆك ) ز . مارمێلکە
( مەرە ) سەغلەتیی و ماندوێتی زۆر : بە [ مەرە ] یەکـت ئەبەم بە هەنگ بێ بلێیت زەهری مارە .
(مەرەز) موویەکی نەرمە بەئەندامی جۆرە بزنێکەوە .
( مەرەزە ) برنجێکی سەوزە کە بەشتا نەدورابێتەوە .
( مەرەس ) رستێکە ئەخرێتە ملی تانجی‌یەوە .
( مەرەك ) ز. کادان .
(مەرەکەب) رەنگێکی‌شلی‌تایبەتی‌یە کاغەزو کتێبی پێ‌ئەنوسرێ .
(مەرەندیی) جۆرەکالەکێکی دریژ کۆلەی کووزکووزە .
( مەرەنیی ) مەرەندیی .
(مەرێس) ز. جوانی‌وتریفەی‌شت
٠( مەزات ) فرۆتنی شت لە ناو چەن مشتری‌یەکا بەزیادکردنی‌نرخی لەلایەن مشتری‌یەکانەوەیەك لەسەریەك
٠( مەزاتخانە ) دەلالخانە .

(مەزاختن) لەناوبردنی شت [ز] • خەرجکردن [با] .
( مەزاق ) گاڵتە .
(مەزاق پێکردن) گاڵتەکردن بەیەکێك
( مەزخاندن ) ز. مەزاختن .
( مەزد ) ز. کڵاورۆژنە .
( مەزرا ) دەشتێکی پانە کە شینایی تیا کرابێ .
( مەزروکە ) ز. مادەی نانکردن
•( مەزرە ) د. کێڵگە ، ئەبێ لە مەزرەعەوە وەرگیرابێ .
( مەزرەقە ) ھ. مەزروکە .
( مەزرێح ) د. مزراح .
( مەزن ) شتی گەورە . پیاوی گەورەی سەرۆك .
( مەزناھیی ) با . گەورەیی .
( مەزند ) مەزن .
•(مەزندە) وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ شتێك کە گومانت تیا بێ : بە مەزندەی من ئەم کارە وایە ، لە «مظنە» ی عەرەبی یەوە وەرگیراوە
( مەزنی ) گەورەیی .
( مەزووکە ) ھ. مارمێلکە .
( مەزە ) خواردەمەنی یەکە کە لە گەڵ ئارەقا بخورێ .
( مەزەبزووتن ) بریتی یە لە ئارەزوو کردن و حەزکردن لە شتێك .
(مەزەدار)خواردنی خۆشی بەتام . قسەی خۆشی بە تام .
( مەزەدان ) کەمێك سوێر خوێ کردن یا ترش کردنی خواردەمەنی یەك : کەمێك [مەزە] ی سوێر یا ترشی چێشتەکە بدە .
( مەژك ) مێشك .
( مەژکلە ) ھ. گیایەکی سەوزە لەبزنە ریشەئەچێ بەکاڵیی ئەخورێ
( مەژکە ) ھ. کاکلەگوێز .
( مەژیی ) مێشك[با] . سەر[ز]
( مەس ) مەست .
( مەساسە ) بێڵەکانی لووت ئاسن • ئاسنێکی دەم پانە کلکێکی داریینی پێوەیە جووتیارلەکاتی جووتا قورری ھەوجارری پێ ئەکررێنێ .
( مەست ) مەردومی سەرخۆش .
بریتی یە لە گیانداری تیروتەسەل .
بریتی یە لە چاوی رەشی جوان .
( مەستبوون ) سەرخۆشبوون .

تیر و تەسەل بوون .

( مەستوور ) سەرخۆش .

( مەستەکیی ) شتێکە وەك بوغورد وایەو تامی خۆشە، لەگەڵ [ئەنیسوون] و [رازیانە]دا ئەهاررێتەوەو ئەدرێ بە منال .

(مەستیی) سەرخۆشیی. تێروتەسەلی

(مەسقەل) شتێکە ژنان دەموچاوی پێ جوان ئەکەن .

( مەسکەت ) خواردەمەنی یەکی خۆشە لەشەکرو ئاردوگوێز دروست ئەکرێ .

(مەسە) پارچە پۆلایەکی لووسی درێژ کۆلەیە ، گۆشت فرۆش کێردی پێ تیژ ئەکاتەوە. خاکەنازی ئاکر [د]

( مەسەب ) ز . شوێنێکە کەوی راویی تیا دائەنرێ بۆ ئەوەی کە بخوێنێ و کەوی تری لێ کۆبێتەوە .

( مەسەکیی ) د . مەستەکیی .

(مەسێ)خاکەنازی ئاکر. ئەستێولك [ه] . ووتەیەکە بەتەوسەوە هێندێ جار لەگوفتوگۆدا بەکار دێنرێ .

( مەسین ) ز . مەسیینە .

( مەسیینە ) لوولێنەیەکی مسیین یا حەوجۆش یا تەنەکەیە .

( مەش ) ه . مێش .

( مەشتە ) جۆرەیەکە بە تەنشت سێ چوار قەد تووتن و تەماتەدا ئەکێشرێ و ئاوی ئەوقەدانەی لێوە ئەدرێ

( مەشفەن ) ز . تاتەشۆر .

(مەشق) نووسیینەوە لەبەر دێرێکی جوان چەن جارێك لەسەر یەك بۆ خەتخۆشیی . کردارێکی تایبەتی یە کە رۆژیی چەن سەعاتێك بەسەربازئەکرێ

( مەشك ) ز . مەشکە .

( مەشکالە ) مەشکۆلەیەکە کە شتی ووشکی تیا دابگیرێ .

( مەشکۆلە ) مەشکەی پچووك .

( مەشکۆلە ) مەشکۆلە .

( مەشکە ) پێستێکی دەرهاتووی خۆشکراوە ماستی تیا ئەژەنرێ .

( مەشکەبررە ) مەشکە دررە .

( مەشکە دررە ) جۆرەکوللەیەکی ژێر باڵ سوورە .

(مەشکەژەن) کەسێکە کەمەشکەبژەنێ

( مەشکەژەندن ) ژەندنی مەشکە بۆ گرتنی کەرە لە ماست .

( مەشکەژەنە ) مەشکەژەنێ .

(مەشکەژەنێ) جۆرە یاریی یەکە چوارپەلی یەکێك ئەگیرێ و بەرز ئەکرێتەوەو وەك مەشکە ئەژەنرێ.
( مەشکەوەڵان ) ناوە بۆمەشکەو ئەو سێپایەی کە لەسەری ئەژەنرێ
( مەشکەی کاووس ) مەشکەی چەرمی مانگا .
( مەشە ) مێش .
( مەشەك ) جۆرە چەکێکە لە زەوییەوە بۆزەویی، وەلە زەوییەوە بۆ ئاسمانو بە پێچەوانەکەشییەوە بەکار دێنرێ [ صاروخ ] .
(مەشیا) ووتەیەکە لەجێی ووتەی [ ئەبوایە ] بەکاردێنرێ .
( مەعاف ) زۆر: فلان شت مەعافە واتە زۆرە .
( مەعلان ) شارەزای بەبەهرە .
( مەعیین ) ز. ماین .
(مەغز) مۆخ : پیاوێکی بێمەغزە واتە بێمێشکە . کاکڵەی گوێز و بادام و هێندێ شتی تر .
(مەغەل) ز. بەچەی مەرر لەدەشتا
(مەڤرەق) جۆرە کانێکە وەك فافۆن، قاپوقاجاخی لێ دروست ئەکرێ .
( مەڤسك ) ز. کەوگیر .
( مەڤەرە ) جۆرە ترێیەکی خررە وەك [ پایزە ] وایە بەڵام ئەم هەر لە هاوینا پێ ئەگات .
( مەڤیژ ) با . مێووژ .
( مەقاش ) ئاسنێکی دوو پەلە ، پشکۆ ئاگری پێ هەڵ ئەگیرێ
( مەقەست ) تیغێکی بررندەی دوو دەمە ، شتی پێ ئەبررێ ومووی پێ ئەقرتێنرێ .
( مەقەستکردن ) هەڵپاچینی موو بەمەقەست: بەرسمێلت [مەقەستکە]
(مەقەستە)غار کردن لەسەر کێررێك بەچەپ. چێرریی لە وێنەی مەقەستا.
( مەقەلە ) جۆرە یارییەکە .
(مەقەلیی) شتێکی پێچکە دارە ، لە زستانا ئاگری تێ ئەکرێ
( مەك ) د. خوێ .
( مەکات ) خەرجێك بوو جاران سالەوساڵ لەسەری هەموو ئاژالێکی گەورە ئەسێنرا بۆدەولەت .
٥( مەکارە ) بەکرەی خەیاتیی . وولاخێکە کەبەکرێ گیرابێ بۆ هەل کرتنی کەلو پەلو شت و مەك .

٠(مەکارەچی) کەسێکە کە مەکارە لێ بخورێ .

٠( مەکر ) نازونووز .

٠( مەکرباز ) نازونووزکەر .

٠( مەکرکەر ) مەکرباز .

(مەکۆ) شتێکی سەروقنگ بارییکە جۆلا لوولەی تێ ئەخاوجۆلایی پێ ئەکا. پەنایەکە دزوجەردەخۆی تیا حەشاربدا

( مەکۆک ) مەکۆی جۆلایی .

( مەکوو ) د . مەکۆی جۆلایی

( مەکووک ) مەکوو .

( مەکووکە ) مەکووک .

( مەکیی ) ھ . خوێ .

٠( مەکیینە ) ماکیینە .

٠( مەکیینەچی ) ماکیینەچی .

( مەگرتی ) با . گییرەم .

( مەگرییجەنیی ) قەیچیی .

( مەگەر ) ووتەیەکە لە دوای ووتەی بوونەوە ئەبوون، وە لەدوای ووتەی نەبوونەوە بوون ئەکەیەنێ : ئیمشەو دێم بۆلات [مەگەر] مییوانم بێ ، واتە ئەگەرمییوانم هاتنایەم ، یا ئیمشەونایەم [مەگەر] مییوانەکانم بڕۆن ، واتە ئەگەر رۆیشتن دێم. تومەز : چوومە لای فیسارکەس ووتیان لێرە نییە [مەگەر] لەژوورەوە بووەوئەوان نەیان زانییەوواتە [تومەز].

( مەگەز ) ل . مێش .

(مەگەزە) د. جۆرە چاوئێشەیەکە

( مەگەس ) مەگەز .

( مەگەن ) د . موقناتییس .

( مەگییرانیی ) بێزووکردنی ژنان

( مەل ) گیانداری باڵدار .

٠(مەلا) خوێندەواری ئایینیی بەرز . ناوکی خەرمان .

( مەڵا ) مەلا .

( مەلابانگان ) کاتی شەبەقدان کە بانگدەر بانگی تیا ئەدا .

( مەلابەزێن ) بریتییە لە کەسێک کە لە هەموو قسەیەکا بەرزە بلێیس بوەستێ .

(مەلاتەقتەقێنە) جۆرە یارییەکە چەن کەسێک بە دوو بەرد ئەیکەن.

( مەلاخۆر) شتێکە کەبەتەواویی هەرزان بووبێ و دەست بکەوێ. شتی حەلاڵ کە لە وانەبێ مەلا بیخوات .

( مەلازادە ) منالی مەلا .

( مەلاس ) شتێکە کە نووسابێ

بە زەوی‌یەوەو مت بووبێ : کاکە خۆی [مەلاس] کردووە [مەلاسبوون] مت‌بوون بەزەوی‌یەوە، [مەلاسکردن] مت کردن .

( مەلاشك ) مەلاشوو .

( مەلاشك ) مەلاشك .

( مەلاشوو ) ئاسمانەی ناودەم . تەپلی‌سەر لە عاستی مەلاشوو .

(مەلاشووکەوتن) دەردێکە تووشی مەردوم ئەبێ مەلاشووی دائەکەوێ‌و بە پەنجە هەلی‌ئەدەنەوە .

( مەلاشووهەلدانەوە ) بە پەنجەی دەست هەلدانەوەی مەلاشووی منالی تازەبوویایەکێك کەمەلاشووی کەوتبێ

( مەلاقیی ) ز. جۆرە هەرمێ‌یەکی پاییزەی گەورەیە .

( مەلاك ) د. مێلاك .

( مەلاککردن ) مێلاککردن .

( مەلامەت ) مەبەست : هاتنت بەم شەوەبێ [ مەلامەت ] نی‌یە .

( مەلاو ) مەلوولاو .

( مەلبەن ) مەلبەند .

( مەلبەند ) ناوچە .

(مەلتییك)ز. جۆرە سێوێکی پاییزەیە

(مەلحەم) جۆرەدەرمانێکی تەرری توندە ئەخرێتە سەربرین . بەری گیایەکی بۆن خۆشە ئەکرێتە ناو نانەوە . جۆرە دارێکی بۆنخۆشی کوێستانی‌یە دار دەستی لێ‌دروست ئەکرێ .

( مالّلا ) مەلا .

( مەلکەنیی ) د . مەرکانە .

( مەلمەل )جۆرە تەنراوێکی تەنکە وەك کرێشەی سەرپۆشی ژنان وایە

( مەلۆ ) چەند باقەیەکی گەورەیە لە شتێك کە بەداس درواێ ، یا بە دەست دەسکەنە کرابێ .

( مەلۆتك ) د. مەلۆتکە .

(مەلۆتکە) منالی ساوای قۆناغە کراو

( مەلوو ) ز. مەلۆ .

( مەلووچك ) د . مەلیچك .

(مەلوولاو) ئارداوێکە هێندێ جار بۆئاژەل ئەکیرێتەوەودەرخواردی ئەدرێ

( مەلوەن ) د. مەلبەند .

( مەلە ) بە ناو ئاوا رۆیشتن و کەوتنە سەر ئاو بەهۆی جوولاندنی پەلوپۆوە . خۆشتن بە ئاو .

(مەلەس) جۆرە پارچەیەکی جوانی

ئاوریشمی لووسە، ژنان ئەیکەن بەکالا
(مەلەسیی) ناوە بۆ جۆرە هەناریك
( مەلەڤان ) ز. مەلەوان .
(مەلەکردن) چوونە ناو ئاوو پەلو پۆ جوولاندن بۆ هاتوچۆ کردن بە سەریا . بریتی‌یە لە چوونە ناوئاوو خۆتیَ هەلکێشانی .
(مەلەکورر) ە . کوللە .
( مەلەکەویی ) ە . مەلەوینچە
( مەلهەم ) د . مەلحەم .
(مەلەوان) کەسێکە کە مەلە بزانیَ
( مەلەوانی ) زانینی مەلە .
( مەلەوینچە ) مالەوینچە .
( مەلیە ) ل . کوللە .
(مەلیچك) د . چۆلەکە .
( مەم ) د . مەمك .
( مەمرومەژیی ) ووتەیەکە بەکار دیَتریَ بۆ ژیانێکی کەم و کووریی وا کە لە ناوەندی ژیان و مردنا بیَ ، واتە نە بە ژیان بژمیَرریَ و نە بە مردن: فیسار کەس [مەمرومەژیی] ئەژیی
( مەمك ) دوو کۆی خرروپرری گۆشتنی سەر بە مۆرن بەسەر سنگی ئافرەتەوە کە منالی بوو شیری تیَ ئەزیَ
( مەمکخواردن ) بریتی‌یە لەشیر خواردنی منال بەدەمنانی بەمەمکەوە
( مەمکخۆر ) منالی شیرەخۆرە .
( مەمکدان ) بریتی‌یە لە شیردان بە منال بەخستنی مەمك بۆناودەمی
( مەمکدەر ) بریتی‌یە لەئافرەتێك کە شیر بدا بە منال .
( مەمککردن ) پەیا بوونی مەمك لە سەرسنگی ئافرەت .
(مەمکۆلە) مەمکی پچکۆلەی جوان
( مەمکە ) مەمك . دوو دەنکە لە تەزبیح کە لە سەر باری پانی کون کرابیَ .
( مەمکەبەند ) شتێکە ئەخریَتە هەردوومەمکەوەو لەپشتەوە ئەبەستریَ بۆ ئەوەی کۆی بکاتەوە .
( مەمکەخۆرە ) منالی بەرمەمکانە.
( مەمکەفەررەنگی ) مەمکێکە لە لاستیك دروست کراوە ، ئەخریَتە دەمی منالی شیرەخۆرەوە بۆژیَر بوونی
( مەملە ) مەمکۆلە
(مەملەدەمیَ) د. منالی شیرەخۆرە
( مەمە ) ووتەیەکە منالی شیرە خۆرە بەمەمکی ئەلیَ .

( مەمۆتێ ) د . مەمكۆلە .
( مەمۆلە ) مەمۆتێ .
(مەمە) مەمك . مەمكەی تەزبیح
( مەمێ ) مەمك .
(مەن) دەفرێكی تایبەتی یە دانەوێلەی پێ ئەپێورێ . سەنگێكی تایبەتی یە . مەنگ . مەند [د] .
(مەنجەل) دەفرێكی مسیینی قوولی لێوداره ، چێشتی تیا لێ ئەنرێ .
(مەنجەلۆك) پا.سەتل.دەستەمەنجەل
(مەنجەلۆكە) مەنجەلی پچووك .
(مەنجەلی هەلم) جۆره مەنجەلێكه له هیچ لایەكەوە هەناسە نادا ، وە لەماوەیەكی كەماهەموو جۆرەخوارده مەنی یەكت بۆ ئەكولێنێ .
•(مەنجەنیق) ئامێر « الـة » ێكه بۆمباو ئاگری پێ فرێ ئەدرێتە ناو دووژمنەوە، لەفارسی یەوە وەرگیراوه
( مەنجێل ) د . مەنجەل .
(مەند) مەنگ . پیتێكه به دوای هەر ناوێكەوە نرا ئەیكا به سیفەتی موشبیهەه : دەولە [ مەند ] بەهره [ مەند ] خێرەو [ مەند ] .
( مەندۆل ) پەندۆلی سەعات .
(مەندۆلە) جۆرە تەنراوێكی ئەستووره ئەكرێ بەكالا. زەنگولەیەكی پچكۆلەیە لەزێرریالەزیپو ئەخرێتە پاوانەی منالەوه
( مەندوونە ) ئەستێرو
(مەندێ) گیایەكە وەك هەلز ئەدرێ به ئاژال و وولاخ .
( مەندیی ) بوونی ئاو به مەنگ. هێدیێتیی و لەسەرخۆیی مەردوم .
( مەندیل ) تەنراوێكی سپی یە له بلووری تەنك تره . دەسەسرر . مێزەرەی سپی .
•(مەنزل) قۆناغێكه كەلێی بخرێ
(مەنزل بەكیی) د. مەنزل و قۆناغ
•(مەنزلگا) شوێنی كاروان لێ خستن
( مەنسووریی ) جۆره نقامێكه .
( مەنقەلە ) مەقەلیی .
( مەنقەلیی ) مەقەلیی .
(مەنگ) ئاوی پەنگاو . مەردومی لەسەرخۆ .
(مەنگۆرر) د . كچی قەدرەی ماوەوه
( مەنگۆلە ) مەندۆلە . زەنگوولە [د] . گولنكە [د] .
( مەنكەل ) د . مەنكەلیی .
(مەنكەلیی) مەقەلیی. پەنجا فلسیی

( مەنگەن ) مەنگەنە .
(مەنگەنە) کیرکەیەکی تایبەتی یە کەلەکاتی جزوبەنداکتێبی پێ ئەگیرێ
(مەنگیی) پەنگاویی ئاو. هێدیێتیو لەسەرخۆیی .
( مەنۆلە ) مەندۆلە .
(مەنەر) نیشانەوسەرو شوێن:فیسار کەس[مەنەر]ی نی یەوانە بێسەروشوێنە
(مەنێ) گیایەکی ترشی بەھاریی بۆنخۆشە وەك شوییت وایە ئەخورێ
( مەنیی ) د . مەنێ .
( مەوج ) پێخەفێکە وەك جاجم، بەلام ئەم لەدەزوو دروست ئەکرێ
(مەودا) تیژبی دەمی تیغ. مەیدان: مەودام بدە .
( مەوێژ ) ز. مێووژ .
( مەوییژ ) مێووژ .
(مەوییژە) د. دەنگێکی رەشباوە بەسەرسوورائەرروانیوناوەکەی سپی یە
( مەھ ) مانگ .
( مەھا ) مێ .
(مەھار) پەتێکە وەك رەشمە، ئەخرێتە لووتی ووشترو وولاخی سەرکێش.
( مەھاربەن ) د. مەھاربەند .

( مەھاربەند ) مەھار .
(مەھارکردن)مەھارخستنەناولووتی وولاخ .
( مەھانە ) بەھانە .
( مەھتاو ) د . مانگەشەو .
( مەھدەر ) ز. تکا .
( مەھدەرچیی ) ز. تکاکەر .
( مەھرکرن ) ز. مارەکردنی ژن
( مەھك ) با . حەیزی ژنان کە ھەموو مانگێك تێی ئەکەوێ .
( مەھمێز ) د . مامزە .
( مەھیر ) ز. دۆکولییو .
( مەھیینیی ) ز. ئێسترەماچە.
( مەی ) مەرر [م] . شەراب . حوشتری مێ [ز] .
( مەیا ) ز . ئێسترە ماچە .
(مەیان)مەیدان.جۆرە ترێ یەکە[ز]
( مەیانە ) دۆستایەتی : فلان و فلانمەیانەیان خۆشە،واتەبەینیان ھەیە
( مەیتەر ) خزمەتکاری وولاخ .
(مەیتەریی) خزمەتکردنی وولاخ.
(مەیخانە) شوێنێکە کە ئارەقی تیا بفرۆشرێ .
( مەیخانەچیی ) ئارەق فرۆش .

(مەیخۆر) کەسێکە کە شەراب بخواتەوە
( مەیخۆش ) مێخۆش .
(مەیفرۆش) کەسێکە کەهەر شەراب بفرۆشێ .
•(مەیدان)دەشتایی و پانایی یەکی گەورە
•(مەیدانبازیی)یاریی کردن لەمەیدانێکا
(مەیداندار) کەسێکە کەلەمەیدانێکا یاریی بکات .
( مەیدانداریی ) مەیدان نانەوە .
( مەیدان نانەوە ) ئامادە کردنی مەیدانێك بۆ یاریی تیاکردن .
(مەیرە )جۆرە پەنیرێکی ووردە وەك سیریژ .
( مەیکوت ) مێکوت .
( مەیمان ) د . میوان .
( مەیمان خانە ) د. میوانخانە
( مەیمانیی ) د . میوانیی .
(مەیموون) گیاندارێکی چوارپێی کلك داری گەرمیانی یە دەستوپێی لە دەستوپێی ئادەمی ئەچێ.میوان .
(مەیموونەوان) کەسێکە کەمەیموون رابگرێ و فێری یاریی بکات
( مەینەت ) تالآو و دەردی سەریی،
(مەینەتی) تالآویی و دەردی سەرێتیی

( مەیین ) توندبوونەوەی شتی شل بە هۆی هەوێن یا سەرماوە .
( مەییو ) شتێکە کە مەیی بێ : وەك ماستی مەییوی لێ‌هاتووە .
(مێ) گیاندارێکە کەنێرنەبێ.مەزر.
( میاو ) میاوە .
(میاواندن) دەست بە میاوە کردنی پشیلە .
( میاوانن ) د. میاواندن .
( میاوە ) دەنگی پشیلە [ میاوە میاو ] میاوەی یەك لەسەر یەك .
( مێباز ) کەسێکە کە حەز لە ژنان بکاو چاوباشقالیان لەگەلا بکات
( مێبازیی ) حەز لە ژنان کردنو چاوباشقالی کردن لەگەلیانا .
(مێتاویی)د. کەپرێکی سەرگیراوە لەبەردەمی خانووی دوو نهۆما دروست ئەکرێ بۆ ئەوەی هاوینان لەسەری بنوون
•(میتر) ئەندازەیەکە کە بریتی یە لە سەد سانتیم .
( مێتکە ) مێتولکە .
( مێتن ) ز. مژیین .
( مێتوکە ) مێتولکە .
(مێتولکە) ئەسپێی ووردی پچووك

( میتێل ) ز. قومامەی دۆشەك .
(میجك)ز.خێرایی و چەسپانیی لەکارا
(میچڕراندن)ز. هەڵ کوڵۆفتنی هەر دوو دەست .
(مێچکە) مێیینەی پچووکی هێندێ گیاندار .
( مێچکە مێچکە ) بەدەوروپشتی یەکێکا هاتن و قسەی نەرم کردن لەگەڵیا بۆ ئەوەی کارێکی پێ بکەیت
(مێچلکە)ز.مەرج کردن لەسەرشتێك
( مێخ ) سنگ .
( مێخزنجیر ) سنگێکی ئاسنە دانەکوترێ و وولاخی پێ ئەبەسترێتەوە
( مێخسندان ) دەزگای ئاسنگەر.
•(مێخلەمە)جۆرە خواردەمەنی یەکە لەرۆن وقیمەوهێلکە دروست ئەکرێ
( مێخۆش ) شتی مزر .
(مێخەك) بەری درەختێکی گەرمیانی یە بۆنی زۆر خۆشە.جۆرە گوڵێکی رەنگاو رەنگی جوانە بۆنی وەك بۆنی مێخەك وایە
( مێخەکبەند ) ملوانکەی مێخەك
( مێخەکە ) جـۆرە دوگمەیەکی رەقە لەدەستوقاچی هێندێ کەس دەردێ
( مێخەکیی ) شتێکە کە رەنگی وەك رەنگی مێخەك وابێ .
( مێر ) با . پیاوی ئازا .
( میرار ) ز. گیانداری مردارەوە بوو ، [ میراربوون ] مرداربوونەوە [ میرارکردن ] مردارکردنەوە .
( مێرانە ) پیاوانە .
( مێرانیی ) با . پیاوەتیی .
( میرتال ) قەڵغان [ز] .
( میرج ) ز. جۆرێکە لەگەنم .
( میرچ ) ز. دەنگی ماچ .
( مێرخاس ) با . پیاوی ئازا .
(مێرخوز)جۆرە ماسیی یەکی شێیەی بارییکە .
(مێرد) هاوسەری ژنی مارە کراو
(مێردترزێنە) جورە مووروویەکە ژنان ئەیکەن بەسەریانا .
(مێردررەوە) دیوارێکە بەبەرزیی گەزونیوێك ئەکرێ بەگردی سەربانا بۆئەوەی ئەگەر ماڵومناڵ لەسەربان نوستن نەبینرێن « ستارە » .
( مێردکردن ) شووکردن .
(مێردەزمە) حۆلی بیابان . بەردە عازەبە [ د ] .
( مێردیی ) پیاوەتیی .

( مێرریان ) هـ . شکان .
(میرزا) یەکێکە کە هەرخوێندنەوەو نووسیین بزانێ .
( مێرغوزار ) چیمەنو سەوزایی
( مێرك ) با . مێر .
( مێرك ) چیمەن .
( مێروچێر ) د . دۆستوبرادەر.
( مێروستان ) هێلانە مێرووله .
( مێروو ) مێرووله . مرۆف [د]
( مێرووچه ) مێرووله .
( مێرووله )گیانلەدارێکی پچووکی سەر زلی قنگ خرری ناوقەد بارێکە .
( مێروولەکردن ) ملووچە کردنی ئەندام بەهۆی سرربوونیەوه . ووردە قولپدانی شتیێشل لەسەر ئاگر لەپێش هاتنە کولیا .
( مێریی ) با . مێرووله .
( میرنشین ) إماره .
( میریی ) حکوومەت .
( مێز ) تەختێکی چوارپێی بەرزە شتی لەسەر دائەنرێ . مێز. باوەش [مێز] یێك دار ، واتە باوەشێك.
( مێزن ) میزن .
( مێزەر ) مەندیلێکی سپی یە کە بەسترابێ بەسەرەوه . سەرپێچ
( مێزەرە ) مێزەر .
( مێزفك ) با . پلوسك .
( مێزیان ) د . میزتن .
( میزتن ) با . میز کردن .
(مێژ)نوێژ[ز] شتیرابوردووی کۆن[د]
( مێژتن ) با . مژیین .
( مێژکرن ) ز . نوێژ کردن .
( مێژکەر ) ز . نوێژ کەر .
( مێژوو ) تأریخ .
( مێژووشناس ) تأریخ زان .
( مێژووڤان ) با مێژووناس .
( مێژووناس ) با . مێژووشناس.
( مێژووناسیی ) با . زانیینیمێژوو
( مێـژوەرد ) جۆرە گیایەکە بۆ ئاژال و وولاّخ باشە .
(مێژەلاّك)مێشکەسەر.لاسكوچلوپۆپی هێشووە ترێ کە دەنکی پێوە نەمابێ
( مێژەلۆك ) مێولاّك
( میساب ) ز. مشتە .
( میساخه ) ز. شـوێنی ئارد له دەوروپشتی بەرداش .
( میساس ) ز. نەقیزە .
( مێش ) گیانداریکی پچـووکی

بالداری خورتم داره .
(مێشان)د.یاریی‌یەکە بەکوێز ئەکرێ
(مێشپەرر) کاتی ررشانەوەی ترێ
( مێش تێدان ) مێش‌مرووکان بە زۆریی لە شتێك .
(مێشررەوێن) چەرمێکی هۆنراوەی پژپژە ئەکرێ بەناوچەوانی وولاخا بۆ ئەوەی بەجوولانەوەی‌مێشی‌لێ‌دوور بکەوێتەوە .
( مێشـقەپاندنەوە ) بریتی یە لە بێ ئیشی یەکێك .
(مێشك) شتێکی سپی چەورە لە ناو کاسەی سەری گیاندارا .
( مێشکوژ ) شتێکی کلك داری دەمپانی کونکونە مێشی پـێ ئەکوژرێ
( مێشکۆلە ) بەشێکە لە مێشك ئەکەوێتە پشتی سەرەوە بۆ لەنگەر راگرتنی لەشی ئادەمیی .
( مێشکرە ) کاغەزێکە دەرمانێکی لینجی پێوەیە مێش ئەکرێ .
( مێش لەدەمی خۆدەرنەکردن ) بریتی‌یە لە کێلیی و بەسزمانیی .
( مێشـلە زەرکۆ ) ه . مێشـــلە زەرکوون .

( مێشلەزەرکوون ) ه . گیایەکی کوێستانی‌یە کەلای وەك ئەرخەوان وایە ، وەك لاولاو بەقەد شتا هەل ئەگەرێ وە بە قەد دار و بەردا ریشە دائەکوتێ ، لاسـکەکەی بە چەن سالێك وا ئەستوور ئەبێ دار جگەرەی لێ‌دروست ئەکرێ .
( مێشن ) چەرمی مەرروبزن کە خۆش کرابێ و رەنـگ نەکرابێ . شتی مێشاویی .
( مێشۆ ) مەردوومی کەلۆر .
( مێشوولە ) دەعبایەکی بالداری زۆر پچووکی بە ئالۆشە .
( مێشە ) بێشە .
(مێشەررەوێ) د . مێش دەرکردن لەبەر بێ ئیشی .
(مێشەرۆ) شوێنێکە کە مێشی زۆر بێ.ناوەبۆدێ‌یەك‌لە هەورامانی‌ئەودیو
( مێشەسـەکانە ) جۆرە مێشێکی پانکەلەی سـوورکاری چنگ چنگە بەهەر شتێکەوە نووسا درەنگ لێ‌ی ئەبێتەوە، وەزۆرتربەسەگەوە ئەنیشێ
( مێشەسپی ) چێرك .
( مێشە قەبریی ) جۆرە مێشێکی

سەوزە لەز.ویی هەڵکەزراودێتەدەرەوە

( مێشەکەرانە ) جۆرە مێشێکی گەورەیە هەر لە وولاخ ئەنیشێ

(مێشەکیرە) د. جۆرە جالجالۆکەیەکە مێش ئەگرێ .

( مێشەڵان ) بێشەڵان .

(مێشەمر) ز. شتێکە کەخاوەنەکەی بەجێی هێشتبێ . شتی فرێ دراو.

( مێشەوش ) ز. نیسك .

( مێشـهەنگ ) جـۆرە هەنگێکی بێ هەنگوینە .

( مێشهەنگوین ) هەنگ .

(مێشێن) جۆرەیاریی یەکە بەمێش ئەکرێ .

( مێڤان ) با . میوان .

( مێڤانیی ) با . میوانیی .

( میقەسوك ) ز. پەڕرە سێلکە

(میقەور)ز. کوولەکەی دریژی ملدار

•( میکرۆب ) گیاندارێکی زۆر ووردییلانەیە بە چاو نابیینرێ .

•(میکرۆسکۆب) هۆکار «الة»ێکە شتی زۆر ووردی پێ بەدیی ئەکرێ

( مێکوت ) دارێکی گردە کلکێکی تێ بڕاوە .

( مێکوتە ) نەخۆشی‌یەکە تووشی منـاڵ ئەبێ زیپکەی سـەرخرر لە ئەندامی پەیا ئەبێ .

(مێکووك) گیای بەلەك . مەکۆی جۆڵایی .

( مێکووکە ) مێکووك .

( مێکەل ) رانی مەڕروبزن .

( مێکەلەوان ) شوان .

•( مێل ) کلچێوك . پایەیەکە بۆ نیشان کردن لە رێ و بانادروست ئەکرێ . جۆرە ئاسنێکی تایبەتی‌یە ئاوی‌لەچاو پێ‌دەرئەهێنرێ . ئەندازەیەکە لە رێ‌وبان کە هەزاروحەوت سەدو شەست یاردە. شتێکی دریژی خرری لووسی قورسـە زۆر خانەی پێ‌ئەکرێ. کێرری راـت : کەواکەی [ مێل مێل ] ە . داری ترازوو.

(میلاق) هەڵاڵە برمە . ترێ‌یەکە لە ژوورێکی نە زۆرساردی نەزۆر گەرما بەپەتێك هەڵواسرابێ بۆئەوەی بەرودوا لەزستانا بخورێ. لالەنگەر

( مێلاقە ) جۆرە گوڵێکی سوورە لە گوڵاڵە سوورە پچووکترە .

( مێلاك ) کەوچك .

(میلاککردن) بریتی‌یە لە چەشتنی خواردەمەنی‌یەك .

( میلکان ) هەوارگە .

(مێلوکلەدان) د. کلچێوك و کلتوور.

( مێلوو ) جۆلانە .

( مێلووره ) مێرووله .

( مێله ) د . مێل .

(مێلەکورکانە) جۆرە کاردوویەکە کەلای وەك کلتوور وایە نێرکێکی هەیە لە کلچێوك ئەچێ .

(مێمل) دوژمنی مەرگبرری شت: پشیله [ مێمل ] ی مشکه ، یا چەقەل [ مێمل ] ی مریشکه .

(مێنکوێین) رەشه وولاخی تازەبەرکەل

( مینکه ) منکه .

(مێنه که) ئەموستیلەیە کە لەشاخی کیانلەبەر دروست ئەکرابێ .

(مێو) درەختی ترێ. تلپەی مەنگوێین. مێ

( مێوان ) میوان .

( مێوانیی ) جۆرێکه لە حەلوای شەکربەلام ئەم کەمێك شله. میوانیی[د]

( مێودان ) مێو کردن

( مێوژیلك ) مێلاك .

(مێوکردن ) هەلسوونی مێوله کشتەك و مشەما .

( مێولاك ) چل و چێوی مێوه کە لە بەهارانا ئەبررێ .

(مێولاکه) مێولاك ناوه بۆرێ‌یەك لە ناوچەی ئاوەت .

(مێولاو) د . دارێکه کە ئەچێته ناو ئاوی نێرکەلەوە .

( مێووررۆن ) جۆرە مەلحەمێکه لە مێووله رۆن دروست ئەکرێ بۆ نەرمبوون ئەدرێ لە دەستوپێی قەلەشاو

( مێووژ ) ترێی ووشك کراو.

( مێووك ) ز. قۆپچەی کالا

( مێوه ) میوه . مێ .

(مێوەمارانە)جۆرێکەلە کالەکەمارانە بەلام ئەخورێ و وەك مێوەتەرزئەهاوێ

( میه ) مێ [ز] . مەرر [با]

(میهرەبان) مەردوومی دل نەرمی خاوەن بەزەیی .

(میهرەبانیی) دلنەرمیی و بەزەیی هاتنەوه بە مەردووما .

( میهرەوان ) د . میهرەبان .

( میهرەوانیی ) د . میهرەبانیی

( مێهڤان ) ز . میوان .

( میهمان ) میوان .

( میهمان بەرریێ کردن ) میوان بەرریێ کردن .

( میهمانخانە ) میوانخانە .
( میهمانداریی ) میوانداریی .
( میهمانیی ) میوانیی .
( میی ) موو .
( میان ) ناوەراستنی شت : لە [ میان ] ی قسەدا قسە مەکە .
(میانفەرش)لا کێشێکی باریکە لە ناوەندی دوولا کێشا راتەخرێ .
( میانە ) میان . شتی ناوونجیی . میانەرش . ناوە بۆ دێیەك لەهەورامان
(میانەرەویی) د . رۆین لە هەموو گوفتارو کردارێکا بە ناوونجی .
(مییت)پەنجەی برای تووتە. موش
( میتك ) قیتکە .
( میتکە ) قیتکە .
( میتۆل ) د . میتك .
( میتۆلە ) د . میتۆل .
( میتێن ) مووشێن .
( میچ ) ئیسقانێکە لە قاچی گیاندارا . بن میچی پان .
( میچلە سەرکرتن )وورك کرتن لەسەر شتێكو لانەدان لێی: لەسەر ئەم ئیشە ئەوەندە [ میچ مەکرە ]
( میچۆلکە ) میچۆلە

(میچۆلە) شتێکە کە خررهەلّدرابێ وەك کەشك ، [میچۆلە کردن] خرر هەلّدانی شت وەك کەشك .
( میچی تومارخانە ) بریتی‌یە لە مەردومی زۆرزانی فێلّباز .
( میچێن ) یاریی کردن بەمیچ .
(میخیی) ناوە بۆ جۆرە ترێیەك.
•( میر ) ووتەیەکە بەکار دێنرێ بۆکەورە : [ میر ]م واتە کەورەم . ناوە بۆ رووبەك . لە میچ لە یاریی [میچێن] دا . دەولّەت .
•(میرات)کەلەپوورێکە کە مردوو بەجێی بێلّێت .
•(میراتبەر) کەسێکە کە میراتی مردووی بەربکەوێ .
•( میراتکر ) میراتبەر .
(میراتکرتن)بەشبردن لەمیراتی‌یەکێك
•(میراتیی) شتێکە کە بەمیرات بەجێ مابێ .
( میراخورر ) کەورەی مەیتەران
(میراف) با . میراو .
(میران) ووتەیەکە لەرووی رێزەوە بە پیاوێکی کەورە ئەووترێ .
•( میرانە ) رەسمێکە بۆ میریی وەر ئەکیرێ .

(میرانیی) با. ناوه بۆجۆرەتر ێ یەك

(میراو) کەسێکە ئە بەشکردن و زیادو کەمکردنی ئاوی بەدەست بێ.

( میرفان ) د. میوان .

( میرفانی ) د. میوانی .

( میرکوت ) با . مێکوت .

( میرگزیرگێ ) د. میروگزیر.

(میرنشین) وولاتێکە کە میرێك بەرێوەی بەرێ .

( میروڤ ) ز. میراو .

( میروگزیر ) یاری یەکی دوو دەستەیی یە،هەردەستەیەی وەستایەکی هەیە ، ئەودەستەیەی کە یاریی یەکە وەر ئەگرێت ئەموستیلە یەك هەل ئەدات ئەبێ بە پشتی دەست بی گرێتەوە ، وە لەسەرپشتی دەستی بەبێ یارمەتی دەستەکەی تری ئەموستیلەکە بجوولێنێت تا ئەیکاتە یەکێك لە پەنجەکانی ، ئنجا ئەگەر کردی یەپەنجەی بالابەرزەی ئەوا ئەبێت بە میر، ئەگینا ئەبێ بەگزیر ، وەستا لەسەر یاریی کردنی خۆی درێژە ئەسێنێت تا ئەموستیلەکەی لە هەل دان ، یا لەکردنە پەنجەیدائەکەوێتە خوارەوە، ئەوجەلەیاریی کەری دووهەم لەودەستەیە یاریی پێ دەکات، کە ئەمیش لەدەستی کەوتە خوارەوە ، ئنجا یاریی کەرێکی سێهەم تا هەمووده ستەی یەکەم ئەیدۆرێنن ئنجا دەستەی دووهەم وەری ئەگرێت، هەر بەو رەنگە .

( میروو ) د . مووروو .

( میرە ) د . گەورەی ئاوایی .

( میرەدێ ) کوێخا [ د ]. ناوی دێ یەکە لەناوچەی وارماوا .

( میرەوانیی )د. میهرەبانیی .

( میریی ) حکومەت .

( میز ) ئاوێکی سوێرە لەچووك وزێی گیاندارەوە دێتە دەرێ .

(میزاو)بریتی یەلەئاوێکی کەم کەبرروا

( میز بەزاندن ) هاتنە دەرەوەی میزی منال و سەرکردنێتی لە دەمی بلوێرەوە لەناو بێشکەدا .

( میزتن ) دادانی دانەوێلەیە بە پال [ بلۆسکە ] دا لە کاتێـکا کە [کێر] شل بووبێتەوە بەجۆرێـك کە دانەی لێ بچێتە خوارەوە بۆناوئاو .

( میزدان ) میزلدان .

( میزکردن ) بەردانەوەی میز.

( میز گیران ) گیرانی میز و نەهاتنە دەرەوەی .
( میزلدان ) توورەکەیەکی بچووکە لەسکی گیانداراا میزی تیاکۆئەبێتەوە.
(میزن)گیاندارێکە کەزووزوومیز بکا
( میزەچرر کێ ) میزە چورر کێ.
(میزەچورر کێ) زووزوومیز کردن بەهۆی ترسان یا سەرما بوونەوە .
(میزەل)ز . کەسێکە کەمیز بکابەخۆیا.
( میژۆك ) ز . بەرخێکە کەهەموو مەررێك بمژێ .
( میژویی ) ه . نیسك .
( میژویین ) ه . نیسکین
( میستن ) میزتن .
( میسمیسك ) با . میزلدان .
( میش ) ل . مشك .
( میل ) مێل .
( میلبازیی ) یاریی کردن بەمیل .
( میلچێوك ) کلچێوك .
( میلدان ) کلدان .
( میلکان ) ل . هەواری زستانە.
( میل لێ دان ) میل کردن بەژێر گلێنەی چاوا بـۆ هێنـانە دەرەوەی ئاوی ناو پەردەکانی .
( میم ) پیتێکە لەپیت وحەوت پیتەی کوردیی . پوور .
( میمار ) ز . برینی موو .
( میمزا ) پوورزا .
( میمك ) پووری خوشکی دایك.
( میمکزا ) پوورزا .
( میمی ) پوور .
( مینا ) کولێـکی هەمە رەنگی جوانە ، بەزەوییدا پەخشان ئەبێتەوە.
شووشە . ووتەیەکە بەکار دێنرێ لە جیاتی ووتەی « وەکوو » .
(مینابەند) شوێنێکە شووشەکاریی زۆری تیاکرابێ .
( میناکاریی ) مینابەند .
( مینالغ ) پارچە میناییەکە کە لە هەموو رەنگ تێکەڵ بووبێ .
(مینەك) کەرێکە لە کاروانا کە ئاووشتومەکی کاروانچی لێ بارئەکرێ
(میوان) کەسێکە کەبێتەلات بۆدیدەنی
( میوانبەررێکردن ) خزمەتی میوان کردن بەباشیی .
(میوانخانە) دیوانخان . ئوتێل .
(میواندار) کەسێکە کەمیوانی زۆربێ

(میوانداریی) میوان راگرتن و باش بەرێ کردنی .
(میوان دا کردن) دامەزراندنی میوان
(میوان راگرتن) میوانداریی .
(میوانیی) بوون بەمیوانی یەکێك: هاتمەلات بە [میوانیی] .
(میوە) بەری هێندێ سەوزایی و بەرزە درەختەوەك کالەك و هەرمێ و ترێ و گەلێ شتی تر

( میوەجات ) میوەهات .
( میوەکەنان ) مانگی تەموز کە سێی و یەك رۆژە .
(میوەهات) کەلێك جۆر لەمیوە .
( مێ یە ) با . مەرر .
( مێ یە ) مێیینەی هێندێ شت: ئەم کەوە [مێ یە] یە .
( مێیینە ) گیانداری مێ .

# پیتی نوون

# ن

( ن ) ئەبێ بە ضمیری متصل بۆ جمعی مخاطب و غائب: ئێوە دەخوێن [ن]، ئەوان دەنووس[ن] ، ئێوە بخوێن[ن]، ئەوان بنووس[ن]. ئەنووسێ بەدوای هێندێ ناوەوە ئەیکا بەصفتی مشبهە : چاك[ن] کولك[ن] وورگ[ن]. ئەبێ بەرا ناوی قسەکەر لەگەل غەیری خۆی «متکلم مع الغیر» وەك [مان] لای هێندێ لە تیرەکانی کورد : ئەسپەکە[ن] هانی، واتە ئەسپەکە [مان] . ئەبێتە پەیوەند «رابطا» لە رستەیەکدا کە کرداری تیا نەبێ: ئەوان پێشمەرگەن .
(نا) پیتی نەفیە بۆ ئێستاوله ما ولا : [نا]خۆم، [نا]رۆم. نەء: [نا] لە وەرامی یەکێکا کەلێت بپرسێت ناخۆیت؟ واتە نەء
(نائومێد) کەسێکە کە ئومێدی بررابێ

لە شتێك .
(نائومێدیی) ئومێد بڕران لەشتێك.
( نابوو ) د. نابووت .
( نابووت )کەسێکە کەدەستمایەی نەمابێ. گیانداری کەمژی پچووك.
(نابووتیی) بێ دەستمایەیی. کەمژیی و پچووکیی .
( نابوود ) نابووت
( نابوویی ) د . نابووتی .
(نابەجا)شتێکە کە لەجێی خۆیا نەبێ
(نابەجایی) شتی نابەجا .
(نابەجێیی) ووتن یا کردنی شتێك کە لە جێی خۆیا نەبێ .
( نابەدڵ ) شتێکە کە لەکانی دل نەیەتە دەرەوە .
( نابەکار ) مەردومی بەدکار .
( نابەکاریی ) بەدکاریی .
(نابەکام) شتی ناکامڵ: ئەم قەزوانە [نابەکام]ە. کەسێکە کەبەئاوات نەگا.
(نابەکامیی) نەگەیشتن بە ئاوات.
(نابەلەد) نەشارەزا .
(نابەلەدیی) نەشارەزایی .
(نابینك)با.جۆرە تیرو کێکی ئەستوورە لەپێشەوە کونکی پێ پان ئەکرێتەوە لە سەرینە،لەپاشا بەتیرو کێکی بارییکتر ئەکرێتەوە بە زان .
( نابینا ) مەردومی کوێر .
( نابینایی ) کوێریی .
(ناپاك)کەسێکە کە دڵ و دەروونی پیس بێ دەربارەی مەردووم .
( ناپاکیی ) دل و دەروون پیسی دەربارەی مەردوم .
(ناپەسەند) مەردوومی ناوەچاخ .
(ناپەسەندیی) ناوەچاخی .
(ناپیاو) نامەرد ،
( ناپیاویی ) نامەردیی .
( ناتار ) د. نادروستی ناپوخت.
( ناتاریی ) د . نادروستیی
( ناتانیین ) د . نەتوانیین .
(ناتر)کەسێکە کەلەحەماماخزمەت بکا
(ناترە)ریزەچیلکەیە کەدائەچەقێنرێ لەسەرخەرمان لەکاتی شەن کردنا ، لە ناوەندی کاودانا ، بۆ ئەوەی کە تێکەڵ نەبن .
( ناتف ) با. پلییتەی دەرمانە کە ئەکرێ بە برینا .
( ناتۆرە ) نەتۆرە .
( ناتۆرەبێژ ) نەتۆرەبێژ .

( ناتەبا ) نارریك .

( ناتەبایی ) نارریكیی .

( ناتەمیز ) شتی پیس و چەپەڵ.

(ناتەمیزیی) پیسیی و چەپەڵیی .

(ناتەوان) مەردومی ئیفادەی بێ هێز.

(ناتەوانیی) ئیفتادەیی و بێ هێزیی .

(ناتەواو) شتێکە کە تەواو نەبووبێ .
بریتی یە لە مەردومی کەم دەست .

(ناتەواویی) بریتی یە لە کەم دەستیی و
هەژاریی .

( ناجۆر ) د. بە دووشت ئەووترێ
کە لەیەك نەچن وە زۆر جیابن لەیەك

( ناجەستە ) شتی نابووتی نالەبار.

( ناجەسە ) د ناجەستە .

(ناچار) کەسێکە کە لەکردن یا
نەکردنی کارێکا بێ دەرەتان بێ .

(ناچاریی) بێ دەرەتانی لە کردن
یا لە نەکردنی کارێکا .

(ناچە) د. کوتێکە کە دانەوێلەی
لێ دێتە خوارێ بۆ گێری ئاش .

(ناچیز) مەردومی ناکەس .

(ناچیزە) ئافرەتی ناکەسی نارەسەن

(ناحەز) کەسێکە کەحەزت لێ نەکا .

( ناحەزیی ) دوژمنایەتی .

(ناخ) ناودەروونی شت: ئاوە کە چوو
بە [ناخ]ی زەویی دا .

( ناخار ) د. ناراست .

( ناخر ) ز. رەووك .

( ناخرتەوان ) ز. ڕۆژی دەهەم
لەکانوونی یەکەم کە وولاخ و ئاژاڵ
لەبەر سەرما ناکرێنە دەرەوە .

( ناخوا ) ناخودا .

( ناخودا ) دارێکی ئەستووری
بەرزە لەناو کەشتی دا. مەردومی ستەمکار.
کەشتی یەوان .

( ناخودایی ) ستەمکاریی .

( ناخۆش ) شتێکە کە دڵ نەیکرێ
نەخۆش .

(ناخۆشیی) بوونی شت بە ناخۆش .
ناکۆکیی : ئەو دوو کەسە [ناخۆشیی]
یانە . نەخۆشیی .

( ناخۆشیین ) نەخۆشیی .

( ناخون ) نینۆك .

(ناخونکردن) ناخونگرتن .

( ناخونگرتن ) د. نینۆك کردن

( ناخونە ) ناخونەك .

(ناخونەك) خواردنی شتی مەردوم
بە هەوانتە . جۆرە دەردێکە لەچاوا
پەیا ئەبێ [د] .

( نادان ) نەزان .

( نادانی ) نەزانی .

(نادروست) شتی نارریکی نالەبار.

( نادروستیی ) نارریکی‌ونالەباریی

( نادوروس ) د نادروست .

( نادوروست ) نادروست .

( نادوروستیی ) نادروستیی .

( نادوروسیی ) د . نادروستیی .

( نادۆل ) د . ناچە .

(نادیار)شتێکەکەلێتەوەدیارنەبێ .

(نادیاریی) دیار نەبوونی‌شت‌لێتەوە

(نادیدە)شتێکەکە نەت‌دیی‌بێ. نادیار

(ناراو) د . جەخاروخەفەت .

( نارجێل ) نەرجیل .

( ناردراو ) نێرراو .

(ناردن)رەوانەکردنی‌شتێك‌بۆشوێنێك

(ناردنەوە) گێررانەوەی‌شتێك کە

نێررابێ بۆت بۆ لای خاوەنی .

( نارراس ) د. نارراست .

(نارراست)مەردوومی‌سەرچەوتی‌درۆزن

(نارراستیی) درۆزنی‌و سەرچەوتی

(نارراسیی) نارراستیی .

( نارراو ) نێرراو .

(ناررەوا)شتی‌ناشایستە. پارەی‌قەلب

(ناررەوان) دەرسێکە کەرەوانت نەبێ

(ناررەوانیی) گیروگرفتی‌لەزانیینی

دەرسا .

(ناررەوایی) ناشایستەیی .

(نارریك)شتی‌خواروخێچ. بریتی‌یە

لەکەسێك کە لێت دڵگیر بێ .

(نارریکیی)خواروخێچیی.بریتی‌یە

لە ناکۆکی دووکەس .

(نارگیل) د. نارجیل .

(نارگیلە) نێرکەلە .

(نارنارۆکە) نارۆکە .

( نارنارۆکێ ) نارۆکە .

( نارنج ) شتێکە وەك پرتەقاڵ

بەڵام ئەم ترشە .

( نارنجۆك ) بۆمبای دەستیی .

( نارنجەك ) نارنجۆك .

(نارنجیی)شتێکەرەنگی‌وەك‌سەرەنگی

نارنج وابێ .

( نارنگیی ) لالەنگی‌یەکە وەك

پرتەقاڵ وابێ .

( نارۆکە ) جۆرە گۆرانی‌یەکە .

( نارەون ) نارەوەند .

( نارەوەند ) دارەوەند .

( نارپاك ) د . نێرراو .

( ناری عەلی ) رەنج و زەحمەتی زۆر: بەهەزارناری عەلی تادۆزییەوە

( نارێی ) جۆرە مقامێکە .

( نارێین ) با . گۆرانیی یەکە کە خەمو خەفەت بێنێ .

( ناز ) خۆفرۆشیی و حۆخۆشەویست کردنی یەکێك لای یەکێك . درەختی سنەوبەر [د] .

( نازار ) نازدار .

( نازاو ) سەوزایی تێراوی پاراو

( نازپەروەر ) نازدار .

(نازدار) کەسێکە کەزۆرخۆشەویست بێو نازی بکێشرێ

(نازداریی) خۆشەویستیی و نازکێشانی یەکێك .

( نازفرۆشتن ) نازکردن .

( نازفرۆشیی ) نازکردن .

(نازك) ناسك . بریتییە لەمەردومی شەرمنی لەسەرخۆ. شتی تەنك .

( نازکردن ) خۆفرۆشیی و خۆ ـ خۆشەویست کردن .

(نازك کار) د. وەستایەکە کە لە کەچکاریی دا نەقشیی جوان بکا .

( نازکەر ) کەسێکە کە نازبکا

( نازکێشان ) نازراگرتنی نازدار

( نازکیی ) بوونی شت بەنازك.

( نازك ) نازك .

( نازناز )جۆرەگوڵێکی هەمەرەنگە هەر بەیانیان ئەکەشێتەوەو کەلاسەوزەکەی وەك پەلپینە وایە .

( نازنامە ) نازناو .

( نازناو ) لەقەب .

( نازونووز ) نازفرۆشتن .

( نازونیوناز ) ناز .

(نازە) د . شوێنی زیندوو لەنیینۆك

( نازەنین ) ئافرەتی زۆرجوان .

( نازێ ) د . نازکەر .

( نازیی ) ز. نازکردن .

(نازیین)خۆهەڵکێشان بەیەکێکەوە: تۆ بە کێوە [ئەنازییت] .

(ناس) شتێکە لە تووتن دروست ئەکرێ وهێندێ کەس لەجیاتی جگەرەکێشان ئەیخاتە ژێرزمانی .

(ناساز) ناخۆش:ئەم ئاوە [ناساز]ە . نەخۆش [ناساز] م واتە نەخۆشم . کەسێکە کە لە گەل یەکێکی تر ناکۆك بێ:فیسارکەس لەگەڵما[ناساز]ە

(ناسازیی)ناخۆشیی.نەخۆشیی. ناکۆکیی

( ناساغ ) نەخۆش .
( ناساغیی ) نەخۆشیی .
( ناساق ) ناساغ .
( ناساقیی ) ناساغیی .
(ناسزا) ناشایستەی نارەوا. بریتی‌یە لەجوێن: [ناسزا]ی پێ‌ووتم، واتە جنێوی پێ‌دام [د] .
(ناسك) شتێکە کەزوولەت بێ. مەردومی شەرمنی لەسەرخۆ. شتی تەنك: پەرداخە کە[ناسك]ە، واتە تەنکە .
(ناسکبوونەوە) پێربوونەوەی ئەندام.
(ناسکرن) ز. ناسین .
(ناسکۆلە) شتی بچکۆلەی ناسك .
(ناسکەنان) جۆرە لەواشەیەکی ناسکی چەورەهەویرە کەی بەرۆن ئەشکێنرێتەوە
(ناسنامە) پارچەکاغەزێکە کەوێنەو ناووشۆرەت و پیشەی‌یەکێکی تیابێ .
(ناسۆر) برینێکە کە درەنگ چاك ببێتەوە: برینەکەی بەناسۆر کەوتووە
(ناسیار) ناسیاو .
(ناسیاریی) ناسیاویی .
(ناسیاك) ناسیاو .
( ناسیاکیی ) ناسیاویی .
( ناسیاو ) ئاشنا .

(ناسیاویی) ئاشنایی و ناسینی‌یەکێك
(ناسین) بینینی شتێك و شارەزاییت لێ‌ی بەرەنگێك کە بۆجارێکی تر جیای بکەیتەوە لەشتی تر .
(ناسینەوە) دووبارە ناسینی شتێك کە لەمەوپێش ناسیبێتت .
( ناشارەزا ) نابەلەد .
(ناشارەزایی) نابەلەدیی .
(ناشایس) د. ناشایستە .
(ناشایستە) شتی بێ‌جێ‌ی نالەبار.
(ناشایسە) د. ناشایستە .
(ناشتا) خالیتیی سك لەبەیانیاندا : بەیانیان بە[ناشتا] جگەرە مەکێشە . خواردەمەنی‌یەکە کە لە سەرسکی ناشتا بخورێ .
(ناشتاکردن) خواردنی نانی سەر لە بەیانی .
(ناشتن) مردووکردن بەژێر گلەوە . درەخت و گوڵ رواندن .
(ناشناس) بێگانەی نەناسراو .
(ناشیتیی) بوونی مەردوم بەناشیی : فلان کەس بە ناشیتی ئەوکارەی کرد
(ناشیرین) شتێکە کە جوان نەبێ .
(ناشیرینیی) بوونی شت بەناشیرین

(ناشیی) مەردومی کوڵیی نەشارەزا لە کاروبەرێکا .
(ناعال) مەردومی ناڵەبار .
(ناعالیی) ناڵەباریی .
(نافك)ز.ناوو کی مەردوم و گیانداری تر
(نافەرمان)مەردومی لاساری گوێ نەگر
(نافەرمانیی)گوێ نەگرتن بۆفەرمان
(نافەك) عاستی ناولنگ لەدەرپێ.
(نافەکبرریین) بڕیتی یە لە ئەتك کردنی یەکێك .
( ناڤ ) ناووك [ز]. ناو [با] .
(ناڤ ئێش) ز. رەوانیی و سکچوون
(ناڤبارك) با. سەلەیەکی پچووکە میوەی تێ ئەکرێ .
(ناڤبرر) با . ناوەندی دووشت .
( ناڤدار ) با . ناودار .
( ناڤك ) با . ناووك .
(ناڤمال) با . ناومال .
( ناڤنج ) با . ناوەند .
( ناڤنجیی ) با . ناوونجیی .
( ناق ) د . قوررگ .
( ناقایل ) نارازیی .
( ناقرر ) ل . بیینەقاقە .
( ناقولا ) شتی نادرێك .

( ناقولچ ) ه . نیوقورچ .
(ناك)ووتەیەکە ئەنرێ بەدوای هێندێ ووتەوە ئەیکا بەصفتی مشبهە : خەم [ناك] ، دەرد [ناك] .
(ناکا)د. ناکاو: فیسار کەس [ناکا] هات واتە لە ناکاوا .
(ناکام) کەسێکە کە بەکام و خواستی خۆی نا گەیشتبێ .
( ناکامیی ) نەگەیشتن بەئاوات.
( ناکاو ) کوتوپرر .
( ناکاویی ) کوتوپرریی
( ناکۆك ) ناساز .
( ناکۆکیی ) ناسازیی .
( ناکولۆکار ) د. شتی ناڵەبار.
( ناکەس ) ناوەجاخ .
( ناکەس بەچە ) ناوەجاخ .
( ناکەسیی ) ناوەجاخیی .
( ناکا ) ناکا .
( ناکزووریی ) نامانکووریی
( ناکونا ) د . بێکوناح .
( ناکوناه ) د . ناکونا .
( ناکەهان ) ناکاو .
(ناڵ)ئاسنێکی پانە بەبزمار ئەدرێ لە

ژێر پەلی وولاخی پەکسم. پاژنەی پێڵاو
(ناڵاندن) هاوار کردنی نەخۆش .
( ناڵانن ) د. ناڵاندن .
(ناڵبەکی)د.دەوری بچووك.ژێر پیاڵە
(ناڵبەند) کەسێکەوولاخ ناڵ بکا.
(ناڵبەندخانە) شوێنێکە کە وولاخی
تیا ناڵ بکرێ .
(ناڵبەندیی)خەریك بوون بە پیشەی
ناڵبەندی یەوە .
(ناڵچە)پارچەئاسنێکی تەنکەئەدرێ
لەژێر پاژنەی قوندەرە .
( ناڵدار ) وولاخی بەکسم .
(ناڵکردن)ناڵدان لە پەلی وولاخ. بریتی یە
لە هەڵ خەڵەتاندنی یەکێك: چاکی ناڵکردم
(ناڵە)دەنگەی بەرزی نەخۆش. [ناڵەناڵ]
ناڵەی یەك لەدوای یەك. دەنگی بەرزی
بەهێزوەك دەنگی تفەنگ : تفەنگەکە
[ناڵەی کرد]یادەمانچەکە[ناڵەی هات]
(ناڵەبار)شتی بێ باری ناقۆڵا. بریتی یە
لەمەردوومی بەدی ساختەچی .
(ناڵەباریی) ناقۆڵایی . بریتی یە لە
سەرچەوتی و ساختەچێتیی .
(ناڵەکردن)ناڵاندنی نەخۆش .ئەقیین و
دەنگدانەوەی شت بەبەرزیی .

(ناڵەکیی) د. پاژنەی کەوش .
( ناڵیین ) ناڵاندن .
(نام)ناو.ووتەیەکەوەك ووتەی پابەکار
دێنرێ بۆدووداییی لەناوەندی دووشتا :
ئەوتارمایی یە[نام]زەلامە[نام]وولاخە
(ناماقووڵیی) قسەی بێ جێی دوور
لە ژیریی .
(نامانکووریی) نەدارایی .
(نامدار)مەردومی کەورەی ناودار.
( نامراد ) ناکام .
( نامرادیی ) ناکامیی .
( نامۆ ) غەریب .
( نامۆیی ) بێ خەویی و بێ کەیفی یە کە
کە لە رانەهاتنی شوێنێك پەیابێ .
غەریبیی : فیسار کەس نامۆیی ئەکات
وانەهەست بە غەریبی ئەکات .
( نامە ) کاغەزێکی نووسراوە کە
بۆ یەکێك بنێررێ .
(نامەبەر) کەسێکە کاغەزبکەیەنێ
بەم و بەو .
(نامەبەریی) پۆستەچێتی .
(نامەخانە) شوێنێکی تایبەتی یە کە
کتێبی زۆرت تیا دانابێ .«مکتبە»
(نامەخوا) ووتەیە کە بەکار دێنرێ

لەجیاتی ووتەی [ماشاءاللە] .
( نامەد ) د . بەدبەخت .
( نامەدیی ) د . بەدبەختیی .
( نامەرد ) مەردومی ناپیاو .
( نامەردیی ) ناپیاویی .
(نامیلکە) کتێبی پچووکی چەن پەرەیی
( نامییدە ) شتی بەناوبانگ .
( نامییە ) نامییدە .
(نان)هەویرێکە کە پان کرابێتەوەو بەساجیابەتەنووربرژێنرابێ . پیتێکە بەدوای هێندێ ناوەوەئەنووسێ ئەیکا بە کارەمصدرە:دا[نان]،ناو[نان]. چەقاندن وناشتنی شت: ئەمامەکان [بنێ] .
( نانبدە ) کەسێکە کە نان زۆر بدا بە مەردوم .
(نانبدەیی)نان دان بەمەردوم بەزۆریی
(نانبرێشك)دارێکی درێژ کۆلەی لووت تیژەنانی لەسەرساج پێ وەرئەگێررێ
( نانپێژ ) ز. نان پێوەدەر .
(نانپێوەدان)نان برژاندن بەتەنوور.
(نانپێوەدەر) کەسێکە کەنان بەپارە ببرژێنێت .
(نانچایی) د. جۆرە کێکێکە بۆبەر چایی ئەکرێ .

(نانخوا) د. جۆرە زیپرەیەکە .
(نانخورشت) د. پێخۆر .
( ناندار ) ناندەر .
(ناندان) بەخشیینی نان بە مەردوم بە خۆرایی .
( ناندەر ) نانبدە .
( ناندێن ) نانگێن .
( نانکردن ) نان برژاندن .
( نانکردنەوە ) پان کردنەوەی نان بە تیرۆك .
(نانکوێر) کوێرنان .
(نانکەر) کەسێکە نان بکاتەوە .
( نانکەرەوە ) کەسێکە کە نان بە تیرۆك پان بکاتەوە .
(نانگیر) ز. زەوییەکە کە گەنم و جۆی باش بهێنێ .
(نانگێن) دەفرێکی گەورەیە کەنانی تیریی تیاهەڵ ئەچنرێ .
(نانووخ) ناخون .
(نانوویی)د.نانێکە کەلەماڵی بووکەوە ئەچێ بۆماڵی زاواتاسێ رۆژ .
(نانەبەرە)پارچەپەرۆیەکی گەورەیە ربیوارنانی رێگای تێ ئەخا .
(نانەپاڵ) بوختانکردن بۆیەکێك و

شتێکی ناشرین دانەپاڵی .
(نانەررەق)نانی ووشکەوەبوو.
( نانەررەقە ) نانەررەق .
(نانەسکیی) ئیێش کردن بۆ یەکێك بەرامبەر بەنان خواردن وهیچی تر .
( نانەشان ) سەلە .
( نانەشانە) نانەشان .
(نانەشوێن) بریتی یە لە دوا خستنی قسەیەك بەشوێن یەکێکا: قسەی خراپ مەنێرە [شوێنم] .
(نانەقەیسیی)قەیسیی زۆرگەییوەکە بە تییرۆك پانکرابێتەوە وەك نان .
( نانەلەم ) د. نانەسکیی .
(نانەمریچلە) ه. کولێرەچەورە .
(نانەمل) بریتی یە لە وەی کەشتێك بخەیتە ئەستۆی یەکێك و بەسەریا ساغ کەیتەوە: دینارەکەت [نایەملم] واتە لەسەرت کردم بە ماڵ .
(نانەوا) کەسێکە کەنان و کولێرەو لەواشە دروست بکا بۆفرۆتن .
(نانەواخانە) شوێنێکە کەنانەوانانی تیا بیرژێنێ .
(نانەوایی) خەریییك بوون بە نان پێوەدانەوە .

(نانەوە)ئامادەو سازکردنی ئاش . ساز کردنی داوو تەڵە : داوەکە یا تەڵەکەی[ناوەتەوە]. دۆزینەوەو بنە کردنی شتێك لە شوێنێك بۆ دزیین : دزەکەماڵەکەی[ناوەتەوە]. هێلکەنانە ژێرمریشکەبەکرر،بۆهەڵهێنانی .
(نانەیەك ) تێکبردنی چەن شتێك بە ناو یەکا .
( نانی نانیی ) بریتی یە لە مەردومی کوێر نان .
(ناو)إسمێکە کەبۆشتێك دانرابێ تا بەو إسمەئەوشتە بناسرێ. لۆکەیەکی کراوەیەکەخرابێتە دوو توێی لێفەوکاڵاوە کاکلە؛کوێزەکەیابادامەکە[ناو]ی نی یە. نێی ئاش[ه].سواغ[ه]. پیێتی ظرفیتە: فررۆك بە[ناو]باداوماسیی بە[ناو] ئاوا ئەرروا.ناوی دێ یەکەلەهەورامان.
(ناواخن) شتێکە کە ئاخنرابێتەدوو توێی شتێکی ترەوە .
(ناوازە) ناوودداو .
( ناوان ) ناوەند .
( ناوبار ) سەربار .
(ناوبانگ)شۆرەت و ناورۆیشتنی شتێك
(ناوبانگدەرکردن) بڵاو بوونەوەی

ناوو شۆرەتی یەکێك یاشتێك .
( ناوبانگ سەندن ) ناو دەر کردن
( ناوبجی ) د. ناوبژیی .
(ناوبراو) شتێکە کەناوی هاتبێ .
(ناوبردن) باسکردنی شتێك .
(ناوبررە)تەیمانێکە کە لە ناوەڕراستی
زوورێکا کرابێ بۆئەوەی کەببێ بە
دوو ژوور .
( ناوبریاك ) د. ناوبراو .
( ناوبرێشك ) نان برێشك .
(ناوبژەکردن) لەشیرە پابوونەوەی
وولاخو رەشە وولاخ .
(ناوبژیی) کەوتنە ناوەندی دوو کەس
کە بە کژیەکاچووبن تا ئاشتیان بکەن .
[ناوبژیی کردن] ناوبژیی .
(ناوبژییکەر) کەسێکە کە ناوبژیی
بکا لە ناوەندی دووکەسا .
(ناوبگییر)د.ناوبردن: [ناوبگییر]ی کە
واتە ناوی بەرە .
( ناوبەناو ) ووتەیەکە بەکاردێنرێ
بۆشوێن یاکاتی پچرر پچرر : [ناوبەناو]
وەرەلام،یانەمامەکان[ناوبەناو] بنێژە.
( ناوپا ) د. ناوکەل .
(ناوپارە)خانوویەکە کە هەموولایەکی
لەناو خانووی ترابێ .
( ناوپشتە ) بنەچە .
(ناوپەل) ناوەندی دوو پەلی درەخت
.ناوەندی هەردووسمی رەشە وولاخ.
(ناوپەنچك) پەردەیەکی گۆشتیینە
لەناوەندی سیوجکەرو ناوسکا .
(ناوتا) ناوبار .
(ناوتاق)پەتێکەئەخرێتەقوڵفی جەوا
لەوە لەتەمو وەکەیەوە بۆ بەندکردنی
بەسەرووولاخەوە .
(ناوتوێل) د. ناوچەوان .
(ناوتێلانە) د. جیازیی بووك .
(ناو جەرگە) ناوپارە . ناوەراست :
لە[ناوجەرگە]ی شەڕرەکەدا بوو.
(ناوجەژنان) مانگی ذي القعده .
(ناوجیی) د. ناوبژیی .
(ناوجییکەر) د. ناو بژییکەر .
(ناوچاو) ناوچەوان .
(ناوچاوان ) ناوچەوان .
(ناوچاوپاك) پیاوی چاکی پاکی
ناوچەوان روون . بەختیار [د] .
(ناوچاوترش) بریتییە لە مەردومی
روو گرژ .
(ناوچاوترشاو) ناوچاوترش

( ناوچاودێز ) بریتی یە لە مەردومی مۆنی بەد .

(ناوچاورۆشن)د. ناوچەوان ڕوون .

(ناوچە) ناحیەیەکە کەمودیری تیا دابنیشێ. مەڵبەند. ناچە[د] .

(ناوچەدار) قائم‌مقام .

(ناوچەوان) تەختایی ژوورەهەردووبرۆ

( ناوچەوان بەیەکادان ) بریتی یە لە تووڕەبوون .

(ناوچەوانپاك) ناوچاوپاك .

(ناوچەواندێز) ناوچاودێز .

(ناوچەوانڕوون) ناوچەوان پاك .

( ناوچەوان قۆقز ) بریتی یە لە مەردومی بەدبەخت .

(ناوچەوانقەشقە) ناوچەوان قۆقز .

(ناوچەوانکرژ) ناوچاوترش ،[ناو چەوان کرژکردن]ڕوو کرژکردن

(ناوچیین کردن) کردنەوەی کەلای ناوەڕاستی تووتن .

(ناوخۆ)ناو کۆمەڵێکی گەورەیاپچووك: لەئێران شتێك ڕوویداوەلەناوخۆیا،یالە ماڵی فلان کەس ئاژاوەیەك کەوتۆتە ناو خۆیانەوە «داخلی» .

(ناوخوا) نامەخوا [د] .

(ناوخوان) جێی دانیشتن لەزیین. ناوەبۆناوچەیەك لە [شلێر] .

(ناوخویین) ل. ناخون .

(ناودار) کەسێکە کە ناوبانگی ڕۆیبێ. شتێکە کەناواخنی بێ: کەوای [ناودار]، کفتەی[ناودار].

(ناودان) د. پلووسك .

( ناودۆك ) دۆژەنك .

(ناودەرکردن)ناوبانگ دەرچوونی کەسێك یا شتێك .

( ناودەس ) د. ناودەست .

(ناودەست) بەری لەپی دەست .

(ناودێر)کەسێکە کەناوی لەناوناوانا بێ: یاخواهەر [ناودێر] بیبێت .

( ناورانەوە ) پاررانەوە .

( ناورراست ) د . ناوەڕراست.

( ناوزڕران )ناودەرکردن بەخراپی

(ناوزیین) جۆی دانیشتن لەزیین.

(ناوساجیی)جۆرەکولێرەیەکەلەناو ڕۆنا سوورئەکرێتەوە .

( ناوسێلیی ) ناوساجیی .

( ناوسێلی ) ناوسێل .

(ناوشان) ناوەندی هەردوشان .

(ناوفەرش)میانفەرش.چەرمێکی پانە

لەناوپێڵاودا رائەخرێ .
(ناوقەد) کەمەری شتێك کە باڵای بێ
(ناوکار) رییزەخشت و بەردێکە کە
لە ناوچیینی دییوارا دائەنرێ.راستە
تەرییبێکە کەلە کاڵائەدرێ .
(ناوکردن) تێپەرربوون و لەچاو وون
بوونی‌شت: کەرویشکە کە[ناوی کرد] .
(ناوکز) ناوکزل. هاوبەش «شریك».
( ناوکزل ) ناوبار .
(ناوکوێر بوونەوە) بریتی‌یە لەمردن و
نەمانی ناوونیشانی یەکێك .
(ناوکۆیی) شراکەت: ئەمخانووە[ناو
کۆیی] مانە،واتەشراکەتمانە .
(ناوکە) بەردێکەچلێك کیا[چەقچەقە]ی
پێوەئەپێچرێ وخەرمانی بەسەرائەبێژرێتە
وە بۆ پیێتوبەرەکەت . ناووك .
(ناوکەبرر) کچێکە کەلەکاتی بوون و
ناووك بررینیا درابێ بە کورێك .
(ناوکەبررانە) سەرناوکانە .
(ناوکەبررە) ناوکەبرر .
(ناوکەخوشە) د.ناوکی بەری درەخت
کەلەخۆیاشیرین وخۆش بێ .
(ناوکەررەشە) د. ناوکەرریژ.
(ناوکەرریژ) ووڵاخێکە کە پشتی
لەئاستی ناوکی برینیدار بووبێ بەهۆی
کرتنی باریازیینیاکورتانەوە ، [ناوکە
ریژ بوون] برینیدار بوونی پشتی ووڵاخ
بەهۆی کرتنی بارەوە .
( ناوکەرێش ) ناوکەرریژ .
( ناوکەف ) چەرمێکە ئەخرێتە
ناوپێڵاوەوە .
( ناووکی بووکێ ) جۆرە کولێکە
پەررەکانی بەناوا ئەچێ .
(ناوکێش) جۆکەیەکە لەناوەراستی
قالبی‌مەرەزەدا رائەکێشرێ لە کاتی
ئاوکەمبوونابۆئەوەی کەتیر بەتیر ئەم
بەرو ئەوبەری ئاوی پێبدرێ .
( ناوکل ) د. ناوکەل .
( ناوکولاڵانە ) تۆیانە .
(ناوکەرە) د. کاکلە.شتێکەلەناوەندی
دووشتا کە لەیەکیان جیا بکاتەوە .
( ناوگەل ) ناولنگ .
( ناوگیر ) ناوبگیر .
( ناوگین ) ناوەرراست
( ناولنگ ) ناوکەل .
( ناولنکان ) تاوە .
( ناولەپ ) بەری دەست .
(ناولەپان) ناوپەلی درەخت .

( ناولەقان ) د . ناولەپان .
(ناولێزان)ناوی خراپ‌زان لەیەکێك
( ناومال ) شتومەکی مال . ژووری
تازووخه . ناوکه‌شیەدەی هێندێ پێیت:
[ناومالی] جێیمەکه یانونه‌کەجوانه .
بریتی‌یه له ناوزێی وولاخ .
( ناومشت ) د . ناولەپ .
( ناونان )دانانی ناوێکی تایبه‌تی بۆ
منالێکی تازه‌بوویابۆشتێکی تر.
( ناوناو ) ناوبه‌ناو .
(ناونووس) بریتی‌یه له‌تعیینی شت .
نووسینی ناوی کەلێ شت به‌تێکرایی:
فیسار کەس چووه بۆ [ناونووس] ، [ناو
نووسکردن] ناونووس .
( ناونیان ) د . ناونان .
(ناونێرك)دوژەنك نێرکی هەمووشتێك
(ناونێرۆك) د. ناوەخۆرەی درەخت.
نێرەژن [د] .
(ناونیشان) نیشانه‌هەلدانی شتێك .
ناو دیارکردنێکه که له پشتی پاکەت
ئەنووسرێ بۆئەوەی کەبکا بەخاوەنی
« عنوان » .
( ناونیشانه ) ناونیشان .
(ناوودناو)شۆرەت‌وناوداریی: فیسار
کەس پیاوەتی‌یەکی کردووە بە [ ناوو
داو] بکێرر ریتەوه .
(ناووك)دەمارێکه‌له‌ناوەراستی‌سکی
کیاندارا ساوا لەسکی دایکا له وەوه
خواردن‌وەرئەگرێ.کاکلەی گوێزو بادام
وقەزوان‌وشتی تر.دەنکی رەقی‌ناوخورماو
هەلووژەوهێندێ‌شتی‌تر.مەرکەزی‌دائره
( ناوکبرر ) کەسێکه که ناوکی
منال ببررێ .
(ناووکبرریێ) برڕینی ناووکی‌منال و
کرێ‌دانی له‌کاتی‌لەدایك‌بوونیا .
(ناووك کەوتن) وەرگەررانی دەماری
ناووك .
( ناووك کرتنەوه ) هێنانەوه جێی
دەماری‌ناووك.بریتی‌یەلەهەل‌خەلەتاندنی
یەکێك: چاك ناوکی کرتمەوه
(ناوکەخۆشه)د. ناوکی قەیسی‌یەکه
که تال‌نەبێ .
(ناوکەررەشه)د.جۆرەنەخۆشی‌یەکه
(ناووك) د. ناوکیین .
(ناوونجیبی) شتی‌مام‌ناوەندیی .
(ناووەتۆره)ناوی‌ناشیرینێ‌نان‌لەیەکێك
(ناوونیشان) ناونیشان .
(ناوونیشانه) ناونیشانه .

(ناووەردە) ریزەدرووماتیکە لە کالادا

(ناوە) د. شتێکە لە تەختەدروست

ئەکرێ، بنکەکەی تەسك وسەرەکەی والاە

قووری پێ ئەکێشرێ. برنجی چواردانکو

( ناوهانیین ) ناوهێنان .

(ناوهاووردن) ناوهێنان .

(ناوەبەرە) دارێکی پچووکە ئەخرێتە

ناوەرراستی [ وێژانبەر]ەوە بۆ ئەوەی کە

[کاینجە] ئەمدیو ئەودیو نەکا. رراپەلی

تەیمانی چەپەر .

(ناوەجاخ) مەردومی نارەسەن

(ناوەجاخیی) نارەسەنیی .

(ناوەخت) بێوەخت .

(ناوەرراست) ناوەندی شت بەرەنگێك

کە لەهەموولایەکەوە چون یەك دوور بێ.

(ناوەرۆك) کرۆکی شت .

(ناوەرۆکە) ناوەرۆك .

(ناوەسار) د. ئەو بەردانەیە کە بۆ ئاش

هەل ئەبەسترێ بۆ ئەوەی تەنوورەی لێ

دروست بکرێ، یانیی پێوە بنرێ .

(ناوەسەر) پارچەیەکە لە دەسمالی

سەری ژن کە ئەکەوێتە پشتی سەریەوە.

(ناوەسەرە) ناوەسەر .

(ناوەشکێنە) ناسکەنان . ووتووی

گەرم هێنان بەسەر [رۆژ]ی کالادا بۆ

ماتکردنی .

(ناوەکوتە) جۆرە نەخۆشی یەکە تووشی

مەرروبزن ئەبێ .

(ناوەکێش) د. ئەو کرێکارەیەکە

[ناوە] ئەخاتەسەرشانی .

(ناوەند) ناوەرراست .

(ناوەندیار) کەسێکە بکەوێتە ناوەندی

دوو کەسەوە بۆ رێکخستنیان «وسیط»

(ناوەندیاریی) کەوتنە ناوەندی دوو

کەسەوە بۆرێکخستنیان «وساطە» .

( ناوەندێتیی ) میانەرەویی لە

هەموو شتێکا .

(ناوەندیی) بەهەموو شتێك ئەووترێ

کە لەناوەندی دووشتابێ .

(ناوەوە) ناوەرۆك وناوشت: ئاژاڵە کە

لە ناوەوەیە یا لە دەرەوەیە .

( ناوهێنان ) ناوبردن .

( ناوێرە ) ناوازە .

( ناوێژ ) کەرکەلەوان .

( ناوێن ) د. سواخ .

( ناوێنەوە ) د. سواخدان .

(ناهاڵ) د. ناقۆلای ناعال .

(ناهلییك) با . دۆشەك .

(ناهومێ) د . ناهومێد .

(ناهومێد) ناکام .

( ناهومێدیی ) ناکامیی .

(ناهەموار) شتی خراپی نالەبار .

(ناهەمواریی) خراپیو نالەباریی.

( ناهەنجار ) نەگونجان .

( ناهەنجاریی ) نەگونجانی .

( نای ) شمشال .

(نایاب)شتی زۆر چاکی هەڵکەوتوو.

(نایاب بێژیی) بدیع .

(نایافت) نایاب .

(نایژەن) شمشال ژەن .

( نایەب ) نایاب .

(نایەسیین)نەکران. نەسووتان: ئاگرە کە نایەسێ،واتە ناکرێ یاناسووتێ.

(نتم) هێمنیو لەسەرخۆیی .

(نچونال) د. ناڵەونکە .

(نچە)ووردەنکەو ناڵەیەکی سووکە کە لە نەخۆشی یەکی سووکەوە پەیا بێ، (نچەنچ)نچەی یەك لەدوای یەك

(نچەتا) لەش داهێزران بە تایەکی سووکەوە .

( نخافتن ) با . داپۆشیین .

(نخریی)ز. نۆبەرەی منال چ نێرچ مێ.

(نخوریی) ز. نخریی .

(نخۆشەر) هـ . لەتکە نۆك .

( نخون ) نوخون .

( نخوون ) نخون .

( نخە ) نۆك .

( نرتونوێ )شتی زۆر تازەی نوێ .

( نرخ ) قیمەتی شت .

( نرخبرریین ) نرخ دانان .

( نرخدار ) شتی بە نرخ .

( نرخدانان ).دانانی نرخی شت لەلایەن دەولەتەوە .

( نرخە ) د. لرخە .

(نرقە)د.نرکە،[نرقەنرق]نرکەنرك

(نرکاندن) نرکەکردن .

( نرکانن ) نرکاندن .

(نرکە)جۆرە دەنگێکی قەبەی بەرزە لەسنگەوە دێتە دەرەوە[نرکەنرك]نرکەی یەك لەدوای یەك، [نرکوهوورر] نرکە نرکی زۆر .

(نزا) پاررانەوە .

( نزاخوان ) دوعاگۆ .

(نزار) شوێنی نسێ لەشاخ .

( نزانیی ) مزگێنی .

(نزاو)د شتی کەیبو.نزییك [هـ] .

(نزبە) با. رەزی تازە پیکەیشتووی دیلم
(نزدیك) نزیك .
(نزدیکایی) نزیکایی .
(نزدیکبوونەوە) نزیکبوونەوە .
(نزدیك خستنەوە) نزیك خستنەوە
(نزدیك کردنەوە) نزیك کردنەوە .
(نزدیك کەوتنەوە) نزیك کەوتنەوە
(نزدیکیی) نزیکیی .
(نزرکە) جێکایەکە پیاوچاکێك تیا دانیشتبێ ونیشانە کرابێ
(نزك) د. ژیان و زیندەکانی .
( نزکرە ) نزکەرە .
(نزکەرە) جۆرەدەنکێکەهێندێ جار لەناوسنگی مەردوومەوە پەیانەبێ وتەکانی پێ ئەدا .
( نزم ) شتی نەویی .
( نزمان ) شوێنی نزم .
(نزمایی) عاستی شوێنی نزم .
(نزمبوونەوە) نزیك بوونەوەی شتێکی بەرز لە زەویی .
(نزوولە) نالەی خەفەتبار .
(نزوولە) د. نزوولە .
(نزیك) شتێکە کەلێتەوە دوورنەبێ
(نزیکایی) کانی زۆر نزیك .
عاستی نزیکی شت .
(نزیکبوونەوە) نزیك کەوتنەوە .
(نزیك خستنەوە) نزیك کردنەوە.
(نزیك کردنەوە) هێنانە بەرەوەی شتێك .
(نزیك کەوتنەوە) هاتنە بەرەوەی شتێکی دوور .
(نزیکیی) بوونی شت بە نزیك .
(نژدار) ز. پەزشکێکە کە نەشتەر کاریی بکا « جراح » .
(نژدە) با. دەستەی چەتە «عصابە»
(نژاندن) ز. پرر کردن .
( نژنین ) ز. پرر بوون .
( نژیی ) با . نیسك .
( نسار ) نسرم .
( نسرم ) شوێنێکە کە هەتاوی تێ نەکەوێ .
(نسك) د. نزك. مەردوومی پەرێشان. هەژار. نیسك .
(نسکۆ) نووچبردن بە توندیی.
(نسکوناهومێ) د. نکوناهومێد .
(نسکە) د . هەنسك [نسکەنسك] هەنسکی یەك لە دوای یەك .
( نسکەرە ) د . نزکەرە .

( نسیٚ ) نسرم .

( نسێو ) د. قەزاوقەدەر .

(نسیه)د. زەمینی کەم بررشت.

( نش ) ز. کوتوپرر .

(نشتەر) د. نەشتەر .

( نشتن ) د . نیشتن .

(نشمس) د. نوشوست .

( نشك ) ز. نش .

(نشکێفه)ز. شتی کوتوپرری .

(نشینـکه) ئەو وولاتەیە کەتۆتیا دا ئەنیشییت بە ئیجکاریی .

( نشۆف ) ز. نشێویی .

(نشێو) نزمایی ناودۆل و دەرە .

( نشێویی ) سەرەولێژیی .

(نشییف)نشۆف[ز]. دەستەراست « جنوب » [با] .

( نشییفیی ) با . نشێویی .

(نشییمەن) شوێنێکە کە لەوا نەبێ تیا دابنیشییت .

(نشییمەنگا) د. نشییمەن .

(نشیین) د. دانیشتن. شانشیین .

( نغرۆ ) نوغرۆ .

(نفت)د.شتی نوێ:نفت و نوێ یە .

( نفتك ) ز. کفتك .

( نفتونوێ ) نرتونوێ .

(نفر) ز. نزای خراپ لەیەکێك .

( نفریین ) نفر[ز] نەفریین [د]

( نفسیی ) ز. جاوی ئاوەرویس.

(نفش)ز.نەتەوە:ئەمە [نفش]ی تۆیە واتە نەتەوەی تۆیە .

(نفوورات) نەفوورات .

(نقانمن) نواندن .

(نفرشت) ز. نوشتە .

(نفز) ز. نزم .

(نفستن) ز. نوستن .

(نفیژ) با . نوێژ .

(نفیسار) با . نوسراو .

(نفیستن) با . نفستن .

(نفیسیین) با . نووسیین .

(نفیین) ز. نوێن .

(نقار) زوییریی و دلگیریی .

(نقام) مقامی گۆرانی .

( نقاندن ) نقە کردن .

( نقانن ) نقاندن .

( نقم ) نقوم .

(نقن) د. کەسێکە کە هەربنقێنێ

(نقوجرر) نقەنق کردن بەدەست شتێکی قورسەوە .

(نقه)دەنگێکە لەهێز بە خۆدانەوە

پەیانەبێ، [نقەنق] نقەی یەك لەدوای یەك [نق وهووڕر] نقەنقی زۆر .

(نقێم) جۆرە بەردێکی بەنرخەبۆ جوانیی ئەخرێتەئەموستیلەو گوارەو شتی ترەوە .

( نقیم ) د . نقێم .

(نك) دەنووك [ل]. ووتەیەکە بەمعنی [لەکن] ز.

( نکاندن ) نکە کردن .

( نکانن ) نکاندن .

(نکل) ز. دەنووکی باڵندە .

(نکن) د. کەسێکە کە هەر بنکێنێ

(نکونال) نکەو ناڵەی نەخۆش .

(نکوناڵە) نکونال .

(نکوناهومێ) د. نکو ناهومێد .

(نکوناهومێد) کەسێکە کە بەتەواویی ناهومێد بووبێ لە شتێك .

(نکە) ناڵەیەکی سووکە لەنەخۆشەوە دێ، [نکەنك] نکەی یەك لەدوای یەك، [نکوهووڕر] نکەنکی زۆر .

(نگادار) د. پاسەوان و چاودێر .

(نگاداریی) پاسەوانی .

( نگار ) وێنەو دروشمی شت . دلبەری جوان .

(نگاهێشتن) پارێزگاریی و ئاگاداریی کردنی شتێك: وەك چاو [نگای دێلم] .

(نگم) د. نوقوم ، [نگمبوون] نوقوم بوون، [نگم کردن] نوقوم کردن.

(نگمەسار) د. نوقمەسار .

( نگین ) بەختو ئامەد. نقێم .

(نم) شێو تەڕیی .

(نما) نوێژ [ه] . ووتەیەکە بەدوای هێندێ ووتەوە ئەنووسێ ئەیکا بەکار کەر «اسمی فاعل»: باڵا [نما] قیبلە [نما] ، واتە باڵاو قیبلە پیشاندەر .

( نماز ) نوێژ .

( نمانا ) د. نموونە .

(نماندن) با. نەرم کردنەوەی شتێك بەهۆی خستنە ئاوەوە .

(نماو) د. ئاوێکە کە لە ناوەندی پێستو کورۆکی دارو درەختو سەوزاییدا بێ

( نماویی ) نمدار .

(نمایان) شتی ئاشکرا .

( نمایش ) نمایشت .

(نمایشت) خۆپیشاندان .

(نمایشتگا) شوێنێکە کە مەردوم خۆی تیا پیشان بدا «مسرح» «معرض» .

( نمایشگا ) نمایشتگا .

(نمتك) نم و تەرریی یە کە کەلە شتێك بێتە دەرێ: گۆزە کە [نمتك] زادا .

(نمدار) شتی شێ دار.

(نمدان) دەلاندنی شت: گزۆە کە [نم ئەدا] . تەرر کردنی شتێك بە کەمیی: سۆاغە کە [نمدە] ئنجا هێلەساوی کە .

( نمدەر ) ل. دۆشەکلە

• (نمرە) ژمارەیەکی تایبەتی یە لەسەر هێندێ شت دائەنرێ: بۆریەی چراکە سێ [نمرە] یە .

( نموود ) بریتی یە لە نرخ و رێز: فلان کەس نموودی نی یە، یا بێ نموودە، واتە بێ نرخەلەناو کۆمەڵدا .

(نموونە) شتێکی کەم لەشتێکی زۆر کە چۆنێتی شتەزۆرە کەنیشان بدا لە چاکیو خراپی : لەوێچێك نموونەی خەروارێکە .

( نمە ) بارانی وورد .

( نمەد ) لباد .

(نمەدزین) لبادێکەئەخرێتەژێر زین بۆ ئەوەی کە پشتیوولاخ برینداز نەبێ.

(نمەدمال) کەسێکە کە نمەدبسوێتەوە

(نمەك) ل. خوێ .

(نمەك بەحەرام) بەدنمەك .

(نمەك دان) خوێ دان .

(نمەك کردن) بریتی یە لەخواردنی نانی یەکێك و لەپێش چاوبوونی پیاوەتی ئەویە کەلەبەرئەونانەی : [ نمەکم کردووی ] هەرگیز خراپەت نالێم.

(نمەك کردوو) کەسێکە کە نمەکی کردبێت .

(نمەك کێر) کەسێکەکێرۆدەی نمەکی یەکێك بووبێ لەبەرخراپەکردن لەگەڵیا

(نمەکێن) مەردومی خوێن گەرم .

( نو ) نەء .

(نۆ) ناوە بۆ ژمارەیەك کە لە ناوەندی هەشتودەدایە . نوێ . نەء [ز] .

( نوء ) ز. نەء .

(نوارریین) تەماشا کردن .

(نواڵە) نۆزر دوو. قولێك لەدەغلی دروێنە کراو . بەستەیەك لەکەڵای کراوە. جێگای نەرمان لەچیا.

(نواڵە کردن) پێچانەوەی شت .

(نواندن) نیشاندانی شتێك بە یەکێك. خەو لێخستنی منال .

( نوانن ) نواندن .

•( نۆبە ) نۆرە .

(نۆبەبرر) کەسێکە کە نۆبەت لێ

داگیر بکات .
•(نوبەبرریی) داگیر کردنی نۆرەی یەکێك لە شتێکاکەنۆرەی هابێ .
( نۆبەتێ ) نۆرەتا .
(نۆبەتێدار) کەسێکەکەنۆرەتابیگرێ
•(نۆبەچیی) ئێشکچیی .
(نۆبەخت) د . کەسێکە کە تازە بەخت رووی تێ کردبێ .
(نۆبەخش) یەکەبجارچاوپۆشییکردن لەتاوانێك ئەبجارە[نۆبەخش]ت بێ .
(نۆبەدار) با . پاسەوان .
( نۆبەر ) د . نۆبەرە .
(نۆبەرە)میبرەیەکە کەتازە پێ بکاو یەکەبجار بخورێ.یەکەمیین منالێکە کە ئافرەت بیبێ .
(نۆبەرەکردن)خواردنی میبوەیەکی تازەپێ کەیشتویەکەبجار.
(نۆبەن) نۆبەند .
•(نۆبەگرتن)گرتنی نۆرەلە شتێکا .
(نۆبەند) گوێرەکەی دووساڵەی نێر
(نۆپێچکە) منالێکی ساوایە کە تازە کەوتبێتە سەرپێ .
( نۆت ) با . ئەوەد .
( نۆتە ) د . پاشەکەوت .
(نۆتەکردن) د. پاشەکەوتی کردن

(نۆتەکەر) د . کەسێکە کە شت پاشەکەوت بکا .
(نوجەژن)یەکەمیین جەژنەکە بەسەر مردنی مردوویەکا بررواو .
(نوچکەبردن) نووچبردن .
(نۆچکەدان) نووچدان .
(نۆچوان) د. ئەوجەوان .
(نۆچە) د. ئەوجەوان .
(نوخانن) د. نوخنکردنەوەی شت.
(نوخاننەوە) د. نوخن کردنەوە .
( نوختە ) نقطە .
(نوختەوخال)د.ئارایشی رووی ئافرەت
(نوخشە) دانەوێڵەی تازە پێ کەییو.
(نوخوت) ل . نۆك .
( نوخۆشەر ) د . نخۆشەر .
(نوخوماندن) ز.داپۆشیین بەشتێك
(نوخومیین) ز. خۆداپۆشیین .
(نوخون)دەفرێکەدەمەوژێر بووبێ.
(نوخونبوونەوە)دەمەوخواربوونەوەی دەفر.بریتیە لەنەمانی سامان ولێ کەوتنی یەکێك لە کەورەیی .
(نۆد) ئەوەد .
(نۆردوو)نانێکەبەنەرمیی وەك بوخچە چوارقەدکرابێ .

( نۆردیی ) نۆردوو .

(نۆرریژ کێن)جۆرەیاریی یەکە وەك سێ رریژ کێن ، بەلاّم لەما، یەکی نۆ داشیان پێ یە .

( نۆرریین ) روانیین .

(نۆرە ) سەرە هاتنە سەرلەکارێکا .
جار:ئیمرروسێ [نورە] هاتمەلات.

(نۆرەبرر) نۆبەبرر .

( نۆرەبررین ) نۆبەبررین .

(نۆز)ووتەیەکەبەکاردێنرێ لەجێی ووتەی [دییسان] لەکاتێکاکە یەکێك کردارێك یاگوفتارێك چەن جارێك بکا ەوەوتۆ پێت ناخۆش بێ .

(نۆزدە) ناوە بۆ ژمارەیەك .

(نۆزدەمیین)شتێکەلەپایەی نۆزدەدابێ

(نۆزدەهەم) نۆزدەمیین .

( نۆزدەهەمیین ) نۆزدەهەم .

( نۆزکە ) نۆسکە .

( نۆزگە ) نۆزکە .

(نۆزیین) وولاّخێکە کە تازە زیینی لێ کرابێ .

(نۆژ)با.جۆرەکەنەیەکە ئەنووسێ بە بن دووگی مەررەوە .

(نۆژەن)ز.شتی تازەداریژراولەئاسن

یالەمس.دەست کردنەوەبەکارێك دوای لێوێستانی .

( نوستێك ) نوستوو .

(نوستن) جۆرەماتیوبێ هۆشی یەکە بەسەرگیانداراداێ وپێ ی ئەحەسێتەوە.
لەکارکەوتنی ئاش وسەعات .

( نوستوو ) گیاندارێکە کە خەوی لێ کەوتبێ .

(نوستیی) نوستوو .

( نوسراو ) کاغەزێکە کە شتێکی لێ نوسرابێ .

( نرسکانەوە ) دەنگی منال لە کاتی زەبوونیا .

(نوسکە)نوسکانەوە، [نوسکەنوسك] نوسکەی یەك لە دوای یەك .

(نۆسکە) منالی نۆبەرەی ئافرەت

(نوسیار) کەسێکە کەباش بنووسێ .

(نوسیاریی) بوون بە نوسیار .

( نۆش ) ووتەیەکە ئەووترێ بە خۆشەویستێك لەکاتی خواردنەوەی ئاو یا قررقێنەدانەوەیا .

( نۆشاتر ) نەوشتار .

( نۆشادر ) نۆشاتر .

( نوشتاندنەوە ) قەدکردنی شت.

(نوشتانەوە) قەدبوونی شت.

(نوشتاویی)ئاستی نوشتانەوەی شت.
(نوشتوو) نوشتە .
(نوشتە) کاغەزێکە چەن ئایەتێکی قورئان یاچەن نزایەکی لێ ئەنوسرێ و بەنوشتاوەیی بۆمونەررك هەڵ ئەگیرێ.
( نوشتیی ) نوشتە .
( نوشخۆر ) ز. پاشاخورر .
(نۆشکردن)خواردنەوەی شت بەخۆشیی
( نوشوست هێنان ) کزبوونی هێز و تەوانایی . کەم بوونەوەی دارایی و دەسەڵات .
(نوشوستیی) نامەدو نەهاتی .
( نۆشیین ) نۆشکردن .
( نۆغرۆبوون ) رۆچوون و نوقووم بوون بەناخی زەویی دا . نوقوم بوون لە زەرەروزیانا: فیسارکەس لەزیانی لۆکەکەیا [نوغرۆبوو] .
( نوقرا ) ل . نوقرە .
( نوقرە ) زیو .
(نوقرە کفت)د.ئاڵدووزدانی شت بەزیو
(نوقڵانە)ووتنی شتێکی باش یاخراپ بۆکەسێك لەپێش بوونی شتەکەدا .
(نوقڵانەلیدان) نوقڵانە .
(نوقمەسار)د.کەسێکەکەسەرنکوون بووبێ .
(نوقورچ)گرتن و گوشیینی جێگایەك لەجەستە بە دووپەنجە .
(نوقورچك) د. نوقورچ .
(نوقورچکانە)د.نوقورچێکەئەگیرێ لەژنێك کەکاڵایەکی تازەی لەبەرکردبێ و بەردرر کانەی نەکردبێ .
(نوقول) جۆرە خواردەمەنی یەکی دانەدانەیەلەشەکردروستئەکرێ .
( نوقولدان ) دەفرێکە هەر نوقولی تێ ئەکرێ .
(نوقلەکوردیی) بەکەنمەشامی یەك ئەلێن کەبرژابێ و پشکوتبێ .
(نوقوم)شتێکەکەلەناوئاوا وون بووبێ
(نوقومبوون) بن ئاوکەوتنی شت .
(نۆقیبوون) ز. نوقومبوون .
( نوك ) ز. نوك .
(نۆك)دانەوێڵەیەکی خرری زەردە بە کوڵاوییو بە برژاویی ئەخورێ .
(نۆکاو) چێشتێکە لەگۆشت ونۆك دروست ئەکرێ .
(نوکتەباز) یەکێکە کەقسەی جوان بکا
( نۆکەحۆلە ) جۆرە نۆکێکی دەنك کەورەیە .

( نۆکەر ) خزمەتکار .
(نۆکەرایەتی)بوون بەنۆکەر.
(نۆکەررەشکە)نۆکێکی ووردی تونکل رەشە،ئەکرێ بەلەتکە .
(نۆکەریی) خزمەتکاریی .
(نۆکەزۆردە) د. فەرییکەنۆك .
(نۆکەل)جوانەکایەکەکەپێی نابێتە سالی سێهەم
(نۆکەن) جۆگە یاکارێزێکە کە تازە هەلکەنرابێ .
(نۆکەند) نۆکەن .
(نۆکیسە) د. بریتی‌یە لە کەسێك کە تازە دەولەمەند بووبێ .
(نوکوم)نوقم،[نوکومبوون]نوقمبوون [نوکومکردن] نوقومکردن .
( نۆکە ) د . نۆرە .
( نۆکەچیی ) د . نۆبەچیی .
( نۆما ) جوانووی دووسالە .
(نۆمال)کەسێکە کەتازەمالی پێکەوە نابێ .
(نۆمسلمان) کەسێکە کەتازەمسلمان بووبێ .
( نۆمیینە ) مانگی ذی‌الحجة .
(نونك)د.بەلکەونیشانە،[نونکەکردن] سووسەکردنی بەلکەی شت .
( نۆنۆ ) نۆنە .
(نۆنۆلە)کەسێکە کە رەفتاری وەك رەفتاری منالی ساوا وابێ .
(نۆنە)ووتەیەکە منالی ساوا بەکاری دێنێ بۆ هەموو خولردەمەنی‌یەك کە دانەویلەبێ .
( نوو ) نوێ .
( نووا ) پێش‌وبەردەم.ئەشکەوت
(نوواکێش)مەرێکەکەشوان‌بانگی رانەکەی کرد ئەولەپێش هەموویانا دوای کەوێ .
(نووال)تەپلەسەری کێو .
(نوواندن) دەرخستن و پیشاندانی شتێك بەیەکێك: وولاخەکە لە مەیدان [بنوێنە].خەوخستن لەیەکێك:منالەکە [بنوێنە] .
(نووتەك) ووتەیەکە هەمیشە بەکار دێنرێ لەدوای ووتەی[تارییك]ەوە بۆ تأکید: تارییك‌و [نووتەك] .
( نووچانەوه ) نووچیانەوه .
( نووچبردن ) هەل ئەنکووتن .
( نووچدان ) نووچبردن .
( نووچیانەوه ) د . چەوتانەوه .

( نوود ) د . حال و ئەحوال : فلان کەس خوش نوودە ، واتەخوشحالە .
( نووررە ) دەنگی سەگ لەکاتی ئازارپێ گەیشتنیا ، [نووررە نوور] نووررەی یەك لەدوای یەك .
( نووز ) ووتەیەکە هەمیشە لەگەل ووتەی[ناز]دابەکاردێنرێ:[نازونووز].
( نووزاندن ) نووزە کردن .
( نووزانن ] نووزاندن .
(نووزانەوە)کورروزانەوەی منال .
( نووزە ) جورە دەنگێکی باریکی نزمە وەك دەنگی نەخوش لەکاتی لاوازیی‌یا ، [ نووزە نووز ] نووزەی یەك لەدوای یەك .
( نووزە برربین ) کوتایی هێنان بەنووزە نووزی یەکێك .
( نووزەدرێژ) مەردومی درێژدادرر.
( نووسان ) بەیەکالکانی دووشت .
(نووساندن)الکاندنی دووشت بەیەکەوە.
( نووساو ) دووشتە کەبەیەکالکابن. دەنگێکە کەگیرابێ .
( نووسخانە ) د . شوێنێـکە کە نووسەران شتی تیا بنووسن .
(نووسەر) کەسێکە کەبزانێ بنووسێ.
( نووسەك ) شتێکە کەلەخوێیەوە بنووسێ بەشتێکی ترەوە .
( نووسەکە ) گیایەکی بەهارییە لەناودەغلاّئەرروێ وبەشتەوەئەنووسێ وبەرێکی تووکن ئەگرێ .
( نووسەنەك ) نووسەکە .
( نووسیان ) د . نووسان .
( نووسین ) پیت خستنەسەرکاغەز بەقەلەم لەلایەن نووسەرێکەوە .
( نووسینخانە ) نووسخانە .
( نووسینگا ) نووسخانە .
( نووسینگە ) نووسینگا .
( نووسینەوە ) وێنە وەرگـرتنی شتێکی نووسراو بەقەلەم .
( نووقاندن ) قووچاندن .
( نووقاو ) چاوی لێکنراو .
( نووك ) لووتی تیژی شت .
( نووکاندن ) نووکە کردن .
( نووکانن ) د . نووکاندن .
(نووکن)د . کەسێکە کەزوربنووکێنێ
( نووکە ) دەنگێکی پچکـولەی بارییکە کەلەگریانێکی هێواشـە وە پەیابێ ، [ نووکەنووك ] نووکەی یەك لەدوای یەك . هەنووکە [ با] .

( نووکەبڕرین ) کـۆتایی هێنان بەنووکە نووکی یەکێك .
( نووکەر ) ل . نۆکەر .
(نووگەنیا) پۆلانیای دەمیکاسن .
( نوون ) نان [ ل ] . ناوە بۆ پیتێـك لەبیستو حەوت پیتـەی کوردیی . بریتی‌یە لەنەنکی شتێك ئەمشتە [نوون]ی تیانی‌یەواتەبێ نەنکە.
( نۆوەن ) نۆبەن .
( نۆوەند ) نۆبەن .
( نووەی ) ە . نۆك .
( نوها ) ز . ئێستە .
( نوهال ) با . شێوو دەرە .
( نوهت ) ز . نەوەند .
( نوهك ) ز . نۆك .
( نوهلیك ) با . دۆشەك .
( نوهۆم ) تەبەقەی خانوو .
( نۆهەد ) نەوەد .
( نۆهەم ) شتێکەکەلەپایەی‌نۆدابێ.
( نهۆم ) نوهۆم .
( نۆهەمین ) نۆهەم .
( نۆهەوار ) هەوارکەی تازە .
( نۆهێلـکە ) بارۆکەیەکە تازە هاتبێتە هێلکە .

( نوێ ) تازە .
( نوێبوونەوە ) تازەبوونەوە .
( نوێرد ) ە . تییکی درووماں
(نوێردوو) نانێکی‌تیری‌یە کە چوار گۆشە وەك بوخچە قەد کرابێ .
(نوێردووەحەلوا ) حەلوایەکە کە کرابێتەناونوێردووەنانەوە .
(نوێژ) چەن کردارو گوفتارێکی تایبەتی‌ئایینی یەشەووڕۆژی‌پێنج‌جار بۆخواپەرستیی‌ئەکرێ .
( نوێژان ) نوێژیان .
( نوێژبوون ) هاتنی کاتی نوێژ.
( نوێژچوون ) نەمانی‌کاتی نوێژ.
(نوێژقایم) کەسێکە هەرگێز نوێژی نەچێ .
(نوێژکردن) بەجێ‌هێنانی نوێژ.
(نوێژکەر)کەسێکەکەنوێژبکا .
(نوێژەبارانە) نوێژێکە ئەکرێ بۆ باران بارین .
(نوێژەبارانێ) نوێژەبارانە .
(نوێژیان) دوای بانگی بەیانی تا دەمی زەردەکەوتن .
(نوێژیی)شتێکی‌پاكو خاوێنە کەلە وانەبێ نوێژی پێوە بکرێ .

(نوێکردنەوە) تازە کردنەوەی شت
(نوێکرن)ز. تازە کردنەوەی شت.
(نوێگن)ز.گایە کە پێی نابێتە سێ ساڵە
(نوێڵ)ئاسن یا: ارێکی بەهێزی درێژە ئەدرێتە ژێرشتی زۆر قورس بۆبەرز کردنەوەی .
(نوێڵدان)نوێڵ کردن بەژێرشتی قورسا
(نوێن) پێخەف. ناوی دێیەکە لە هەورامان .
( نوینك ) ئاوێنە .
( نوێنگیین ) نێوون .
( نوێنە ) د . نوێنەر .
(نوێنەر) کەسێکە کەلەدەولەتێکی بێگانەداجێ داریی دەولەتی خۆی بکا . کەسێکەلەدەولەتەکەی خۆیاجێ داریی گەلەکەی بکا « نائب »
(نوێنەریی)بوونی مەردوم بەنوێنەر.
( نۆیەك ) لە نۆبەش بەشێك .
( نۆیەم ) نۆهەم .
( نۆیەمیین ) نۆهەمیین .
( نویی ) نوێ [با] . نەویی .
(نوییسگە) نوسیینگا .
(نوییسندە) نووسەر .
(نوییسنە) د . نوییسندە .
(نوییسیین) نووسیین .
(نوییشك) ل . کەرە .
( نوویین ) نوێن .
(نە) پیتی نەفیە لە رابووردوودا: [نە]ی خوێندیا[نە]ی خوێندەوە. پیتی نەفی سفەتەلەیەکێك:فلان کەس نەزانە، یانەزۆکە،یانەخوێندەوارە.پیتی نەهیە بۆحازروغایب [نە]ررۆیت،[نە]رروا. لە:[نە]ژوورسەرییێنی واتە [لە] ژوور سەرییێنی. نەم .
(نەم)ووتەیەکەوەرامی نەبوونی شتێکی پێ ئەدرێتەوە:[نەم]لەوەرامی یەکێکا کە بپرسێ نەرییمان ئەخوێنێ؟واتە نا، وێنێ
(نهانیی) یا . لانەو یانە .
(نەبات) جۆرە شەکرێکی تایبەتی شیرییێنی زۆرسەختەوەك لییمۆدۆزیی وایە
(نەباتیی) شتێکەرەنگی وەك رەنگی نەبات وابێ .
( بەبادا ) مەبادا .
(نەبان)چوارپێیەکەکەساوای خۆی نەوێ .
(نەبرر)تیێغی کول. بریتی یەلەمەردومی کەمبررشت .
(نەبوون)نەهاتنەدیی شت .

(نەبوونیی) نەدارایی وهەژاریی .
(نەبەرد) کەسێکە کەبەپشووبێ لە هەموو کاروبارێکاو هەرگیز نەبەزێ . بریتی یەلە کاری گرنگی دژوار: فیدار کەس تووشی [نەبەرد] هات .
(نەبەردیی) نەبەزینی لە کاروبارا.
(نەبەز) مەردومی نەبەرد .
(نەبەکام) منال یامیوەی پێ نەگەیشتوو
( نەپا ) شتی ناپایەدار .
(نەپۆرر) د. شتی نالەبار کەبۆهیچ شتێك نەگونجێ .
( نەپۆرریان ) د. نەگونجان .
(نەپەنی) با . شتی وونی نادیار
(نەتراندن) ز. بێدەنگ کردن و لە جوولەخستن .
(نەترس) مەردومی ئازای چاوقایم .
(نەترك) ز. بەرچاوگەی زیبوبینی ژنان
(نەترە) زەندەق . وورە .
(نەترەبۆق) مەردومی قەبەی ناشرین.
( نەترین ) ز. بێدەنگبوون و لە جوولە کەوتن .
(نەتل) د. ملۆزم .
(نەتۆرە) ناوی ناشیرینێ کەنرابێ لەمەردوم. هەڵخۆندن بەسەرمەردوما.
(نەتۆرەبێژ) کەسێکە کەبەسەرمەردوما هەڵبخوێنێ .
(نەتوو) ز. مەردوومی ناپەسەند .
( نەتەوایەتی ) نەتەوەپەرستی .
(نەتەوە) وەچەی گیان لەبەر .
( نەتەوەپەرستیی ) خۆشەویستیی نەتەوەی خۆت .
(نەتەوەنامە) نامەیەکی دەوڵەتی یەکە نەتەوایەتی تۆبکەیەنێ بۆ ئەودەوڵەتە «جنسیە» .
(نەجم) شتێکە کەنەجوولێ «ساکن»
(نەچار) با . ناچار .
( نەچیر ) نێچیر .
(نەچیر کردن) نێچیر کردن .
(نەچیرەڤان) با . راوکەر .
(نەچیرەوان) نێچیرەوان .
(نەخ) ز. هەودای رێسراوی خوریی
(نەخاسم) با. نەخوازەلا .
(نەخت) کەمێك لەشت: [نەختێك] بخۆ یا [نەختێك] دانیشە . نەختیینە . زەویی بەهێز. مارەیی پێشەکی [با] .
(نەختوپوخت) شتی مایەداری بەنرخ
(نەختە) با. رۆژی سەرماوسۆلە .
(نەختیینە) شتی بەنرخی گرانمایە.

(نەخریی) با.یەکەمین منالی باوك و دایك

(نەخش) نەقش .جۆرەکایەیەکەلەقومار کەدەستی یەکێکیان تەواوبێ :فیسارکەس دەستر [نەخش] .

(نەخشاندن) نەقشکردنی شت .

(نەخشاویی) شتێکەکەنەخشی پێوەبێ

(نەخشە) خەریتەی شوێنێك .

(نەخشەکێشان) ڕێبازدانان بۆپرۆژە یەك لەسەرەتاوە تادوایی «تخطیط» .

(نەخشین) شتی نەخشاویی .

(نەخۆ)نەوەك. مەچۆرەدەرێ نەخۆ میوانەکان بێن. ئەکینا : دانیشن نەخۆلێتان ئەدەم .

(نەخوازەلا)ووتەیەکە بەکاردێنرێ لەجێی ووتەی بە[تایبەتی]: کوردمەردن [نەخوازەلا]خوێندەواریان .

(نەخۆش) گیانداری ناساغ .

(نەخۆشبوون) نەخۆشکەوتن .

(نەخۆشخانە) خەستەخانە .

(نەخۆشکەوتن)دووچاربوون بەنەخۆشی

(نەخۆشیی)لەش تێکچوونی گیانداروناساغ کەوتنی

(نەخۆشین) نەخۆشیی .

(نەخۆتە) د. نەخوێندەوار .

(نەخوێندەوار) کەسێکە کە نەی خوێندبێ .

(نەخوێندەواریی) نەخوێندن .

(نەخەسەلا) نەخوازەلا .

(نەخەمە)ز.ووتەیەکەلەجێی ووتەی [ئەی ناکات]بەکاردێنرێ .

(نەخێر) ووتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ نەبوونی ئەوشتەی کە پرسیاری لێ ئەکرێ نەخێرلەوەرامی یەکێکا کەبلێ:دەرست خوێند ؟.

( نەدار ) نەدارا .

(نەدارا) هەژاری کەم دەست .

(نەدارایی) هەژاریی و کەم دەستی .

( نەداریی ) نەدارایی .

( نەذان ) نادان .

( نەدانیی ) نادانیی .

( نەدوو ) مەردومی کەم قسە .

(نەدیی بدیی) د. نەدیوبدیی .

( نەدیتە ) نەدیدە .

(نەدیدە) شتێکەکەدیارنەبێ و باسی بکرێ :لە[نەدیدە] ئەسپەکەت بەچەند؟

(نەدیێك) نەدیوی نەناسراو .

(نەدیو) نەدیێك. شتێکە کە لێتەوە

دیار نەبێ .

(نەدیوبدیی) کەسێکە کە شتی بەخۆ یەوەنەدیی بێ و ئێستە شتی ببێ وەزۆری خۆش بوێ .

(نەدیوا) شوێنێکە کە لێتەوە دیار نەبێ

(نەرد) دووتەختەی بیست و چوار خانی یە بەسیی پوول و دووزاریاریی لەسەر ئە کرێ

(نەردان) د نەردێن .

(نەردە) د. ئەردەبان .

(نەردەبان) پەیژە .

(نەردەوان) نەردەبان

(نەردێن) یاریی کردن بەنەرد .

(نەرر) نێر: شێری [نەرر] واتە نێر.

(نەرراندن) قیڕراندنی گیانداری زەلام بەتوندیی لەکاتی تووررەبوونیا .

(نەرران) نەرراندن .

(نەررنایش) ئافرەتی زلی کەتەی قەبە

(نەررنەررەشێرە) بریتی یە لەگیانداری نەررەزل .

(نەررە) قیڕرەی گیانداری زەلام بە توندیی ، [نەررەنەرر] نەررەی یەك لە دوای یەك. سەری شت : دارەکەی ناوە بەنەررەی شانی یەوە .

(نەررەدێۆ) بریتی یە لە پیاوی کەتەی زلی قەبە .

(نەررەی شان) سەرشان .

(نەرری شان) نەررەی شان .

(نەرگز) نەرگس .

(نەرگس) نێرگس .

(نەرگسە) ھ. کێلەنچکەی مەرر.

(نەرگسەجارر) نێرگسە جارر.

( نەرگسیی ) نێرگسیی .

(نەرم) شتێکە کە رەق نەبێ. بریتی یە لەمەردومی لەسەرخۆی ھێدیی .

(نەرمان) زەویی نەرمی بێ بەردوزیخ

(نەرمانیی) نەرمان .

(نەرمایی) شوێنی نەرم لە ئەندام : نەرمایی گوێی گرت .

(نەرمبوون) بریتی یە لەھاتنەسەر ررای یەکێك . لاچوونی رەقیی شت .

( نەرمژاندن ) ز . نەرم کردنەوەی شتی رەق .

(نەرمژیین) نەرم بوونەوەی شتی رەق

(نەرمك) نەرمە .

(نەرمکێشیی) ئاسانیی بەکارھێنان: فیسار کەس زۆر نەرمەکێشی لەگەڵ کردم

(نەرموشل) شتی زۆر نەرم. بریتی یە لە مەردومی ھێدیی لەسەرخۆ .

( نەرمۆڵە ) شتی نەرم و شل .

( نەرمونۆل ) نەرموشل .
(نەرمونیان)مەردومی هێواشی لەسەرخۆ
(نەرموو)با.مەردومی نەرمونیان .
(نەرمووك) نەرمە .
(نەرمە) گۆشتی بێ ئێسقان .
(نەرمەبرر) د. بریتی یە لە مەردومی زبان لووسی فێلباز .
(نەرمەبێژ)د. والآبێژ .
(نەرمەزیین)لبادێکە لەژێرتەکەلتووی زیینەوە دائەنرێ .
(نەرمەساو)پارچە پۆلایە کە قەساب کێردی پێ تیژ ئەکا .
(نەرمەغار)غاری هێواشی لەسەرخۆ.
(نەرمەقووت)خواردەمەنی نەرم وشلە کەجوون وقووتدانی ئاسان بێ .
(نەرمەکۆکە)جۆرە کۆکەیەکی سووکی هەمیشەیی یە .
(نەرمەکا) زەمینێکە کەدووسێ جار بەجووت کێلرابێ .
(نەرمەلیقە)تەنراوێکە کەزۆر تەنك و تیوال بێ .
(نەرمەنەرمە)ووردەووردە : [نەرمە نەرمە]ئەبارێ،یا[نەرمەنەرمە]بۆم بلێ واتە ووردە ووردە .

(نەرمیی) نەرمایی .
(نەرمیین) شتی نەرمونۆل .
(نەرە) هـ . داربەرروو .
(نەرییت) شتێکە کەتازەداهێنرابێ و کرابێ بەباوو توحەزی لێ ئەکەیت : هەر رۆژە[نەرییت] ێکمان بۆ دائەهێنێ .
( نەزا ) د. نەزۆك .
(نەزان) مەردومی بێ ئاگالەشت .
(نەزاندوو) مەردومی قسە رەق .
(نەزاست)د.کارێکە کەبەهەلە کرابێ
(نەزاستە)د. کەسێکە کە کارێکی بە هەلە کردبێ .
(نەزانکار)د. مەردومی کۆلیی وناشیی لە ئیشا .
( نەزانیی ) نەزانیین .
(نەزانیین) بێ ئاگایی لەشت .
(نەزدییك) نزییك .
(نەزدییکایی) نزییکایی .
(نەزدییکبوونەوە) نزییکبوونەوە .
(نەزدییکخستنەوە) نزییکخستنەوە
(نەزدییك کردنەوە) نزییك کردنەوە
(نەزدییك کەوتنەوە) نزییك کەوتنەوە
(نەزدییکی) نزییکی .
( نەزگرە ) نزگەرە .

( نەژلە ) سەریەشەی سەخت .
( نەزم ) لێدانی دەمار .
(نەزۆك)مێیینەیەکەکەزاووزێ نەکا
(نەزۆکیی) بوونی مێیینەبەجۆرێك
کە زاوزێ نەکا .
( نەزێ ) د . نەزۆك .
( نەزییك ) د . نەزدییك .
(نەزییکایی) د. نەزدییکایی .
(نەزییکبوونەوە) د.نەزدییکبوونەوە
(نەزییکخستنەوە)د.نەزدییكخستنەوە
(نەزییك کردنەوە)نەزدییك کردنەوە
( نەزییك کەوتنەوە ) د. نەزدییك
کەوتنەوە .
(نەزییکەوبوون)د.نەزدییکبوونەوە
( نەزییکیی ) د. نەزدییکیی .
(نەژاد) رەسەن و بنەچەی مەردوم
(نەژد) د شتی چرچی پەژموردە
(نەژنەوا) کەرر.بریتییەلەمەردومی
بێ‌گوێ .
(نەژنەوایی)گوێ گرانیی.بریتییەلە
بێ‌کوێیە .
( نەساغ ) ناساغ .
(نەستۆ) د. مەردومی کەللەرەق .
(نەستەق) شتی ئەتییکە .

(نەسرەوت)گیانداریکەکەسرەوتی نەبێ
(نەسرین)جۆرەگوڵێکی پەرەووردی
بۆنخۆشی سپییە .
(نەسۆز)د.شتێکەکەنەسووتێ .
(نەسوو)د.تییغێکەکەهەرگیزتییژنەبێ
(نەشارەزا) نابەلەد .
( نەشتەر ) تییغێکی تییژی لووت
بارییکەبرینی پێ‌هەڵ ئەدرن .
( نەشتەرکاریی ) خەرییکبوون بە
هەڵدرریینی برینەوەبەنەشتەر.
(نەشتەرکەریی) زانیینی نەشتەرکاریی
(نەشرە) شتێکی درێژی جوانە لە
والای رەنگاورەنگی قەبزە نوشتەیی و
مووروودروستئەکرێ،وەبەچواردەوری
ژووراڤەکیرێ بۆجوانیی .
(نەشمیل) جوانکیلە .
(نەشمیلانە) جوانکییلانە .
(نەشمیلە) نەشمیل .
(نەشناس) بییگانە .
(نەشۆر) د. نەزۆك .
•(نەشە) کەیف و هەوەس .
•(نەشەکرتن)پەیابوونی نەشەبۆیەکێك
(نەعتك) ز. ناوچەوان .
(نەعرەتە) قرییوەی بەرزو کەورە .

(نەعنا) گیایەکەوەك پونگە، بەلام ئەم کەلاکەی کالترەوتامەکەی توونترە .
(نەفام) مەردومی تێ نەگەیشتوو.
(نەفامیی) تێ نەگەیشتوویی .
(نەفت) نەوت .
(نەفتخانە) نەوتخانە .
(نەفرین) لەعنەت .
( نەفوورآت ) مەردومی هاروهاچی زۆرزان .
(نەڤرۆژ) ز. نەوروز .
(نەفسیی) با. کورری ژن لەمێردێکی تری بۆ باوەپیارە ، وەکورری مێرد لە ژنێکی تری بۆ باوەژن . .
(نەڤیساندن) ز.نووسین .
( نەڤیی ) با ، کوررەزا .
(نەڤییچررك) با کوررەزازا .
(نەقارەخانە) مۆزیقەخانە .
(نەقتاندن) ز. ئارەق کرتنی شت
(نەقر)ز ئەشتی قوول.دەفری گەورە .
٠( نەقشە ) نەخشە .
(نەقیپزە)داردەستێکی درێژەبۆ مارێك بە اروتەکەیەوەیەتی ، وولاخی پێ لێ نەخوررن .
(نەقیپرەدان) لێ خوررینێ بەنەقیپزە
(نەك) نەوەك .
( نەکا ) نەك .
(نەکردوو) کەسێکەکەفێری ئیش و کار نەبۆوبێ .
(نەکردە) نەکردوو .
( نەکردەپەشیمان ) کەسێکە کە پەشیمان بوو بێتەوەلەسەرنەکردنی کارێك
(نەکس)ز.دەردێکە دووچاری سیی ئەبی لەسەرماوە «ذات الرئە» .
(نەکوت) نەکوتە .
(نەکوتە) جۆرەجوێنێکەئەدرێ بە کەسێك کەقسەت لەگەل بکاو نەئەوێ لەوحەلەدا بیدوێنی .
(نەکولۆك) دانەوێلەیەکە کەدرەنك بکولێ .
(نەکوو) نەوەك .
(نەکیی) نەوەك .
٠(نەکبەت)گیانداری کولۆل.شتی بەد فەرر: ئەوخانووەیائەووولاخە [نەکبەت]ە واتەبەدفەرروشوومە. کولۆلیی : یاخوا هەرگیز[نەکبەت]رووت تێ نەکا .
٠( نەکبەتیی ) کولۆلیی .
( نەگرییس ) گیانداری لاساری سەرسەخت .

(نەکریسیی)لاساریی وسەرسەختیی
(نەگۆرر)شتێکە کەلە ئەندازەی خۆیا
وەستابێ و نەگۆرررابێ .
(نەگۆمە) د. کەسێکە کەشەپلە لێی دابێ
(نەکەوییس) کەسێکە کە کەس نەیەوێ
(نەکەوییست) نەکەوییس .
(نەکەیشتوو) نەکەییو .
( نەکەییو ) میوەیەکە کە پەشتا
نەکەیی بێ. کەسێکە کەهێشتا نەکەیشتبێتە
ئەوشوێنەی بۆی ئەچێ .
(نەکیراو)وولاٚخێکە کەهێشتازیینیا
باری لێ نەکرابێ .
(نەکییریاك) د. نەکییراو
(نەمازە) بە تایبەتی .
(نەمام) درەختێکی پچووکە کە بە
ریشەوە هەلکەنرابێ بۆ ناشتنی لە
شوێنێکی تر.
(نەمامکردن) کوشتنی مەردوم بە
خستنە ناوچیینی دیوار بەپێوە .
(نەمان) لەناوچوونی شت .
(نەمر) بریتی یە لەخوا. پەیمانێکە لە
ناوەندی خاوەن ئاژال و شوانکارەیا
ئەبەسترێ بۆماوەی سالێك یازیاتر کە
ئەوئاژالەی ئەیداتێ بە نەمربۆی بەخێو
بکا بەبێ پارەو لەپاشا بەتەواویی پیداتەوە،
وەبەروبوومەکەی لەناویانادووکەرتی بێ:
مەررەکانم دا بەفیسارکەس [بەنەمر]
واتەئەکەریەکێکی لێ مردلەبەرەکەی
بیخاتەوەجێی. بەیەکێك ئەووترێ کە
ناوی هەرگیز نەکوژێتەوە .
(نەمیانەوە) د. چەوتانەوە .
(نەمێر)با. پیاوێکە کەنەتوانێ بچێتە
لای ژن «عنین» .
(نەمییر) ز. نەمێر .
(نەناس) نەشناس .
(نەنك)دایکی دایكو دایکی باوك.
( نەنکە ) نەنك
( نەنگ ) شوورەیی .
(نەنگنامە) د. هەلخوێندنی خراپ
بەسەر یەکێکا بەشیعر « هەجو » .
(نەنگەوییست ) نەکەوییست .
(نەنگیین) نەنگداری ریسوا .
( نەنە ) نەنك .
( نهۆ ) ز. ئیستا .
( نەوا ) جۆرە گۆرانیەکی خۆشی
کوردیی یە. نەوەك[د].جێکاوریکا .
(نەوات) نەبات .
(نەوادە) د. نەوە .

(نەوار) د. بافتەیەکی تەنکە کچان
پرچی پێ ئەبەستن « قردێلە » .
(نەوازش) دڵخوشی دانەوەی دڵتەنگێك
بەگوفتاریا بەکردار.
( نەوازشت ) نەوازش .
( نەوال ) ز. شییوودەرە .
( نەوان ) نەبان .
( نەوباوە ) د . نوخشە .
(نەوت) شتێکی شلە ئەگرێتە چراوەو
ئەسووتێنرێ و بەکاری گەلێ شتی تردێ،
وەلەژێرزەوییەوە دەرئەهێنرێ .
( نەوتخانە ) شوێنێکە کە نەوتی تیا
بفروشرێ .
(نەوتیی) شتێکە کەرەنگی لەنەوت
بچێ. ناوی دێیەکە لەناوچەی قەرەداخ
(نەوجوان) مەردومی کەنجی جوان چاك
( سوجەوان ) د . نەوجوان .
(نەور) زەمینێکی چاڵە لەناو شاخ وداخا
(نەوررەس) لاوی تازەپێگەیشتوو .
میوەی نوبەرە .
(نەورم) شوێنی چاڵ لە زەویی .
(نەورو) کاتی جووت کرتنی پشیلە
(نەوروز) یەکەم روژی بەهارە کە
رێکەوتی روژی بیست ویەکی مارت ئەکا
(نەوروزانە) دراوێکە کەقوتابی ئەیبا
بوماموستای لە روژی نەوروزا .
دیارییەکە کەبەبونەی روژی نەوروزەوە
ئەنێررێ بو ئاشنا .
(نەوروزنامە) هەڵبەستێکە کە هەڵ
بدرێ بەسەر روژی نەوروزا .
( نەوروزە ) گوڵێکە لەوێنەی گوڵە
گەزیزە، بەڵام ئەم دووررەنگە .
(نەوروزیی) نەوروزە .
(نەوزاد) کەسێکە کەتازە لەدایك بووبێ
(نەوژن) هـ. نوێنکی بەرکەل .
(نەوس) چنوکییو ئارەزوو کردنی
خواردن: فیسارکەس[نەوس]ی تیژە
(نەوسن) مەردومی چنوکی چلێس.
(نەوسنیی) چنوکییوچلێسیی .
(نەوشاتر) شتێکی سپییە وەك زاخ،
مزگەرلەکەل قەلایی دادەفری پێ سپیی
ئەکاتەوە .
(نەوشادر) نەوشاتر .
(نهوم) قاتی خانوو : ئەم خانووە دوو
[نهوم] ە .
(نەووسك) با. خانووی لەشاخ داتاشراو
( نەووك ) گەروو .
( نەووك ) لباد .

(نەوە) کورەزاو کوررەزازا .

( نەوهال ) د. نەوجوان .

(نەوەد) ناوەبزژمارەیەك کە نۆدەیە

(نەوەرد) دارێکی چوارپاڵووی ئەستوو رەجۆلاتەنراوی لەسەرهەل ئەکا.وەردێنە [د] نەبەرد[د] .

(نەوەش) ه ، نەخۆش .

( نەوەشیی ) ه . نەخۆشیی .

( نەوەك ) مەبادا .

( نەوەکا ) نەوەك .

( نەوەکوو ) نەوەك .

( نەوەکیی ) نەوەك .

(نەوەن) گوێرەکەی نێری دووساڵە . شاتر [د] .

(نەوەندە)دەغڵێکی پایزەیە کەدرەنگ چێنرابێ .

(نەوێر) ترسنۆك .

(نەوێران) ترسانوپرر کێشی نەکردن

(نەویی) شتی نزم ،[نەویی بوونەوە]، نزم بوونەوە ، [نەویی کردنەوە] نزم کردنەوە .

(نەوییس) د. مەردومی بێ ڕێز.

(نەوییین) نیشتن.بانەکە[نەوییوە]واتە نیشتووە،نزم بوونەوە:فررۆ کەکە[نەویی] بووەوە واتەنزم بووەوە . کوێر [د] .

( نەه ) ز. ئێستەکە .

( نەهـ ) با . نۆ .

( نەها ) ز. ئێستا .

(نەهات) کاتێکەکەشتی تیا کەمو کووررببێ . نەگبەتیی : فیسار کەس [نەهات]ێتی .

(نەهاتیی) نەگبەتیی و سەغڵەتیی .

(نەهار)خواردەمەنیی نیوەرروان .

(نەهار کردن)خواردن لەنیوەرروانا

(نەهبەرك)ز.جۆرەیارییەکە .

(نهەنگ) نەهەنگ .

(نەهوییت) ز. نەوەد .

(نەهە) ه . ناووك .

(نەهەك) ز. نۆمیینە .

(نەهەنگ) ماسیی زۆر گەورە .

(نەهێشتن)لەناوبردنی شتێك.قەدەغە کردن .

(نەهێنەبرر) نهێنبرر .

(نەهێنکر) نهێنکر .

(نەهێنیی ) نهێنیی .

(نەهییو) د. شاتال .

(نەی)دەزوو[ه].لوولك. قامیش .

(نەیار)ز. دوژمنی ئاشکرا .

( همبان ) ز . هەمانە .

( همبر )ز . شتێکەکە بەباوەش هەل بکیپەرێ .

( همبەران ) ز. شتی بەرامبەر .

( همێ ) د . ئومێد .

( همیداد ) کۆمەکیی .

( هن ) ز . هێند .

( هنار ) ز . هەنار .

( هنارتن ) ز . ناردن .

( هناڤ ) ز . هەناو .

( هنجنیین ) با . ئەنجنیین .

( هنداق ) ز. هاوتا . بەرامبەر.

( هندروو ) ز . ناوەوەی شت .

( هندوویی )ناوە بۆجۆرەترێیەك.

( هندە ) ز . هێندە .

( هندەك ) با . هێندێك .

( هندەکۆ )ز. گیایەکەکەلاکەی سەێ پەررەی هەیە .

( هنکاڤ ) با . هەنکاو .

( هنکاڤتن ) ز . ئەنکاوتن .

( هنکرتن ) ز . هەلگرتن .

(هنکستووك)ز. ئەموستیلەی دررو ..ن

( هنکڤ ) ز هەنکوین .

( هنکڤیین ) ز . هەنکوین .

( هنکل ) ز . هەنکل .

(هنکۆریی)ز.لەرۆژاوا وەتاکاتی نوستن

( هنکوستییل )با. ئەنکوستییلە .

( هنکوور ) با . هنکۆریی .

( هنکووریی )با. دوای نیوەررۆ .

(هنکێ)ز.هێندێك.کاتی رابووردوو.

(هنکیی)ز.هەموو کەس. هەمووشت.

( هنەر ) ز . هونەر .

( هنەك ) هێند .

( هنیین ) با . سواخ .

(هۆ)ووتەیەکەجووتیاروگاوان بەکاری دێنن بۆگێررانەوەی گاکانیان. بۆنە: بە [هۆ]ی تۆوەهاتم.ووتەیەکەهەررەشەی پێ ئەکرێ: [هۆ] واپێت ئەلێم درۆ نەکەیت . بەرز [ز] .

(هۆبرران)دەست بررانلەهوموشتێك

(هۆبە) کۆمار.چەندرەشماڵێکەکەلە شوێنێکا هەلدرابێ .

( هۆپەل ) د تۆپەل. کولۆیەکەکە بهاویژرێ .

(هۆپەلان) د. شەررەتۆپەل .

(هۆجەنە) ە . بەندەخوێن .

(هوجەنەکێش) ە. داربەندەخوێن.

(هۆجەنەگا) ە. سەرپزووی دەرپێ

کە بەندەخوێنی تێ‌هەڵ ئەکێشرێ .
(هۆچنە) ل . هۆچەنە .
(هۆدار) ز. فاقە .
(هۆدانەوە) خێردانەوە : فلانکەس هۆی دایەوە .
(هۆدە) ژوور .
(هور) ز. شتی وورد .
(هۆر)ز.ژوورێکە تەنیا مەرروبزنی تێ‌بکرێ [ز] . خۆر .
(هورا) د. هەرا .
(هۆراسان) هەراسان .
(هۆرنە) ووتەیەکە جووتیاربەکای جووتی ئەڵێ لەکاتێکا کە بێتەناوهێلەوە بۆ ئەوەی کەبچێتەوە جێی‌خۆی . وەرتە .
(هۆرتەوبەرەزانیین) بریتی‌یە لەزانینی مەردوم‌بۆ‌پێ‌وێستانی سەرشانی‌خۆی : من‌هۆرتەوبەری‌خۆم‌ئەزانم .
(هورچ) وورچ .
(هورد) وورد .
(هۆرداشتن) هەڵمالین .
(هۆردان) دەوارهەڵدان .
(هۆردروون) هەڵدرین .
•(هۆردوو) لەشکر .
(هورر)وورر .ئەستوور:مل[هۆورر] • قورر [با] .
(هۆرر)دەفرێکی‌چنراوی دوولاییە لەچەوال‌کەورەترولەتێرر پچووکترە
(هۆرراو)کۆلاوی‌زۆرزل .
(هۆرراوە) ووررراوە .
( هوررە ) هوودررە . سوررەو . رەشەبا [با] .
(هوررەم) د. هوررەو .
(هوررەو) ووررەوە بەراز .
(هوررێنە) ووررێنە .
(هورری) ووررێی .
(هۆرزای) ھ . هەستان .
(هۆرش‌کرتن) هەڵکرتن .
(هۆرکریان)هەڵکردن. داگیرساندن
(هۆرکنیان) هەڵکەنران .
(هۆرکەندن) هەڵکەندن .
(هۆرکێشان) هەڵکێشان .
(هورگ) وورگ .
(هۆرگرتن) هەڵگرتن .
( هورگن ) وورکن .
( هورکنە ) وورکنە .
( هورمان ) واق ووررمان .
( هۆرنـگ ) د . برنـگ .

(هوروژم) هاتنی شتێك بەتەووژمو بە زۆریی: ئاوە کە هوروژمی هێنا .

(هورووژ) د. هوروژم

(هورووژان) وورووژان .

(هورە) وورە .

(هۆرە) جۆرە گۆرانی یەکی جافەکی یە. پووار .

(هورەبا) با . رەشەبا .

(هورەبەردان) وورە بەردان .

(هۆرەهۆر) لە بەرخۆوە گۆرانی ووتن.

(هۆرێزیای) ه . هەستان .

(هوری) با . قورر .

(هۆز) چەن مالێکە کە بچنەوە سەر یەك تیرە .

(هۆزان) ز. هەلکەوتووی بلیمەت « علامة » .

(هۆزەرروو) گیایەکی کەلآ ووردیی ئاویی یە، کەلآی لە کەرەووزئەچێ و کەمێك سوێرە .

(هۆزەلآو) گیایەکی کوێستانی یە ، کەلآیەکی باریکی هەیە ئەخورێ .

(هوژم) د. تەکان دان : هوژمێ بدە ، واتە تەکانێك بدە .

( هوژووم ) د . هورووژم .

(هوژە) د. ووژە .

(هوژەبر) شێری دررندە .

(هوژەم) د. هوررەم .

(هوستە) وەستا .

(هوسوورە) د. خەزوورە .

( هۆش ) یادو بیر : فیسارکەس بێ [هۆش] ەواتەشتی لەبیر نامێنێ ووتە یەکەئەووترێ بەکەربۆوەستانی .

(هۆشمەند) مەردومی ژیریی هوشیار

(هۆشە) د. هێشوو .

(هۆشەچن) کولەوەچن .

(هوشیار) کەسێکە کەخاوەنی هۆش و بیر بێ .

(هۆشیار) هوشیار .

(هوشیاربوونەوە) هاتنەوەهۆش .

(هۆشیاربوونەوە) هوشیاربوونەوە .

(هوشیارکردنەوە) هێنانەوەهۆش .

(هۆشیارکردنەوە) هوشیارکردنەوە

(هوشیاریی) زیرەکیی وبەهۆشیی .

(هۆشیاریی) هوشیاریی .

(هۆقە) حوقە .

( هۆك ) د. ئارەزوو . مان .

(هۆکردنەوە) بریتی یە لە کەلك گرتنی

شتێك یا کەسێك لەکاتی پێ‌ویستی دا : فیسارکەس[هۆی کردەوە] واتەلەکاتی خۆیا بەکەڵك هات .
( هۆك کردن ) مانگرتن .
( هۆکل ) خزمەتکار .
( هۆکن ) مانگر .
( هۆکەل ) هۆکل .
(هۆکێ)د کەسێکەکەدوای ئارەزووی دڵی خۆی بکەوێ .
(هۆکر)گیانداریکەکەخووی کرتبێ بەشتێکەوە[هۆکربوون] رمودەبوون بە شتێکەوە .
(هۆکرتن) رام بوون ،
(هۆکریی) رموودەیی .
(هۆل) ز یاریی شەقێن .
(هۆل) جاش[م] سەرشارلەیاریی شەقێندا. زاخە . سالۆن . ووتەیەکە هەمیشەلەکەڵ ووتەی چۆلدابەکاردێنرێ: چۆل و[هۆل].تۆپی یاریی [با]
,هۆلاندن) قورراندنی رەشەوولاخ.
(هولزل؛ د. شتی هەلزل .
(هەلونج) د. هێلنج .
( هواوو)د.جۆرەتۆخێکی زۆرناسکە بەرەنگێك کەلەشوێنی خۆی نابڕێ بۆ شوێنێکی تر .
(هۆلە، ووتەیەکەکوێرەکەی پێ بانگ ئەکرێ.قوررەی رەشەوولاخ ، [هۆلە هۆل]قوررەقورری زۆر .
(هۆلە)گێرە.ناوەبۆدێ یەك لەچوانرۆ
(هۆلێن) جۆرێکەلەیاریی شەقێن
(هۆلیی) د. جاش .
(هوما) باڵندەیەکی کەورەی گۆشت خۆری کێویی یەکەپێشی ئەلێن[پیرێژنە].
(هرمایوون) جۆرەنقامێکی خۆشە .
( هومایوونیی ) هومایوون . جۆرە نووسینێکەوەك نووسینی شکستەی فارسی
( هۆملکێ ) بەربەرەکانیی .
( هومە ) کووپە .
( هۆمە ) د. هومە .
(هۆمەلغەزا) عەشامانێکە کە زۆر چررو پررو تێکەل و پێکەل بێ .
(هۆمەلێرە) د. گۆشت تەنووریی .
(هۆمەیی) مەرری بۆزی تاریك
(هومێد) ئومێد .
(هومێدەوار) ئومێدەوار .
( هون ) ز. ئێرە .
(هۆن‌هۆن)ووتەیەکەبەکاردێنرێ لە کاتی کریانی یەکێکا کە ئاو بەچاویابێتە

خواره‌وه: فیسار که‌س ئه‌گرێ هزن هون فرمێسك به‌چاویادێته‌خواره‌وه .

(هوندور) ز. ناوه‌وه‌ی شت .

( هزنراو ) شیعر .

(هزنراوه) شتێکی لیسپ داره که‌لیسپه کانی تێك هه‌ل کێشرابێ به‌جۆرێکی تایبه‌تیو وه‌ك پرچ و گوریس . چه‌ند شتێکی کونداره که‌ده‌زووی تێ هه‌ل کێشرابێ، وه‌ك ته‌زبێح و مووروو . بریتی یه له شیعر .

[هونکوستێیل] ز. ئه‌موستێیله .

(هزنه) سازیی و ڕێك وپێکیی شت : ئه‌وشته [هزنه]ی دێ ، یا [هزنه]ی ایوه‌دێ یا[هزنه]ئه‌کا، وا ته‌زۆر سازو له‌باره .

(هونه‌ر) کرده‌وه‌یه‌کی جوانی په‌سه‌نده که‌له‌ده‌ست هه‌موو که‌س نه‌یه‌ت .

(هونه‌رمه‌ند) خاوه‌ن هونه‌ر .

(هونه‌رمه‌ندیی) بوونی مه‌ردوم به‌خاوه‌ن هونه‌ر .

(هونه‌روه‌ر) هونه‌رمه‌ند .

(هزنه‌هزن) هزن هزن . نرکه‌ی کێژاوی رووبار .

(هزنیاك) د. هزنراوه .

(هزنیین) د. هزنیینه‌وه .

(هونیینه‌وه) به‌یه‌کاهه‌لپێچانی لیسپی پرچ و گوریس و شتی تر. تێ هه‌ل کێشانی ده‌زووله‌دانه‌ی ته‌زبێح و مووروو و شتی تر. دانانی شیعر .

(هزو) ووته‌یه‌که وه‌رامی یه‌کێکی پێ ئه‌درێته‌وه که‌بانگ ت بکا. هزی جووتیار

(هوودرره) جۆره‌مێشوله‌یه‌کی قاچ و مل درێژی به‌ئالۆشه .

(هووده‌ره) د. مێشه‌سپی

(هوور) با . وورد .

(هوورد) وورد .

(هوورده) وورده .

(هوورر) ل . هزرر .

(هوورره) هوودرره . گرره .

(هوورك) وورك .

(هووشه) خۆهه‌لکێشان له‌قسه‌وکه‌تو‌کۆدا

(هووشه‌ك) جۆره‌درنده‌یه‌که‌وه‌ك پلنگ به‌لام ئه‌م پچووکتره . بزن مژ .

(هووشه‌کاریی) مبالغه‌و پێ‌هه‌لبرریین له هووشه‌کردنا .

( هووشه‌کردن ) خۆهه‌ل‌کێشان .

(هووشه‌که‌ر) که‌سێکه که هاشه‌و هووشه‌ی بێ .

(هووفه) جۆره‌نه‌خۆشی‌یه‌که ئه‌داله چوارپه‌لی وولاخی یه‌ك سم .

(هووكارە) فێر

(هووكارەبوون) فێر بوون .

(هووكارە كردن) فێر كردن .

(هوول) بۆز.

(هوول) بزنی گوێسوور.مەردومی دەموچاوسوور .

(هوولاندن) قوولاندن .

(هوولومزە) هـ . توێكڵی سەوزی گوێز .

(هوولە)قوولە ، (هوولەهوول) قوولە قوول.گیانداری زۆر گەورەكەئادەمیی ئەبێ:ئەمرۆلەدوكان[هوولە] ماسی‌یە كیان كوشت .

(هوولە) هـ. ملە

(هوولەكردن) قوولەكردن .

(هوون)خوێن هـ . ئێوە .

(هوونالوو) خوێناویی .

(هووناو) هـ . خوێناو .

(هوونیی) خوێن رێژ .

(هووها)ووتەیەكەهەللای پێ ئەكرێ لەیەكێك بۆسووكیی .

(هووهوو) ووتەیەكە لەپێش رانەوە ئەووترێ بۆبانگ كردنی رانەكە .

( هۆوهۆو ) هوو هوو .

(هووهووكەرە)جۆرە گوندێ بەبوویەكی چاوشینی سەرز لەهەرلەچۆلیی و شاخا ئەبێ، كەئەخوێنێ ئەڵێ [هووهوو] .

(هۆهۆ)دەنگێكەمەردومی پێ دەنـگ ئەدرێ لە دوورەوە .

( هویرك ) شاتوو .

( هوییرك ) با . قولەپێ .

(هوییل) حۆل . هوول .

(هە) هانێ .

( هەە ) ئەە .

(هەبان) ز. هەمانە .

(هەبوو)بووە :فلانكەس هەرهەبوو بووە .

( هەبوون ) بوون .

( هەبیی ) ز. كنكر .

(هەپروونبوون)تێك شكان ووورد بوونی شتێك كە لەبەرزی یەوە كەوتبێتە خوارەوە

(هەپروون بەهەپروون) شتێكە كەلە بەرزی یەرە كەوتبێتە خوارەوەو وورد و خاش بووبێ .

(هەپش . هـ . ئەسپێ .

(هەپك) جۆرە كەلكییتێكەدەواری پێ ئەكوترێ،كەلاّ كوتك[ز]. پەلاّسی ئەستوور .

(هەپلۆك) هەلەکۆك .

(هەپوو)ووتەیە کەمنالی ساوا بەکاری دینێ لەجیاتی و تەی [نەما] یا [نی یە]

(هەپە)دارێکە بەکرێ بەکونی مژان و ئێرەقدا .

(هەپەنان)بریتی یە لەهەڵخەڵەتاندنی یەکێك و شت لێ دەرهێنانی .

(هەتا)پیتێکە بەکاردێنرێ بۆ دوایی شتێك کەخاوەنی برڕانەوە بێ: [هەتا]دیار بەکر چووم،یابەم کارەوە خەریك بە [هەتا] خوادەرووی بەکت لێ ئەکاتەوە .

بۆهۆیەتی «تعلیل و سببیت»یە : هاتم [هەتا] بت ببینم واتە هۆی هاتنەکەم بینینی تۆ بوو. بۆشەرتە:[هەتا] تۆ نەیەیت من نایەم. بۆ بەستنەوەی شتێکە بەکاتێکەوە: [هەتا]لەجیهانا بیت پێ بژیی ووت ئەوێ

(هەتار) د. تاوێرەبەرد .

(هەتارەکلکل) د. هەتار .

(هەتاف) با . هەتاو .

( هەتاکوو ) هەتا .

(هەتاو) تیشکی خۆر .

( هەتاوبردوو ) شتێکە کە هەتاو شەمزاندبێتی .

(هەتاوکەوتن)کانی هەڵاتنی خۆر .

(هەتاوگاز)شوێنێکەلەئەندام کە هەتاو سووتاندبێتی .

(هەتاوەکوو) هەتاکوو .

(هەتاهەتایی)ووتەیە کە بەکاردێنرێ بۆکاتێك کەنەبڕێتەوە .

(هەتدان) د. تێبەردانی کارو بەرخ

(هەترە)تەرە:مریشکە کەهەترەبووە،

[هەترەبوون]تەرەبوون [هەترەکردن] تەرەکردن .

( هەترەش ) زەندەق .

( هەتوان ) مەلـهەم .

(هەتۆلمەتۆل) د. هەلوور بلوور.

(هەتەد)ووتەیە کە بۆکورتیی ئەنووسرێ لەجێی ووتەی [هەتادوایی] .

(هەتەر) حریص .

(هەتەق)ووتەکەبەکاردێنرێ بۆبڕدنە دواوەی قسەیەك و باوەرپێنەکردنی .

( هەتەك ) د . ناوەك .

(هەتیمە) کونێکی بارییکە لەئاسنێکا زەرورەنگەرتەلی زێروزیوی پیارائەکێشێ بە ئەوێم بۆ لووسی و بارییکی .

(هەتیم) د هەتیو .

(هەتیمچە) هەتیوچە .

(هەتیو) منالی باووك مردوو .

(هەتیوبار) بێوەژنێکە کە هەتیوی بەسەرا کەوتبێ .

(هەتیوباریی) خەریکموونی بێوەژن بەبەخێوکردنی هەتیووەوە .

(هەتیوباز) کەسێکە کەحەزی لە هەتیوی لووس بێ .

(هەتیوبازیی) حەزکردن لەهەتیوی لووس .

(هەتیوچە) مەردومی ناوەچاخ .

(هەتیوچەیی) ناوەچاخی .

(هەتیوخانە) شوێنێکە کەهەتیوی تیا پەروەردە بکرێ .

(هەتیو کەوتن) بوون بەهەتیو بەهۆی مردنی باوکەوە .

(هەتیومەتیو) ووتەیەکە لەرووی سووکی یەوە ئەووترێ بۆ ئادەمیزادی کەچەروکوجەر .

(هەتیوە) هەتیوچە . تەختەدەوارێکی بارییکەلەناوەراستی تەختەدەوارەکانی ترا هەل ئەدرێ .

(هەتیویی) بووفی منال بە هەتیو .

( هەجنیین ) ز . بێ هێزبوون و خاو بوونەوەی جەستە .

(هەچ) بەمانا[هەر]ێکە کە بۆعمومی أفرادی یە : [هەچ] کەس بخوێنێ ئەبێ بە پیاو .

(هەچچە) هەچە .

(هەچکوچ) ه . مێووژ .

(هەچکوچیی) ه . هەچکوچ .

(هەچە) ووتەیەکە کەرو ئێستری پێ لێ ئەخوررێ [هەچەهەچ] هەچەی یەك لەدوای یەك . برێتی یە لە کەروئێستر : سواری [هەچە] مەبە .

(هەچیی) هەرچیی .

( هەدادان ) ئارام گرتن .

( هەدار ) ز . ئارام

(هەدریین) ز . ئارامکرتن .

(هەر) کەر[ه] ووتەی کورت هەل هێنان «حصر» : خوایە [هەر] تۆئەپەرستم . ووتەیەکەبەکاردێنرێ بۆگرتنەوەی هەموو یەکە یەکە یەك « کلی افرادی » [هەر] کەس بخوێنێ ئەبێ بەپیاو . بەمانا هەموو بەش بەشێك « کلی مجموعی » : هەردوکمان ، هەرسێکماز . ووتەی یەك بینەیی «استمرار» : [هەر] ئەخوێنم تا ئەکەم بەئاواتی خۆم .

(هەرا) دەنکوئاژاوە ، [هەراهەرا] دەنکە دەنکی زۆر .

(هەراژ) د . هێلنج .

(هەراس) مەردومی وەررس
(هەراسان) وەررس. ترسان .
( هەراسانیی ) وەررسیی .
(هەراسبوون) وەررسبوون .
(هەراسكردن) وەررسكردن .
(هەراسە) د. ترس‌وبیم . داهۆل
(هەراش)گیاندارو سەوزاییی‌یەكەلە
كۆرپەیی‌تێ‌پەرریی‌بێ . هەراژ .
(هەراش‌ئاووس)بەسكپررێك ئەووترێ
كە لە مانگی نۆهەمیا بێ .
(هەراشبوون گەورەبوون‌وبەخۆداهاتن
(هەراشەهەراش) هەلاهەلا .
(هەرافتن) با.رووخاندن:بەرفیینە
واتە بییررووخێنە .
(هەراكردن) دەنگەدەنگ كردن .
بریتی‌یەلەپێ‌هەلبررین لە هەمووكارو
بارێكا : فیسار كەس لە نان‌خواردنا
[هەرائەكا]واتەقوولەئەكا .
(هەراله) د. هەلاّلە .
(هەرامە)ووتەیەكەوەك‌ووتەی[هیێن]
بەكار دێنرێ .
(هەراوزەنا) هەراوهوریا .
(هەراوكێشە) هەراو زەنایەكە كە
دەست‌وەشاندنی لەگەلاّ بێ .

(هەراوهوریا) هەرا هەرای زۆر .
(هەربوون)د. هەتامەتایی .
( هەرتا ) د. هەتا .
(هەرتاكوو) هەتا .
(هەرتاكە) هەتا .
(هەرتاوكوو) د. هەرتاوەكوو .
(هەرتاوەكوو) هەتاوەكوو .
(هەرتاكیی) هەرتاكوو .
( هەرتك ) د. هەردك .
(هەرتە)هۆرتەیەكەكەدەنگی‌لەگای
جووت پێ‌ئەكرێ .
(هەرجایی)گولێكی‌زۆرجوانەكەلاّی
وەك‌وەنەوشەوایەبەلاّم‌ئەم‌تۆزێ‌گەورەترە
(هەرجن)دارێكی‌كوێستانی‌یەوەك
چوالە ، ئەكرێ بەگۆچان .
(هەرچلە) رەوررەوەیەكەبەرداشی
پێ‌ئەبرێ بە رێكادا .
(هەرچن) د. هەرچەند .
(هەرچۆن) ووتەیەكەبەكاردێنرێ بۆ
گشت‌ئەحوال:هەرچۆنێ‌بێ‌هەرباشە.
(هەرچەن) هەرچەند .
(هەرچەند)ووتەیەكەبەمانا[لەگەل
ئەوەی]: [هەرچەند]تۆنایەیتەلای‌من
بەلاّم من هەر دێم بۆلات .

(هەرچەندە) هەرچەند .
(هەرچەندێ) هەرچەند .
(هەرچێ) د. هەرچیی .
(هەرچی پەرچیی) د. هەرچیی وپەرچیی
(هەرچیی) ووتەیەکە بۆ گرتنەوەی هەموو کەسێك بەکاردێنرێ: [هەرچیی، هەول بدا بە ئاوات ئەگات .
(هەرچیو پەرچیی) مەردومی ناکەس بەچە .
( هەرچێوە ) هەرچی .
( هەرخۆت ) ئەرخۆت .
(هەرد) شوێنی هەلەت و بەردەلانیی.
(هەردك) د. هەردوو .
(هەردوك) هەردوو .
(هەردو) ووتەیەکە بەدووشت ئەووترێ
(هەردە) چۆل و بیابان. زەوییەکی کرداویی بەرز و نزمە .
(هەردەبیر) د. مەردومی راررا .
(هەردەگێل) د. مەردومی ئاوارە کە بداتە کێو .
( هەردەم ) هەمیشە .
(هەردیین) ز. زۆر کولانی گۆشت .
(هەرر) قورر [ه]. سەررەی کەر [د].
(هەرراجکردن) فرۆتنی شت لەناوچەند کەسێکا بەزیاد کردنی نرخەکەی لەسەر یەك لەلایەن خۆیانەوە .
(هەرراکردن) راکردن اەرۆینا .
( هەررشاندن ) با پان و پلییش کردنەوەی شتێك .
( هەررفتن ) با رووخان .
(هەررك) هەررك [د] ووتەی سەر سوررمان [ز] .
(هەررك) قورر .
(هەرركاو) د. قورراو .
(هەررك کاریی) د. قوررەکاریی .
(هەرركیینە) د. کلێنە .
(هەررلەبررنەکردنەوە) بریتییە لە یەکێك کە ەکارێکا زۆر نەشارەزابێ.
(هەررمێن) بازارر کەرمیی شتێك : ئەمررۆ برنج زۆر بەهەررمێنە، واتە برەوی هەیە . یافلان کچ بەهەررمێنە، واتە داواکەری زۆرە .
(هەررە) خشتی رێز کراولەسەرشان. دیواری تیغە. مشار سەررەی کەر [د]
(هەررەپۆپە) د. کەلەشێرێکە کە پۆپنەی وەك مشار وابێ .
(هەررەت) کاتی پێگەیشتنی شت : هاوین [هەررەت] ی میوەیە، یا بەرییمان

[هەررەت] ی ژن هێنانێتی، هەل و پەرژان؛ هەرچەند ئەکەم [هەررەت] م نی یە واتە هەلم نی یە و نام پەرژێت .
(هەررەزاڵە) هەررەزەلە .
(هەررەزەلە) توولەزەررە .
(هەررەشە) ترساندنی یەکێك بە ووتار یا بە کردار [هەررەشە کردن] هەررەشە
(هەررەشەو گوررەشە) هەررەشەی یەك لەسەر یەك .
(هەررەکان و مەررەکان) جۆرە یاری یە کە منالاّن ئەیکەن، وە لەگەل یاری یە کە دا ئەم ووتەیە ئەڵێن .
(هەررە کردن) ریێز کردنی خشت لە سەرشان . برریینەوەی دار بە مشاری هەررە .
(هەررەماسیی) جۆرە ماسیی یە کە کلکی وەك مشار وایە .
( هەررەمە ) گەنمێکە کە لەگەل دانەوێلەی ترا تێکەل کرابێ .
(هەررەهەرر) تێ خوررییین و قررەقرر کردن بەسەر یەکێکا .
( هەررییە ) هارریییە .
( هەرریی ) با . قورر .
( هەرز ) د . هەرێز .
(هەرزاڵ) کە پرێکی نزمە لە مالاّنە کرێ بۆ شت لەسەر دانان، یا لەسەر نوستن .
( هەرزاڵە ) هەرزاڵ .
(هەرزان) شتێکە لە کرریین و فرۆتنا نرخی کەم بێ، [هەرزان بوون] کەم بوونی نرخی شت، [هەرزانکردن] کەم کردنی نرخی شت .
(هەرزان بەها) شتی هەرزانی کەم نرخ . هەرزانجان .
(هەرزانجان) کەسێکە شت بە هەرزان بفرۆشێ .
(هەرزانیی) کاتێکە شتی تیا هەرزان بێ
( هەرزبوون ) د . وێڵ بوون .
(هەرزن) دانەوێڵەیەکی ووردی لووسی بێ پێزە ئەکرێ بە نان .
(هەرزاڵ هەرزاڵ) شتی رزییوی هەلاهەلا .
(هەرزە) مەردومی هەڵەی چڵفرر .
(هەرزەبێژ) کەسێکە کە هەمیشە قسەی هیچ و پووچ بکا .
(هەرزەچەنە) د. هەرزەبێژ .
(هەرزەکار) مەردومی گەنج .
(هەرزەکاریی) دەمی گەنجیی .
( هەرزەگۆ ) هەرزەبێژ .
( هەرزەگۆیی ) ووتنی قسەی هیچ و

پووچ .
( هەرزەگیی ) د. هەرزەیی .
( هەرزەل ) د. هەرزالْ .
( هەرزەمەشق ) نووسینی شت بە بێ مەبەست .
(هەرزەنووس) کەسێکە کەشتی هیچ و پۆوچي بێ مەبەست بنووسێ .
(هەرزەنوییس) هەرزە نووس .
(هەرزەوهۆرزە) د. کورروکالی هەرزە.
( هەرزەویژ ) د. هەرزەبێژ .
(هەرزەیی) هەلەیی و جلفرریی .
(هەرس) وورچ هەرسیی[د] .
(هەرسیی) ه. فرمێسك .
(هەرشتە) نانێکی تەنکی نییوە بژرە ئەچنرێ و ئەکرێ بەچێشت .
(هەرشتەبەترش) چێشتی هەرشتە
(هەرشەو) هەموو شەوێك .
(هەرکۆ) هەرکوێ .
(هەرکۆکە) هەرکوێ .
( هەرکا ) هەردەم .
( هەرکاف ) با . هەرکا .
(هەرگیز) پیپتی تێکررایی یەلە نەبوونی دا : [ هەرگیز ] لە خوێندن دەست هەلْ ناکرم .
(هەرگیس) د. هەرگیز .

(هەرلە) د. هەزارپێ .
(هەرمان) فرمان[م].مانهەتاهەتایی
(هەرمەلّە) ه. هێرۆ .
(هەرمێ) مییوەیەکی زەردی خرری قنچکداری شیرینە .
(هەرمێ بالّەکیی) هەرمێیەکی گەورەی شیینکاری درێژکۆلەیە .
(هەرمێ پشکووان) مانگی مارت کە سیێوەیەك رۆژە .
(هەرمیسك) چنگالّ و ررۆن .
(هەرمێ شیینکە) هەرمێ کێوییلە .
(هەرمێ کێوییلە) جۆرەهەرمێ یەکە کەلەدەشت و شاخ لەخۆیەوە رروابێ .
(هەرمێ گولّاویی) جۆرەهەرمێ یەکی بۆنخۆشی شیرینە .
(هەروبار) ه . داڵییت .
(هەروکییف) هەررەشەو کوررەشە .
(هەرە) پردەلّە[م] . هەموو . زۆر.
(هەرەس) پەلّە بەفرێکی گەورەی زۆرە کەبەقەدشاخەوەبێ و بەزۆێ .
(هەرەس بردن) هەرەس هێنان .
(هەرەسهێنان) داخزان و رووخانی بەفری لاپالّ و داررووخانی کەلّێ شتی تر.
(هەرەوەز) کۆکردنەوەی چەن زەلامێك

بۆ کردنی کارێك بە دەست و بردیی .
(هەرەس) د. ئەمر .
(هەرێ) ز. بەڵێ .
(هەرێز) فرووزوو .
(هەرێکردن) ز. بەڵێن دانی باوك و کەسی کچ بۆ بەشوودانی .
(هەریی) ز. خوریی . کورك .
(هەرییسە) کەشکەك .
(هەرێم) هەرییم .
(هەرییم) ناوچە .
(هەزار) ناوە بۆژمارەیەك کەدەچار سەدە .
(هەزاربەهەزار) سەربەرەوخوارەو هەڵدێرگەیەکی زۆر کوورو سەخت و دووروودرێژە .
(هەزارپا) هەزارپێ .
(هەزارپۆپە) د هەزارپۆپنە .
(هەزارپۆپنە) جۆرە کەڵەشێرێکە کە پۆپنەی تۆپ و پەلپەل بێ .
(هەزارپێ) دەعبایەکی درێژکۆلەی زەردەپێی زۆری هەیە .
( هەزارداستان )ریشۆلە . بلبل .
(هەزاررەگ) د. زۆل .
(هەزارلۆخانە) د. هەزارلۆغانە .

(هەزارلۆغانە) پارچەتەرو افێکی لۆچ لۆچ،لەسکی گیانداراپرڕەلەپیسیی .
(هەزارە) کەتیبەی خشتی سوور . لێواری حەوزە کە ئاوی بەسەرابرڕژێ بەیەك سانیی بۆناوئاوەرێژی دەوری .
(هەرزەکردن) خەولێزڕران و بێ ئارامیی لەخەوەتا: ئیمشەولەداخاهەر [هەزارە]م کردووە .
(هەزبێ) گیا دانوو .
(هەزبێ کینفییلە) د. چاترەکێوییلە .
( هەزبێلە ) هەزبێ .
(هەزبییە) ئەزبییە .
(هەزم) توانەوەی خواردن لەسیبق « معدە » دا .
(هەزوا) تالی شاریی .
(هەزوێلە) هەزبێلە .
(هەزوییە) هەزبییە .
(هەزێلك) با . هەرزال .
(هەزیین) هاژیین .
(هەژار) مەردوومی بێ پارەو پوول
(هەژارکەوتن) دووچاربوون بەهەژاریی
(هەژاریی) بێ پارەو پوولیی .
( هەژان ) هەژیین .
(هەژاندن) با. راوەشاندن. ژەندن.
(هەژدە) ناوە بۆ ژمارەیەك .

(هەژدەمیین) شتێکە کە لە پایەی هەژدەدابێ .
( هەژدەها ) هەژدیها .
( هەژدەهەم ) هەژدەمیین .
(هەژدەهەمیین) هەژدەمیین .
(هەژدیها) ماری زۆرگەورە .
(هەژگ) لق و پۆپی درەخت کە هەڵپاچرابێ . قاچو دەستی گیاندار لەئەژنۆوئانیشك بەرەوخوار: فیسارکەس [هەژگ]ی کورتە .
(هەژگوبژال) چیلکەو چەوێڵ .
(هەژگوهەژال) هەژگوبژال .
(هەژمار) ژمارە .
(هەژماردن) ژماردن .
(هەژمەت)تووررەیی‌وخەفەت‌خواردن
( هەژهار ) د. دانێکی‌زیادەکەلە ئەنشت دانێکی ترەوە بررویێ .
( هەژیار ) د هەژار .
( هەژیر ) با . هەنجیر .
( هەژیین ) با . هاژیان .
( هەس ) خەست .
(هەسار)حەسار.ئەستێل [ە] .
(هەسارە) ە . ئەستێرە
(هەسارەزەررینە)د.کۆلەکەزێررینە
(هەسارەگەررێن)د. ئەستێرەشناس
(هەسارەناس) د. هەسارەگەررێن
(هەسان)جۆرەبەردێکی لووسەتییغی پێ تییژئەکرێ .
(هەسان‌لێدان)بریتی‌یە لە هەڵخەڵە تاندنی یەکێك .
( هەوساو ) سایەقە .
( هەسپ ) ز. ئەسپ .
( هەسپایی ) ئەسپایی .
(هەست)حس‌وپێ‌زانین:بێ[هەست] بچۆرەژوورەوە،واتەبەجۆرێك کە کەس پێت‌نەزانێ.ئێسقان [با] .
(هەستار) ز. فرمێسك .
(هەستان)لەزەویی راست‌بوونەوەو سەرپێ‌کەوتن .
(هەستاندن)راستکردنەوەی شتێك و هێنانەسەرپێی . بێدارکردنەوەی نووستوو .
(هەستانەوە)چابوونەوەلەنەخۆشیی. بریتی‌یە لە دەوڵەمەند بوونەوەدوای نابووتی .
(هەستکار) ئەوشتەیە لە گیاندارا کە هەست بەشت ئەکا «حاسة» .
(هەستکردن) سووسە کردنی شتی

پەنهانی .
(هەست وخوست) جووڵەوچپە،هەر لەنەبوونا بەکاردێنرێ: بێ هەست وخوست کردی بەژوورا،یاهەست وخوستی نی یە
(هەستونیست) بریتی یەلەهەموودارایی مەردوم : [هەستونیست]ی فیسارم بە دەستە .
(هەستە)ز.ئەستێ . چەخماخی چەکەرە داگیرسان .
(هەستەم)د.هێواش: بەهەستەم واتە بە عاستەم .
(هەستیی)ئێستقان[ز] بوون«وجود»
(هەستییف) ز. ئەستێوولك .
(هەسرەوە) ھ . خەسوو .
(هەمس) د. هێزوتەوانایی .
(هەسکۆ) ز. ئەسکوێ .
(هەسکوێ) با . ئەسکوێ .
(هەسکەهەسك) د.هەنکەهەنك .
(هەسکیان) د. هەنسکەبررێ .
(هەسنك) ز. ئاسن .
(هەسوورە) ھ . خەزوور .
(هەسوون) ئەستوون .سوونی تیپخ بە هەسان .
(هەسونییس)د. هەستونییست .
(هەسوهۆڵ) د. خەست وخۆڵ .
(هەسەر) ھ . ئێستر .
(هەسەوبوون)د. خەست بوونەوە .
(هەسێر) ئەستێل .
(هەسێرە) ئەستێرە .
(هەسێرەزێرریینە)هەسوونەزێرریینە
( هەسێل ) د. ئەستێل
(هەسیی) د. خەستیی .
(هەسییرە) ئەستێرە .
(هەش) وورچ [ھ] . خۆم .
(هەشپش) ھ . ئەسپێ .
(هەشپشیی) ھ . هەشپش .
(هەشت)ناوەبۆژمارەیەك کەلەناوەندی حەوت نۆدایە .
( هەشتا ) ناوە بۆ ژمارەیەك کە هەشت جار دەیە .
(هەشتاڵوو) ھ . قۆخ .
(هەشتاڵووکوت) د. قۆخی ووشك کراوە .
(هەشتاو) کەسێکە کەپەلەبکاڵەکارێکا
(هەشتاویی) پەلەودەست وبرد .
(هەشت تیر)دەمانچەیە کە کەهەشت گوللە بخوا .
(هەشت دان) شەشپەرر .
(هەشتگۆشە)شتێکە کەهەشت سووچی

بێ .
(هەشتەم)شتێكە كەلەپایەی هەشتابێ
(هەشتەمیین) هەشتەم .
(هەشتهەمیین) هەشتەمیین .
(هەشتێ) ز. هەشتا .
(هەشت یەك)لەهەشت بەش بەشێك.
(هەشتیەكیی) هەشت یەكێكە كەژن
لەكەلەپووری مێردی منالداری ئەیبا
(هەشتیی) هەشت گۆشە .
(هەشتێر) هەشت تیر .
(هەشەكە) د. هەررەشە .
(هەشیین) ز. شیین . شیینایی .
(هەشیین بوون) ز. سەوزبوونی گیا.
(هەفت) ل . حەوت .
( هەفتا ) ل . حەفتا .
( هەفتانە ) حەفتانە .
( هەفتە ) حەفتە .
(هەفتەكیش) حەفتەكیش .
(هەفتەیی) ل . حەفتەیی .
(هەفتیار) ل . كەمتیار .
(هەفسار) ز. هەوسار .
(هەڤشیی) ز. شوێنێكە پەرژیین
كرابێ بۆ وولاخ تێكردن .
(هەڤكیین) ز. پەیێكە .

(هەخووریی) ز. سابرێنی پێیر .
( هەڤ ) با . هاو .
( هەڤال ) با هەڤال .
( هەڤال ) ز. هاودەم .
( هەڤبەر ) با . هاوتا .
( هەڤبەهر ) ز. شەریێك .
(هەڤدە) ز. حەڤدە .
( هەڤراز )با. هەوراز . دەستەچەپ
( هەڤرازیی ) با هەورازیی .
(هەڤران) با . باراش .
(هەڤرست) با.دارێكەوەك سنەوبەر،
بەلاّم ئەم زۆر بەرز نابێتەوە .
( هەڤرنك ) برنك .
(هەڤرە) ز. ووتەیەكە بەكاردێنرێ
لەجێی ووتەی[پێكەوە]و [تێكررا]
(هەڤریشم) ز . ئاوریشم .
(هەڤلنك) با . ئاوەلزاوا .
( هەڤۆتن ) فێربوون .
( هەڤۆك ) با . رستە .
( هەڤیر ) ز . هەوییر .
(هەك) ز . ووتەی سەرسوررمان.
( هەكە ) ئەگەر [ز]. خارشت .
(هەگبە)خورجولكەیەكی دووتاییە
دائەبەستریّ بەپاشكۆدا .

(هەل) رێکەوتێکە کەقازانجێکی تیا بکەی . نۆرە [د].

(هەل) ووتەیە کەئەچێتە سەرهێندێ ووتەی تر، جوولانەوەیەکی سەر بەرەو ژوورئەگەیەنێ:[هەل]پەررین،[هەل] مالیین .

( هەلئاخنیین ) هەلاخنیین .

( هەلئاوسان ) هەلاوسان .

( هەلات ) درۆی زل .

(هەلاتلێدان) درۆی زل کردن .

(هەلاتن) دەر کەوتنی مانگو رۆژو ئەستێرە لەئاسۆ.راکردن لەترسانا. کێیف کردنی هەوییر . پەررینی نێر لەمێ: ئەسپە کەلەماینە کەهەلات تەواو بوونی ماوەیشت:ژنە تەلاقدراوە کەعدەی هەلات

( هەلاتە ) هەوییری هەلاتوو .

(هەلاج) کەسێکە کەلۆکە بەچەکەو کەوان بکاتەوە .

( هەلاجیی ) کردنەوەی لۆکە بە چەکەو کەوان .

( هەلاخن ) دەفرێکی چەراوە کە ئاخنرابێ لە شت .

( هەلاخنران ) پرربوونی دەفرێک چەراوە لەوشتەی کەتێی ئەکرێ .

(هەلاخنیین)پرر کردنی ئەودەفرانەی کەئەکشێن و پەستان و تێ ترنجاندنی بە جۆرێك کەهەل بئاوسێ. بریتی یە لەپرر جوێن کردنی یەکێك : فیسار کەسیان [ هەلاخنیی ] .

( هەلار ) د شەقار، [هەلارهەلار] شەقار شەقار .

( هەلاژیان ) پالکەوتن .

( هەلاژیین ) هەلاژیان .

(هەلاش) زەلوکەلایەکە کە لەسەر دارە رراوە دابنرێ بە ئەستووریی

(هەلافیتن)ز. هەلدانی شت سەرەوژوور

(هەلاکان) د. هەناسکەبرر کێ .

(هەلا کەوتن) لاچوون .

(هەلال) شتێکە ئەکرێ بەپێسنەوە بۆئەوەی کەزوو پێستە ررن بکرێ.

(هەلالخانە) دەباخانە .

(هەلالە) هەلال . گولێکی جوانی بۆنخۆشی کوێستانی یە.شتێکە هەنگ لە گولی ئەکری و شانی پێ هەل ئەبەستێ. بانکەواز[د].توزی نێرومێی رووەك بۆ متر بەبوون .

(هەلالەبرمە) گیایەکی بەهاریی یە نێر کێکی درێژی هەیە گولێکی گەورەی سوورئەگرێ بنی پەررەکانی لەدیوی ناوەوە

رەشەو چاڵێکی سپی تیایە .
(هەلالەکشکش) د. چۆپیی‌و سەما کردن .
(هەلامات) هەلامەت .
(هەلامسان) هەڵاوسان .
(هەلامەت) دەردێکە لە سەرماوە تووشی مەردوم ئەبێ ، ئاو بەلووتیا دێتە خوارەوە .
(هەلامەتدار) کەسێکە کە تووشی هەلامەت بووبێ .
(هەڵاو) هالاو .
(هەڵاواردن) جیاکردنەوە .
(هەڵاواستن) هەڵواسیین .
(هەڵاواسیین) هەڵاواستن .
(هەڵاوسان) ئاوسان‌و بەرزبوونەوە
(هەڵاووردن) دەردی لێ‌هاتن . هەل هێنانی هێلکە . زانیینی مەتەل .
(هەڵاوردە) دەردی لێ‌هاتن .
(هەلاوە) گیایەکی کوێستانی‌یە لە بەررەزائەچێ لەناو دەوەنا ئەرروێ.
(هەڵاوە) ه . چاو .
(هەڵاوەستن) هەڵاوەسیین .
(هەڵاوەسراو) هەڵواسراو .
(هەڵاوەسیین) هەڵواسیین .
(هەڵاوەگیرر) هەڵگیرراوە.
(هەڵاوێر) هەڵاواردنی بەرخ‌و مەرر . یا کاروبزن .
(هەڵاوێردن) هەلاواردن .
(هەڵاوێز) د . ئاوێزان .
(هەڵاوێژان) هەڵاویشتن .
(هەڵاویستن) یا . هەڵواسیین .
(هەڵاویشتن) خواردن‌و قووتدانی شتێك بەهەڵپە.دەرکردنی شتێك لەشتێك « استثناء » .
(هەڵاوییتیین) هەڵاویشتن .
(هەڵاوییژتن) هەڵاوییتن .
(هەڵئەنکووتن) پێ هەڵکەوتن لەرێ‌ینا
(هەلاهەل) گیاندارێکی زەهردارە. زەهری کوشندە .
(هەلاهەلا) شتی لەت‌و پەت [هەلاهەلا بوون] لەت‌و پەت بوونی شت [هەلاهەلا کردن] لەت‌و پەت کردنی شت .
[هەلایەهەل] گیانداری هەلاهەل .
(هەلایسان) هەڵگیرساندن .
(هەڵبچرریین) د. هەڵپچرریین .
(هەڵبرران) جوێ بوونەوەی دووگیاندار لە یەك .
(هەڵبررسقان) د. رفاندنی شتێك لە

لە یەکێك .
( هەلبرسکان ) هەلبزرکان .
( هەلبرریان )د. هەلبررین و بەرز کردنەوەی شتێك .
(هەلبررین) بەرز کردنەوەی شتێك. راونان . هەلدررینی شت بەچەقۆ.
(هەلبرینکان)هەلبرنکان .
(هەلبرژان)د.هەلقرچان لەبەرتینی کەرمیی .
( هەلبرژیان ) د . هەلبرژان .
( هەلبرنکان ) هەلبورنکان .
( هەلبزرکان ) رەنگ پەرریینی مەردوم لەترسایالەتەرییقیدا. زەردو سییس بوونی سەوزایی.تیکچوونی شیر.
(هەلبژاردن)پەسەند کردنی شتێك لە ناوچەن شتێکاو هەلکرتنی .
( هەلبژاردە ) شتی یەکەیەکەی پەسەندکراو .
( هەلبژانن ) د . هەلبژاردن .
( هەلبژنیاك ) د . هەلبژێرراو.
(هەلبژنیین) د . هەلبژاردن .
( هەلبژیاك ) د. هەلبژنیاك .
( هەلبژێرراو ) شتی هەلبژاردە .
( هەلبژیین ) د . هەلبژاردن .
( هەلبکاردن ) هەل بوواردن .

( هەلبلۆزقان ) هەلبلۆزقیین .
(هەلبلۆزقیین)جوولانەوەی گیانداری لە سەر زەویی وەك جوولانەوەی ماسیی لە سەرزەویی و مار لە پاش سەرپانکرنەوەی.
(هەلبلۆزقیینەوە)هەلبلۆزقیین ـە
( هەلبلووقانەوە )هەلبلۆزقیینەوە .
( هەلبورنکان ) رەوییەنەوەی هەورو تەمانی باران .
(هەلبوواردن) بوواردن و پەرراندنی شتێك لەناو چەن شتێکا ناوبەناو .
( هەلبوون ) داگیرسان .
(هەلبەت) ووتەیەکە بەکاردێنرێ لە شوێنێکا کە مایەی شتێك دیار نەبێ : تەلەفۆنم کرد بۆ مالی فلانکەس کەچی جوابیان نەبوو ، تۆش ئەلێیت هەلبەت لەوێ نەبوون .
( هەلبەتە ) هەلبەت .
(هەلبەزودابەز)خۆبەرزکردنەوەو باز دەلبازدی گیاندار .
( هەلبەزهەلبەز )هەلبەزودابەز .
(هەلبەزیینەوە) بەرز بوونەوەی شتێك بەهێزی کەوتنی لەشتێکی ترەوە بەنهێم.
( هەلبەست )شتی درۆی دروست کراو . شیعر

( هەڵبەستراو ) ووتاری درۆی ڕێك خراو . گۆرانیکە کە بەبەرد بەرز کرابێتەوە لە زەویی. چەفتەو مشکیی و هێندێ شتی ترە کەریشۆ کەی بادراویی. شیعر .
(هەڵبەستن)ڕێکخستنی قسەی درۆ. بەرز کردنەوەی گۆڕ بەبەرد . باهانی ریشووی قەراغی چەفتەومشکی و شتی تر . ڕێکخستنی شیعر .
(هەڵبەستنەوە)گرتنەوەی شوێنی شکاو لە ئەندام .
( هەڵبەستە ) هەڵبەستراو .
( هەڵبەسە ) د. هەڵبەستە .
( هەڵبەسیاك ) د. هەڵبەستراو .
(هەڵپاچان)کیایەکی بەهارییە وەك سێپەرزە وایە بە کوتراویی لەگەڵ ڕۆنا تێکەڵ ئەکرێ بۆ کەچەڵیی زۆر باشە .
(هەڵپاچین) بڕینی لقی قەدی دارو درەخت . کورت کردنەوەی مووی گیاندار بەمەقەست .
(هەڵپچڕران )لەیەك بەربوونی شتی دوراو .
(هەڵپچڕراندن) لەیەك بەردانی شتی بەیەکەوەدرواو یا بەیەکەوەنووساو بەنهێنی

(هەڵپچڕراویی) عاستی هەڵپچڕرانی شت .
( هەڵپچڕرکان ) هەڵوەریین .
( هەڵپچڕرکاندن ) هەڵوەراندنی پەڕەی گوڵ و گەڵای درەخت و گیا.
( هەڵپچڕریین ) هەڵپچڕراندن .
( هەڵپچوورکان ) هەڵپچڕرکان .
(هەڵپچوورکاندن) هەڵپچڕرکاندن .
( هەڵپڕچانن ) هەڵپڕوسکاندنی شتێك لەدەست یەکێك .
(هەڵپڕوزقانن)هەڵپڕوسکاندن.
(هەڵپڕوسقاندن) هەڵپڕوسکاندن.
(هەڵپڕوسکاندن) فڕراندنی شتێك لە دەست یەکێك .
(هەڵپڕووزان) نیوە سووتانی هێندێ شت : لفکەکە یاکەنمەکە یاگۆشتەکە [هەڵپڕووزا] .
( هەڵپڕووزاندن )نیوە سووتاندنی هێندێ شت .
(هەڵپڕووزانن)هەڵپڕووزاندن .
( هەڵپڕووکان ) هەڵپڕووزان .
(هەڵپڕووکاندن) هەڵپڕوزاندن .
(هەڵپڕژان) بڵاوبوونەوەی پڕریشکی ئاو بەهۆی شتێکەوە کە تێی کەوێ .

(هەڵپروانن) پروانندنی کوڵی کەنم و جۆوهێنندێ شتی تر بەسەریەکا .
(هەڵپروانن) د. هەڵپرواندن .
(هەڵپرریواندن) هەڵپرواندن .
(هەڵپزکران) بزررکانی شیر .
(هەڵپشافتن) هەڵفلییقان. هەڵکلۆفتن.
(هەڵپشاوتن) هەڵپشافتن .
(هەڵپشکووتن) هەڵپەررینی وورده بریین بە ئەندام .
(هەڵپلۆخان) داپلۆخان .
(هوڵپلۆسکانن) د. کوشتنی گیانداریك
(هەڵپلۆسکیاك) د. گیانداری مردوو.
(هەڵپە) پەلەپەل کردن لەخواردن و کاروباردا، [هەڵپەهەڵپ] هەڵپەی یەك لەدوای یەك .
(هەڵپەرداوتن) کۆکردنەوەو ریك خستنی ناومال. بەچاوەوە کردنی شت و زیان پێ گەیاندنی. هەڵپاچینی لق و پۆپی دارودرەخت.
(هەڵپەرراندن) سەماکردن بەگیاندار. پەرراندن و لێ کردنەوەی کەمێك لە شتێك بەنهێنی: لەبەردەکەی دا توزێکی لێ هەڵپەرراند .
(هەڵپەرردا پەرر) هەڵپەرروداپەرر.
(هەڵپەرر کێ) هەڵپەررینی چەن کەسێك بەرییز .
(هەڵپەرروداپەرر) هەڵبەزوودابەز.
(هەڵپەررهەڵپەرر) هەڵپەررو داپەرر
(هەڵپەررین) خۆ هەڵخستنەوە لە خۆشیانا . جۆرێ بوونەوەی تەڵەزمێك لە شتێکی رەق .
(هەڵپەرست) کەسێکە بۆ قازانجی خۆی هەرکێز هەڵ لەدەست نەدا .
(هەڵپەساردن) پاڵدانی شتێك بەشتێکی ترەوە لەسەرباری درێژیی بۆ ئەوەی کە نەکەوێ .
(هەڵپەسارده) هەڵپەسێرراو .
(هەڵپەسێرراو) شتێکە کە پاڵ درابێ بە شتێکی ترەوە .
(هەڵپەل) دارێکە هەڵ پاچرابێ تانزیبك تەوقەسەرەکەی بۆ ئەوەی راست هەڵچێ
(هەڵپەنمان) هەڵئاوسان .
(هەڵپەنمانن) د. داچلەکاندن .
(هەڵپەنمیین) د. داچلەکیین . ئاوسان
(هەڵپێچ) لوولدانی سەری [بن تیبك] و درووونی .
(هەڵپێچان) خڕ هەڵدانی بەری میوە: ترۆزیی و خەیارە کە بەریان [هەڵپێچاوە]. ئەنکەناو کردنی یەکێك لەسەر شتێك:

قەرزار[هەڵی پێچاوم]٠هەڵپێچکردنی کاڵا.
ئەمانی‌شتێك لەئارادا:خوا ئەم دەورو
دووکانە [هەڵپێچێ] .
(هەڵپێچران)ئەنکەتاو کردنی یەکێك
لەلایەن یەکێکی ترەوە: ئەریمان چاك
لێی هەڵپێچراوە .
(هەڵپیچیاك) د. هەڵپێچراو .
(هەڵپێچیان) د. هەڵپێچران .
(هەڵپێکان)ئەلقەریز کردنی دەرکا .
هەڵپێچان .
(هەڵپێکران) داخراني ئەلقەرریزی
دەرکاو شتی‌تر .
(هەڵپێکیان) د. هەڵپێکران .
(هەڵپییت) هەڵپەل .
(هەڵپییتاندن)هەڵپاچینی درەخت.
هەڵجیپاندن .
(هەڵترراندن) هەڵدان‌وهەڵکێشاني
یەکێك بەدرۆ ناررەوا .
(هەڵترنکانن) د. هەڵتوزانن .
(هەڵتروشکان)چیچکە کردن‌وخۆ کزۆڵە
کردن .
( هەڵترەکان )د. هەڵپیچرران .
(هەڵترەکیان) د. هەڵترەکان .
(هەڵتلۆیان) هەڵتلۆپین .

(هەڵتلۆپین)بریتی‌یە لەمردن ، ئەم
ووتەیە بۆسووکیی ئەووترێ .
(هەڵتلیشان)درراني‌شت لەرراستیی
سەربەرەوژوور .
(هەڵتلیشاندن) درراندني شت لە
رراستیی سەربەرەوژوور .
(هەڵتۆرران) هەڵتییزان .
(هەڵتۆرراندن) هەڵتییزاندن .
( هەڵتوروشکان ) هەڵتروشکان.
( هەڵتۆقان ) هاڵتۆقیین .
( هەڵتۆقیاك ) د. هەڵتۆقییو .
(هەڵتۆقیان) د. هەڵتۆقیین .
(هەڵتۆقیین)بەرزبوونەوەی شوێنێك لە
ئەندام بەهۆی زەبرێ کەیغتنیەوە سەر
دەرهێنانی کارکودومەڵان لەزەویی .
(هەڵتۆقییو)شوێنێکە کە هەڵتۆقی بێ.
(هەڵتووتان) چیچکە کردن .
(هەڵتووتیان) د. هەڵتووتان .
(هەڵتوورران) هەڵتۆرران .
(هەڵتووrراندن) هەڵتۆرراندن .
(هەڵتووزان) [illegible]خلیسکان .
(هەڵتووزیان) د. هەڵتووزان .
(هەڵتەقان) هەڵپچرراني دروومان.
لەیەك کەوتني دووشت:ئەودوو ئۆتۆمۆبیلە

بەیەکا [هەلتەقان] .
(هەلتەقیان) د. هەلتەقان .
(هەلتەقین) هەلتەقان .
(هەلتەکان) هەلوەشان. سوختبوونی یەکێك لەدارایی: فیسار کەس [هەلتەکاوە] واتە هیچی نەماوە .
(هەلتەکاندن) هەلوەشاندن . دارایی نەهێشتن بەیەکێك و سوخت کردنی . تەتەلە کردنی برنج و توو تن و شتی تر بەسەیینی یا بەلەنکەریی. راوەشاندنی هێندێ شت . هەلپچڕاندن .
(هەلتەکوبەلتەك) زۆر هەل کرتن و دانانی شتێك .
(هەلتەکوداتەك) بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی شتی سەرپشتی وولاخ .
(هەلتەك هەلتەك) تەکە تەك کردنی ئەندام و کالای مەردوم لە ڕۆینا .
(هەلتەکیان) د. هەلتەکاندن .
(هەلتەکین) هەلتەکان .
(هەلتیزان) راکردن و جووتەوەشاندنی کوێ درێژ .
(هەلتیزاندن) هەلتیزان .
(هەلجووزان) د. هەلتووزان .
(هەلجیپاندن) ساز کردن و قوت کردنەوەو پێك هێنانی شت بەکەم و کووڕیی

(هەلچ) ه . قارچك .
(هەلچرچان) هەلقرچان .
(هەلچرچاو) د. شتێکە چرچ بووبێ
(هەلچرچیاك) د. هەلچرچاو .
(هەلچرچیان) د. هەلچرچان .
(هەلچنراو) چەن شتێکە کەلەسەر یەك ریز کرابێ. شتێکە کە چنرابێتەوە
(هەلچنیاك) د. هەلچنراو .
(هەلچنین) دانانی چەن شتێك یەك لە سەر یەك و چیین لەسەر چیین. چنینەوەی شتی رژاو لەسەرزەویی بەدەست یا بە دەندووك .
(هەلچۆ) مەردومی تێ هەلچۆ .
(هەلچۆرران) هاتنە خوارەوەی شتی شل لەدەفری سەر بەرەوخوار کراو .
(هەلچۆرراندن) خوار کردنەوەی دەفر بۆ هاتنەخوارەوەی شتێکی شل لێی .
(هەلچۆرریان) د. هەلۆچرران .
(هەلچۆررین) هەلچۆرران .
(هەلچۆقان) هەلچۆقین .
(هەلچۆقین) هەل لەرزین لەسەرمانا
(هەلچوون) هەل کفان و بەرزبوونەوەی شتی شل لەسەر ئاگر لەکاتی قولپدانیا. بازد بردن بەسەر ئەو کەسەی کەلەیاریی یا

دانەبێ ،بەرزبوونەوەی دارو درەخت .
بریتی یە لەتووڕەبوون.
(هەڵچەرخان) وەرچەرخان .
(هەڵچەرخاندن)وەرچارخاندن .
(هەڵچەرخیان) د. هەڵچەرخان .
(هەڵچەرخیین) هەڵچەرخان .
(هەڵچەقیین)چوونی دڕر کودەرزیی بە ئەندامدا .
(هەڵخرراندن)خررهەڵدانی هێندێ شت بەدەست وەك کفتەو سەلکەترخێنە • بریتی یە لەپێك هێنانی هێندێ شت بە پەنهانیی .
(هەڵخررپاك) د. هەڵخرراو .
(هەڵخرریان) د. هەڵخرران .
(هەڵخزان) هەڵخلیسکان .
(هەڵخزیان) د. هەڵخزان .
(هەڵخزیین) هەڵخزان .
(هەڵخستن)بڵاو کردنەوەی شتی تەرر بۆ ووشك بوونەوەی. هەڵدانی مێیچ لە یاریی دا. فڕێدانی شت. دروست کردن و بەرزکردنەوەی خانووبەرە: وەستا کە ئەم خانووەی جوان[هەڵخستووە] .
(هەڵخستنەوە)قونەکردنو هەڵپەڕڕیین لەخۆشیانا: فیمارکەس لەخۆشیاناهەر خۆی [هەڵ ئەخاتەوە] ،
(هەڵخلانن)خررەخرر کردن بە شت. هەڵخرراندن .
(هەڵخلەتان) هەڵخەلەتان .
(هەڵخلەتاندن) هەڵخەلەتاندن .
(هەڵخلیسکان)خزانی پێ لەشوێنی خۆ.
(هەڵخلیسکاندن)خزاندنی پێ ی یەکێك
(هەڵخواز) هەڵپەرست .
(هەڵخوراندن) خوراندنی شوێنێك لە ئەندام بە توندیی .
(هەڵخۆزانن) د. هەڵبەزاندنەوە .
(هەڵخۆزتن) د . هەڵبەزینەوە .
(هەڵخۆزیین) د. هەڵخۆزتن .
( هەڵخۆستن ) د. هەڵخۆزتن .
(هەڵخۆندن)ووتنی شتی خراپ بەسەر یەکێکا .
( هەڵخۆنن ) هەڵخۆندن .
(هەڵخەلەتان)فریوخواردنی مەردوم
(هەڵخەلەتاندن)فریودانی یەکێك بە قسەی درۆ .
(هەڵداشتن)خستنەخوارەوەی شتێك لە بەرزی یەکەوە .
(هەڵدان)فڕێدانی شت بۆلای ژوورەوە.
ژمارە کردنی شت لەدوای یەك بە ناو

بردنیان: فیسار کەس چی بەسەرهانبوو هەمووی [هەڵدا]. مەدح کردنی یەکێك بەدرۆ بۆ لاسدانی. هاتنەقسەی یەکێك بەبێ ئەوەی رووی تێ بکرێ: تالێت نەپرسن لەهیچ قسەیەکا [هەڵمەدەرێ] .

(هەڵدانەوە) لابردنی سەری شتی داپۆشراو. پەیابوونەوەی برینیانەخۆشیی کۆن. سەوزبوونەوەی داروردەخت وشینایی کۆن لەسەر ریشە کەیانەوە .

(هەڵدران) درانی شت لە باری درێژیی .

(هەڵدراویی) عاستی هەڵدرانی شت

(هەڵدریاك) د. هەڵدراو .

(هەڵدریان) د. هەڵدران .

(هەڵدریین) درینی کاڵا لەسەرباری درێژیی. هەڵکەندنی زەویی بەدرێژیی و قووڵی .

(هەڵدراو) شتێکە لەرراستەدرواپێ.

(هەڵدروو) هەڵدراو: هەڵدرووی کە واتە بییکە بە هەڵدروو .

(هەڵدروون) لەیەك دانی پارچەی کاڵا بەتەقەڵ لەسەرشان .

(هەڵدوراو) هەڵدراو .

(هەڵدوریاك) د. هەڵدراو .

(هەڵدوروون) هەڵدروون .

(هەڵدوریان) د. هەڵدروون .

(هەڵدوریین) هەڵدروون .

(هەڵدۆشین) دۆشینی مەمکی ئافرەت

(هەڵدووریین) هەڵدوریین .

(هەڵدێر) هەڵدێرکە .

(هەڵدێران) کەوتنەخوارەوەلەشوێنی بەرز .

(هەڵدێراو) گیاندارێکە کە لەبەرزیی یەوە کەوتبێتە خوارەوە .

(هەڵدێرکە) جێی سەختی زۆرلێژ.

(هەڵدێریاك) د. هەڵدێراو .

(هەڵدێریان) د. هەڵدێران .

(هەڵرژان) رژانی شت سەربەرەو خوار بە هوروژم .

( هەڵرژاندن ) هەڵرشتن .

(هەڵرژاو) شتێکە کە بەهوروژم هەڵرژابێ .

(هەڵرژیاك) د. هەڵرژاو .

(هەڵرژیان) د. هەڵرژان .

(هەڵرشتن) رشتنی شت بەهوروژم .

(هەڵروانیین) روانیین و چاو برریینە شت بەبەرزیی .

(هەلز) ز. هەلز .

(هەلز) گیایەکی کوێستانی یە ئەدرێ بە ئاژەلو بەرزە وولاخ وەرزنەکەی ئەکیبرێ بۆکوشتنی کرمی بریینی ئاژال، وەبەناسکی ئەخورێ .

(هەلزران) د. جۆشدانی شتێك لە سەر ئاگر .

(هەلزرران) هەلتلییشان .

(هەلزرراندن) هەلتلییشاندن .

(هەلزرنکانن) د. ماندانی یەکێك لە سەر شتێك .

(هەلزریان) د. جۆشدان .

(هەلزلەپان) هەلزلەپیین .

(هەلزلەپیین) ئاوسان وسوور بوونەوەو بلۆق کردنی ئەندام .

(هەلزنیین) هەلکەرران بەقەدشتا .

(هەلزووران) هەلپرروزان .

( هەلزەقیینەوە )هەلبەزیینەوە .

( هەلژلیویان )د. هەلشێوانی شتێك. پێچ خواردن .

(هەلژماردن)ژماردنی شت یەکە یەکە.

( هەلژماردە )شتی ژمێراو . شتی هەلبژاردە .

(هەلژمێرراو)شتێککە ژمێررابێ. شتی هەلبژێرراو .

(هەلسان) راست بوونەوەی گیاندار بۆ سەرپێ . بریتی یە لەبەرز بوونەوەو بەخۆداهاتنی سەوزیی. بریتی یە لەهاتن و زۆربوونی ئاوی چەم. رەقبوونی چووکی نێر .

(هەلساندن)راست کردنەوەی گیاندار

( هەلسانن ) هەلساندن .

( هەلسانەوە ) کەوتنەوە سەرپێی نەخۆش. بریتی یەلەدەولەمەندبوونەوەی کەسێك کەهەژار کەوتبێ .

(هەلسپاردن)هەلپەساردن .

(هەلسپێرپاك)د.هەلپەسێرراو .

( هەلستان ) هەستان .

( هەلسووران ) چەرخیین و خولاندنەوەی شت. ئامادەبوونی کارێك.

(هەلسووراندن)خولاندنەوەی شت. ئامادەکردنی کارێك .

(هەلسووریان)د.هەلسووران .

( هەلسەنکاندن ) تاقی کردنەوەی سووکی وقورسیی شت بەبەرز کردنەوەی.

( هەلسەنکانن ) هەلسەنکاندن .

(هەلشاخان)توورەبوونو شاتاندن بەسەر یەکێکا .

( هەلشاخیین ) هەلشاخان .

(هەلشلنکاندن)لاف لێدان بە کردنی کارێك و تەواو نەکردنی : خۆی هەلشلنکان و کەچی هیچییش .
(هەلشنکاندن) هەلشلنکاندن .
(هەلشلەپاندن) هەلکوشیین و بەیەکا دانی شت .
(هەلشماردن) د. هەلژماردن .
(هەلشەنکاندن) هەلشلنکاندن .
(هەلشێلان)شێلانی شت بەسەریەکا.
(هەلشێوان)تێکەلاوبوونی شت بەسەر یەکا . تێکچوونی دل .
(هەلشێواندن) تێکەلاو کردن .
(هەلشێوانن) هەلشێواندن .
(هەلشێویان) د . هەلشێوان .
(هەلفرتاندن) د. دەستپێوەنان و دەرکردن .
(هەلفرراندن) بال پێ گرتنەوەی بالدار. بریتی یە لە ئاوارە کردنی یەکێك لەجێ و رێی خۆی .
(هەلفرر و هەلفرر)بالەفررە کردنی بالدار
(هەلفررین)بالگرتنی بالندە و کاوتنە حەوای .
(هەلفرییوان) هەلخەلەتان .
(هەلفرییواندن) هەلخەلەتاندن .

(هەلفلێقاندن) د. هەلفلییقاندن .
(هەلفلییقاندن)شێواندن و گوشیینی شت بەسەریەکا .
(هەلفلییقاوە ) شتێکە کە بەسەریەکا فلییقابێتەوە .
(هەلفلییقیاك) د. هەلفلییقاوە .
(هەلفلییقیان)د فلییقانەوەی شت .
(هەلقاچیین) هەلپاچیین .
(هەلقرچان) کرژبوونی شت لەبەر تیینی گەرمیی .
(هەلقرچاندن) لێو هەلقورتاندن لە یەکێك .
(هەلقرچاو) شتێکە کە کرژبووبێ لە بەرتیینی گەرمیی.لێوێکە کە هەلقورتابێ
(هەلقرچیاك) هەلقرچاو .
(هەلقرچیان) د. هەلقرچان .
(هەلقلتیان د.جۆشخواردنی شتی شل
(هەلقلییشان)لەتبوونی دار لە باری درێژیی .
(هەلقلییشاندن) لەتکردنی دار لە باری درێژیی .
(هەلقورتان)خۆقوتکردنەوە و تێچوون لە کارێکا .
(هەلقورتاندن) لچ خوار کردنەوە لە یەکێك بە مۆرریی یەوە .

(هەڵقورتیان) د. هەڵقورتان .

(هەڵقورراندن) خواردنەوەی شتی شل بەرەنكێك كەدەنگی لێوەبێ .

(هەڵقورران) د. هەڵقورراندن .

(هەڵقوڵان) هەڵقولین .

(هەڵقولتان) د. هەڵقورتان .

(هەڵقولتیان) د. هەڵقولتان .

(هەڵقولیان) د. هەڵقوڵان .

(هەڵقولین) هاتنەدەرەوەی ئاو لەزەویی بەقولپ. بریتی یەلەپەیابوونوقوت بوونەوەی یەكێك كوتوپرر: ئەوەلەكوێوە [هەڵقوڵایت] .

( هەڵقونهەڵقون ) قونەقونكردنی گیاندار .

(هەڵقونیان) د. پەیدابوونی شتێك كوتوپر

(هەڵقونین) خۆهەڵخستنەوەوقونەكردن

( هەڵقەمچـان ) خوار بوونەوەو هەڵكەررانەوەی شت .

( هەڵقەندن ) هەڵكەندن .

( هەڵكاڵان ) هەڵشاخان .

(هەڵكالیان) د. هەڵكالین .

(هەڵكالین) هەڵشاخان .

(هەڵكرچان) هەڵقرچان .

(هەڵكرچاندن) هەڵقرچاندن .

(هەڵكرچیان) د. هەڵكرچان .

(هەڵكرد) كوزەرانوورابوواردن: ئەمە بازاررم بێ[هەڵكرد]م نابێ .

(هەڵكردن) داگیرساندنی چراو ئاگر. بەیابوونی با : رەشەبا[هەڵی كرد]. هەڵدان وبڵاوبوونەوەی بەیداخ. لادانی ئاو لەشوێنێكەوە بۆشوێنێكی تر : ئاوەكە [هەڵكەرە] سەرمەرەزەكە. كۆكردنەوەی بەنودەزووالەسەرشتێك. گوزەران كردن: لەكەڵ تۆ[هەڵنا كەم]. گورج كردنەوەی شت : داوێنت [ هەڵكە ] .

(هەڵكرراندن) خوراندنی شوێنێك بە نینۆك بەجۆرێك كەكررەی لێوەبێ . بریتی یەلەزانینی شتێكی كەم لەباسێكی نووسراوی گران: تۆزێكم لەدەرسەكەم [هەڵكرران]. پەیاكردنی شتێكی كەم بەچنگەكررێ: بەشی گوزەرانی ئیمرۆم [هەڵكرران] .

(هەڵكرن) ز هەڵكەندن .

(هەڵكریان) د هەڵكردنی رییس.

(هەڵكزان) سووربوونەوەی شت لەسەر ئاگر .

(هەڵكزاندن) سوور كردنەوەی گۆشتو دووگ لەسەر ئاگر .

(هەڵكزانن) د. هەڵكزاندن .

(هەڵکزیان) د. هەڵکزان .
(هەڵکشان) بەرەوژوور بوونەوەی شت
(هەڵکشاو) بریتی یە لەمەردومی بالاّ بەرز. شتی هەڵکێشراو.
(هەڵکشاویی) ئەلفێکی بچکۆلەیە لەسەر پیتێکی عەرەبی دائەنرێ کە ئەلفی بەدەمەوە بێ .
( هەڵکشیان ) د. هەڵکشان .
(هەڵکفان) هەڵ‌زلە بیین و ئاوسانی جەستە. هەلاّتن و بەرزبوونەوەی هەویر. هەڵچوونی چێشت لەسەر ئاگر .
(هەڵکفاندن) بەئەسکوێ هەڵکرتن و تێکردنەوەی شتێك کە لەسەر ئاگر هەڵ چێ
(هەڵکفانن) د. هەڵکفاندن .
(هەڵکفیان) د. هەڵکفان .
(هەڵکفیین) هەڵکفان .
(هەڵکلاّشیان) د. هەڵکلاّشیین .
(هەڵکلاّشیین) د. هەڵکڕاندنی جەستە
(هەڵکنیاك) د. هەڵکەنراو .
(هەڵکوتان) شتی کالاّ بە کرمۆلەیی و کوتانی بەسەر شتێکا. هەڵکوتانەسەر شتێك
(هەڵکوتاندن) شتی کالاّ بە هەڵکلۆفتنی و دانی بە شتێکا .
(هەڵکوتانن) د. هەڵکوتاندن .
(هەڵکوتانەسەر) پەلاماردان و چوونە سەر شتێك بە چالاکیی .
(هەڵکوتیەڵکوت) خۆکوتان و هاتی لەڕێ یەکی دوورەوە بۆمە بەستێك .
(هەڵکوتیان) د. هەڵکوتان .
(هەڵکورڕووزان) هەلپڕووزان .
(هەڵکورڕووزاندن) هەلپڕووزاندن
(هەڵکورڕووزانن) هەڵکورڕووزاندن
(هەڵکولۆشاندن) د. هەڵکۆلیین .
(هەڵکولۆشانن) د هەڵکولۆشاندن .
(هەڵکولۆشیان) د. هەڵکۆلیین .
(هەڵکولۆشیین) د. هەڵکۆلیین .
(هەڵکۆلیین) هەڵکەندنی شتێك بەقوولیی
(هەڵکەرڕانەوە) د. هەڵکەرڕاندنەوە
( هەڵکەفت ) د. هەڵکەوت .
(هەڵکەفتێك) د هەڵکەوتوو .
(هەڵکەفتن) د. هەڵکەوتن. هەڵەنگووتن
(هەڵکەندن) دەرهێنانی شتێك لەشتێك بەتەپێم. کۆلیینەوەو هەڵکێڕرانەوەی هەموو شتێك . نووسین لەسەرمۆر.
(هەڵکەنراو) شتێکە کەلەبن دەرهێنرابێ
(هەڵکەنن) د. هەڵکەندن .
(هەڵکەنیاك) د. هەڵکەنراو .
(هەڵکەوت) ڕێکەوت .
(هەڵکەوتن) هەڵئەنکوتن. ڕێکەوتن. پەیدابوونی شتێك لەناوچەندشتێکی ترا

زۆر بەباشیی .
(هەڵكەوتوو)شتێكی زۆر چاكی نایابە لەناو چەن شتێكی ترا .
(هەڵكەوتە) هەڵكەوتوو .
(هەڵكەهەڵك) د. هەنكە هەنك .
(هەڵكێشان) دەرهێنانی شتێك لە شتێكی تر بەزۆرێم.هەڵدانی یەكێك بە درۆ بۆلاسدانی.بەرزكردنەوەی شتێك لە چاڵایی‌یەوە بۆ بەرزیی .
(هەڵكێشیان) د. هەڵكێشان .
(هەڵكرتن)كرتنی‌شتێك بەدەست‌و بەرز كردنەوەی . هەڵكێشانی مووی دەم‌وچاوبەكشتەك.رەدوخستنی‌ئافرەت بەدزیی‌كەسوكاریی‌یەوەلەلایەن‌دۆستیەوەبۆ‌ئەوەی‌كەمارەی‌بكا.كردنی‌شاف‌بە كۆما .
(هەڵكرتنەوە)سرڕینەوەی‌شتی‌نوسراو. هەڵكرتنی‌مەررویزنە بۆكاروبەرخێك كە دایكیان نەمابێ .
(هەڵكرتەیی)تیپلكردنی‌هەڵمات بە جۆرێك كە لە زەویی بەرزبێتەوە .
(هەڵكرران) داكیرسان‌و‌كرر‌كرتنی ئاكر.بریتی‌یەلەدەو‌لەمەندبوونی‌یەكێك زووبەزوو:ئیسار‌كەس‌زوو[هەڵكررا].

(هەڵكرسان) هەڵكیرسان .
(هەڵكرساندن) هەڵكیرساندن .
(هەڵكرسانن) هەڵكیرساندن .
(هەڵكرسیاو) د. هەڵكیرساو .
(هەڵكوتن) مدح .
(هەڵكوزان) هەڵكۆزیین .
(هەڵكوزیین)هەڵێنجانی‌ئاوله‌بیر یا له حەوز .
(هەڵكوستن) هەڵكۆزیین .
(هەڵكوشیین)كوشیینی‌شت‌پرربەچنگ
(هەڵكولۆفتن)كوشیین‌و‌بەیەكادانی‌شت بە دەست .
(هەڵكولۆفیین) هەڵكولۆفتن .
(هەڵكوواستن) هەڵكۆزیین .
(هەڵكەرران)هەڵچوون بەقەد دارو درەخت‌وشوێنی بەرزا .
(هەڵكەرراندنەوە) ئەم‌دیو ئەودیو كردنی‌شت.دەركردنی‌یەكێك لەژێر فەرمانی یەكێك .
(هەڵكەررانەوە)ئەم‌دیوئەودیوبوونی شت . ئاووردانەوەی‌كیاندار‌بەم‌لاو بەم‌لایا دەرچوون‌لەژێرفەرمانی‌یەكێك
(هەڵكەرراوە)شتێكە‌كەهەڵ‌كەڕابێتەوە
(هەڵكێررانەوە)ئەمدیوئەودیو‌كردنی

شت. پەشیمان کردنەوەی یەکێك لە یەکێك

(هەڵگێررودا گێرر) ئەم دییو ئەودییو کردنی شت .

(هەڵگێرروەرگێرر) هەڵگێرروداگێرر

(هەڵگێرسان) داگیرسانی ئاگرو چرا. بریتی یە لە دەست پێ کردنی جەنگ وهەرا

(هەڵگێرساندن) داگیرساندنی ئاگرو چرا . بریتی یە لە دامەزراندنی جەنگ و هەرا .

(هەڵگیران) رەدوو کەوتنی ئافرەت بۆ پیاو .

(هەڵگیراو) شتێکە کە هەڵگیرابێ . ئافرەتی رەدوو کەوتوو .

(هەڵگیریاك) د. هەڵگیراو .

(هەڵلاّ) هەراوهوریا. [هەڵلاّهەڵلاّ] هەراو هوریای زۆر .

(هەڵلمبلڵم) رۆیشتن پێ بە پێ بەم رەنگە یا ژنەی ئەوپێ یەی کە ئەی گوێزییتەوە بیینوو سێنییت بە پەنجەی ئەویتر تەوە .

(هەڵلووشان) د. هەڵلووشیین .

(هەڵلووشیین) هەلمژیینی شت بەدەم بەلو... ەجۆرێك کەدەنگی لێوە بێ

(هە... ز... رزیین لەسەرما یا لە ...رسا .

(هەلم) شتێکەوەك دووکەڵ لە تەرری و گەرمیی پەیا ئەبێ .

(هەلمات) شتێکی خرری لووسی پچکۆلانە یە لە بەرد یا لە شووشە منال یاریی پێ ئەکات .

(هەلماتان) د. هەلماتین .

(هەلماتین) یارییکردن بە هەلمات

(هەلماسیان) د. هەلاّوسان .

(هەلماسیین) د. هەلماسیان .

(هەلمالران) کورجبوونەوەی داوێن و دەرەلنگی کالاّ .

(هەلمالیان) د. هەلمالران .

(هەلمالیین) کورجکردنەوەی قۆلی کالاّ یا داوێن و دەرەلنگ .

(هەلماو) ئاوێکە کە بە هەلم گیرابێ « ئاوی مقطر » .

(هەلمژاردن) هەڵژماردن .

(هەلمژتن) هەلمژیین .

(هەلمژیین) هەڵلووشیینی شت بەدەم یا بە لووت بە توندیی .

(هەلمـ ان) هەڵ ئاوسان .

(هەلمساو) هەڵ ئاوساو .

(هەلمشتن) هەلمژتن .

(هەلملیپسان) ماچکردن بە تاسەو

هه‌لمژینه‌وه .
(هه‌لملییسیین) هه‌لملییسان .
(هه‌لمه‌ت) په‌لامار .
(هه‌لمه‌تبردن) په‌لامار دان .
(هه‌لمه‌تدان) هه‌لمه‌تبردن .
(هه‌لمه‌تده‌ر) كه‌سیكه كه هه‌لمه‌ت به‌ریٚ .
(هه‌لمه‌ته‌كاسه) بریتی‌یه‌له‌مه‌ردومی خوٚ تیٚ‌هه‌لقورتیٚن له هه‌موو كاریٚكا . بریتی‌یه‌له‌مه‌ردومی زوٚرخوٚری چنوٚك.
(هه‌لمه‌قوٚ)جوٚره‌یاری‌یه كه په‌هه‌لدان وكرتنه‌وه‌ی‌چه‌ن به‌ردیكی‌وورد ئه كریٚ
(هه‌لمه‌قووت) د. قووتدانی شتی كه‌رم.
(هه‌لمه‌له) ه . هیٚرو
(هه‌لمیزان) به‌پیوه‌میز كردنی هیٚندیٚ كیاندار به‌قه‌دشتیٚكی به‌رزا .
(هه‌لمییزتن) هه‌لمیزان .
(هه‌لنان)هه‌لپه‌ساردن.مدح كردن .
(هه‌لناویین) د. هه‌لسوونی شتیٚك له شتیٚك .
(هه‌لنج) د. هیٚلنج .
(هه‌لنكافتن) با . هه‌له‌نكووتن .
(هه‌لنواروییٚن) هه‌لروانیین .
(هه‌لنوٚشیین)د.خواردنه‌وه‌ی شتی شل
(هه‌لنووتن) هه‌له‌نكووتن .
(هه‌لنووزان) له‌خواپارانه‌وه له‌كه‌ل نووزه‌وده‌ست‌به‌رز كردنه‌وه‌وچاوبرریینه ئاسمان .
(هه‌لنیشتن)خوٚكزوٚله كردن و سه‌نكنانه زه‌ویی بالنده له‌شه‌وا .
( هه‌لوٚ ) بالنده‌یه‌كی راوكه‌ری درری كوٚشتخوٚری تییژ باله .
( هه‌لوا ) حه‌لوا .
(هه‌لواستن) هه‌لواسیین .
(هه‌لواسران) بوونی‌شت به‌جوٚریٚك كه هه‌لواسرابیٚ .
(هه‌لواسراو) شتیٚكه‌كه هه‌لواسرابیٚ
(هه‌لواسیین) به‌ندكردنی شتیٚك‌به به‌رزی‌یه‌كه‌وه .
(هه‌لوایی) حه‌لوایی
(هه‌لوٚدان) د. هه‌لدانه‌وه
( هه‌لوٚدرریین ) هه‌لدرریین .
(هه‌لوٚرك) د. جولانه‌ی كورییس یا دار یا ئاسن .
(هه‌لوٚل) شتی بوٚشی كلوٚر .
(هه‌لوو) هه‌لووژه ره‌شه .
(هه‌لووجه) هه‌لووژه .
(هه‌لووچكه) هه‌لوو .

(هەلووچە) ه . هەلووژە .

(هەلووربلوور)یاریی‌یەکی منالانەیە بە دانیشتنەوە بە ریزقاچ دریژ ئەکەن یەکێکیان بەقاچی هەموویانا ئەمالێ و ئەلێ:[هەلووربلوورتەکامەزەردوسوورو شەمامە،ئاوەبەرە،دەنکەزەرە،پێ‌لابەرە مێخم کوتا ، مێخ هەلبەزیی ، تییکەی راستم‌ئەوەی‌کەزیی] ئنجالەسەرقاچی کامیان‌برایەوەئەوقاچەهەلئەکێشرێ تا دوایی .

(هەلوورکە) د. دییلانێ .

(هەلووژە)مییوەیەکی خرری مزری ناورەقی زەرد یا مۆرە

(هەلووژەررەشە)جۆرەهەلووژەیەکی رەشباوە .

(هەلووژەزەردە)جۆرەهەلووژەیەکی زەردە .

( هەلووژەسییقەتورەیی ) جۆرە هەلووژەیەکی‌سەوزکاری‌گەورەی‌مزری رەقە .

(هەلووشە)کوڵێکی کوێستانی بۆنخۆشی جوانە .

(هەلووشیین) هەلکوشیین .

(هەلووك)دارێکی کورتی‌دا دراوە، منالان لە یاریی، هەلووکێندا بە [ دار

هەلووك] پیائەمالن‌وەلەسەرشاردووری ئەخەنەوە .

( هەلووکان ) د. هەلووکێن .

(هەلووکێن)یاریی کردن بەداروهەلووك

(هەلوولیین)وولیینی‌شت‌بەسەریەکا بە زۆریی .

(هەلوهاووردن)د.رشانەوەوهێنانەوەی خواردن .

( هەلوەران ) هەلوەریین .

( هەلوەراندن ) داتەکاندنی کەلای درەخت‌ودەنکی‌هەناروشتی‌تر .

( هەلوەریین ) کەوتنە خوارەوەی کەلاو بەری درەخت .

(هەلوەزانەوە) د. هەلبەزیینەوە .

( هەلوەزنیین ) هەلوێزنیین .

(هەلوەزیینەوە) د. هەلبەزینەوە .

( هەلوەژارتن ) د. هەلبژاردن .

(هەلوەسان) هەلوەستان .

(هەلوەست)هەلبەست . ویستانێکی کەم بە دیار شتێکەوە .

(هەلوەستان)ویستانی‌یەکێك بەپێوە لەبەردەمی یەکێکا کە دانیشتبێ .

(هەلوەستن) د. هەلبەستن .

(هەلوەستە) هەلبەستە .

(هەڵوەشان) لەیەکبرونەوەی پارچەی شت .

(هەڵوەشاندن) هەڵدانەوەی جێکای داپۆشراو. لەیەك کردنەوەی پارچەی شت راوەشاندن: دەست [هەلمەوەشێنە]

(هەڵوەشاندنەوە) بریتی یە لە تێکدانی کارێك .

(هەڵوەشانن) د. هەڵوەشاندن .

(هەڵوەشانەوە) بریتی یە لە تێکچوونی کارێك .

(هەڵوێزنیین) کەلاەکردنی کوریپس و بەستنی .

(هەڵوێست) شوێنێکی تایبەتی یە کە مەردوم تیا بوەستن « موقف » .

(هەڵوێستان ) هەڵوەستان .

(هەڵە) کیاندارێکە کەلە کاروبارا لە بەرتێ نەبیینی تێ بکەوێ. بێژنکر قەلبییری شاش . شتی ناراست .

( هەڵهاتن ) هەڵاتن .

(هەڵهاتوو) هەڵاتوو .

(هەڵهانیین) هەڵهێنان .

(هەڵهانیینەوە) هەڵهێنانەوە .

(هەڵهاووردن) هەڵهێنانی شت .

(هەڵهاووردنەوە) هەڵهێنانەوە .

(هەڵهاویشتن) هەڵاویشتن .

(هەڵهاوییتن) هەڵاوییتن .

(هەڵەباش) کیانداوی هەڵەی جلفرر.

(هەڵەبوون) رێ وونکردن .

(هەڵەپاس) سەکی هەڵەوەرر .

(هەڵەت) شوێنی سەخت لە شاخ .

(هەڵەتانج) بالندەیەکی ئاویی سوورو سپی زۆر جوانە لەقاز پچووکترولەمراویی کەورەترە .

(هەڵەخەرج) د.مەردومی دەست بڵاو

(هەڵەداوان) رۆینی بەپەلەو پەشۆکاویی

(هەڵەرە) د. هەڵووکێن .

(هەڵەشە) هەڵەباش .

(هەڵەشەیی) جلفرویی کیاندار .

(هەڵەفە) قوڵفە .

(هەلەقمەلەق) د.هەللەقمەللەق .

(هەڵەك) ز. ئەلقەی ئاسن وشتی تر.

(هەڵەکار) کەسێکە لە کاروباریا هەڵەی زۆربێ .

(هەڵەکردن) پەلەیەل کردن . غەڵەت کردن: هەڵەت زۆرە لە نووسیینا یا لە قسە کردنا یا لە ژماردنا .

(هەڵەکۆك) کیایەکی بەهاریی یەکەلای وەك بیی وایە بنکێکی شیرینی خۆشی هەیە

( هەلەکە ) د. هەلەکەسەما .

( هەلەکەسەما ) مشك کره .

(هەڵەکەرر) د. کەسێکە کە زۆر بکەرریّ وریّی بکەوێتە هەموو شوێنێك

(هەڵەم) تریّ یەکە کە دەنکەکەی ناو بەناو کەورە نەبوو بیّ، وە بەووردیی مابێتەوە

(هەڵەمکردن) وەرینی بەرسییلە لە کاتی ررشانەوەیا .

(هەڵەموت) کێوی زۆرسەختی هەزار بە هەزار .

(هەڵەموور) با . ژییلەمۆ .

(هەڵەنکووتن) هەڵئەنکوتن .

( هەڵەودان ) د هەڵدانەوە .

(هەڵەوکەرر) هەڵەوکێرر .

(هەڵەوکەررانەوە). دهەڵکێررانەوە

(هەڵەوکەرریان) د. هەڵکەررانەوە

(هەڵەوکێررانەوە) د. هەڵکێررانەوە

(هەڵەوهاوەردن) د هەڵهێنانەوەی شت بە هێڵنج .

(هەڵەوەرر) سەکی هەلەپاس. بریتی یە لەمەردومی دەم پیسی بیّ شەرم .

(هەڵەوەرریی) زۆرووتن بە بیّ شەرمانە

(هەڵپەلووك) با . بەلاّلووك .

(هەڵپەلە) جۆرە قرییوەیەکە ژنان لە شایی دا ئەیکێشن .

(هەڵپەلەکێش) کەسێکە لە شایی دا هەڵپەلە بکێشێ .

( هەڵپەلە کێشان ) قرییوە کێشان لە شایی دا .

(هەڵەهەل) قسەکردن بە پەلەو دەنکی بەرز .

(هەڵهێنان) بەرزکردنەوەی پێلووی چاو. کردنی هێلکە بە جووجەڵە بەهۆی کرر کەوتنی باڵندە وە لەسەری یا بە هۆی ماکیینەوە . دۆزیینەوەی قسەی ناو دڵ وشتی شاراوە: ئەوی لەدڵمایە یائەوی لەمستمایە [هەڵی بێنە] .

(هەڵهێنانەوە) برریینی ملییوان و نافەك بەمەقەست. ررشانەوەو هێنانەوەی خواردنی دەروون .

(هەڵهێنجان) هێنانە دەرەوەی ئاولە بییر بە دۆلچەو کوورییس .

(هەڵەیی) تیّ نەبیینی لەکاروبارا .

(هەلیسکان) هەڵخلیسکان .

(هەلیسە) ل . هەرییسە .

(هەڵیّنجان) هەڵهێنجان .

(هەلینك) دەرەلنکی دەرپیّ .

(هەڵییتر) هەڵییترك .

(هەلییترك) كارووش .
(هەلییتو پەلییت) د. خلییتو پلییتی ناو مال .
(هەلییز) ه . مەشكە .
(هەلییزەبرە) ه . مەشكەدررە .
(هەلییلە) جۆرەدەرمانێكی تفتوتالی رموانی كەرمیانی یە . جۆرەگیایەكی بالاّ بەرزە شتێكی درێژ كۆلەی دانە دانە ئەكرێ ، دانی پێ ئەئاژنرێ .
( هەلیین ) هەلهێنان .
(هەلیین) كۆل .
(هەم) دییسان .
( هەمار ) د . عەمار .
( هەمازاو ) د. عەماراو .
(هەماركردن) د. عەماركردن .
(هەمارەپۆ) د. عەمارەپۆ .
( هەماز ) ل . منالدان .
(هەمان) ووتەیەكە بۆ شتێك بەكار دێنرێ كەلەناوەندی قسە كەروقسە بۆ كراوالەوەپێش باسكرابێ و ناسرابێ : ئەوپیاوەی كەدوێ شەوهاتەلات ئیمشەو [هەمان] پیاوهاتەلای منیش . هەموان .
(هەمانە) پێستی دەرهاتووی خۆشكراوی مەرروبزنە كەشتی ووشكی تێ ئەكرێ

(هەمبان) هەمانە .
(هەمبانە) هەمانە .
( هەمبەر ) بەرامبەر .
(هەمبێز) ز. باوەش .
(هەمپا) ز. بەرامبەر .
(هەمتا) هاوتا .
(هەمتایی) هاوتایی .
(هەمتیی) هەمدییسان .
(هەمدەم) هاودەم .
( هەمدەمیی ) هاودەمیی .
(هەمدیسرۆ) هەمدییسان .
(هەمدییس) هەمدییسان .
(هەمدییسان) دووبارە .
(هەمدییسانەوە) هەمییسان .
(هەمررا) هاوررێ .
(هەمرراز) هاوررراز .
(هەمررایی) هاورێیی .
(هەمرۆ) د. هەرمێ .
(هەمرێشك) ئاژەلی كەم شییر .
( هەمزار ) هاودەم .
(هەمزەبەكیی) جۆرێكەلەبەری دار مازوو .
(هەمس) بزنومەرری رەش وسوور.
( هەمسایە ) دراوسێ .

(هەمکە) د. حەمکە .
(هەمنك) ئەو کوریسە کورتانەیە کە داوینی دەواری پێ ئەبەستری بەسنگەوە
(هەموانیی) بۆکشتیی « عمومی »
(هەموو) ووتەیەکە بەکار دێنرێ بۆ داکرتنەوەی أفراد یا بەشەکانی شتێك: [هەموو] کەسێك ئەمرێ، یاهەنارە کەم [هەموو] خوارد .
(هەمە) ئێمە . هەموو: هەمەرەنگ
(هەمەمە) غەوغا .
( هەمیان ) د. هەموان .
( هەمیی ) ز. هەموو .
(هەمییر) ه . هەوییر .
(هەمییز) باوەش .
(هەمییس) هەمییسان .
(هەمییسان) هەمدیسان .
(هەمییسانەوە) هەمییسان .
(هەمییشە) ووتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ تێکررایی کات « عمومی زمان » : [ هەمییشە ] ئەخوێنمەوە
(هەمییشەبەهار) کولێکی زەردی پەررە پەررەی کەلاّپانی هەمییشە سەوزە .
(هەمییشەوەوی) د ژنێکە کە زۆر شوو بکا .

(هەمییشەیی) شتی بێ سەرەتاو بێ پایان
(هەن) ووتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ بوونی چەند شتێك : کێلاس و ئالوو بالوولە سلیمانی هەن .
(هەنا) هێزی چاوودەست: ئاچاو[هەنا] ئەکات سەوزیی یە، یاتادەست[هەنا]ئەکات کەلەکەتە. ئارام: ئەمشەو[هەنا]م نەداوە.
(هەنار) میوەیەکی خررە بە قەد پرتەقاڵێك ئەبێ ناوەکەی پررەلەدەنکی خۆشی ئاودار. درەختی هەنار.
(هەناردن) ناردن .
(هەناردنەوە) ناردنەوە .
(هەناسکەبررکێ) هاژیان .
(هەناسکەبررە) هەناسکە بررکێ .
(هەناسکەبررێ) هەناسە بررکێ .
(هەناسە) بایەکە کە بەدەم یا بەلووت وەربگیرێ .
(هەناسەبررکە) هەناسە بررکێ .
(هەناسەبررکێ) هەناسکە بررکێ .
(هەناسەبررە) هەناسە بررکێ .
(هەناسەبررین) بریتی یە لە لێدان لەیەکێك بەجۆرێك کە نەتوانێ هەناسە بدا. بریتی یە لە کونبرر کردنی شوێنێك .
(هەناسەدان) بردنەژوورەوەو هێنانە

دەرەوەی بابەدەم یا بەلووت. بریتی یە لە کەمێك پشوودان و حەسانەوە : دانیشە [هەناسەیەك] بدە . بریتی یە لە هاتوچۆ کردنی بالەشوێنێکەوە: پەنجەرە کە لە کەلێ لاوە [ هەناسە ئەدا ] .

(هەناسەدانەوە) دەر کردنی هەوا لە سیی لەرێگای لووتەوە .

(هەناسەدەرهاتن) هاتنە دەرەوەی هەناسە، ئەم ووتەیە هەر لەنەفیا بەکار دێنرێ: سەرمام بووە[هەناسەم دەرنایەت]

(هەناسەسارد) بریتی یە لەمەردومی کلۆلی بەدبەخت .

(هەناسەسوار) کەسێکە کە هەناسەی بە گران دەرچێ .

(هەناسەسواربوون) بریتی یە لەهەناسە بڕرکێ .

(هەناسەکێشان) هەناسە هەڵ کێشان.

(هەناسەهەڵکێشان) بردنە ژوورەوەی با بۆناودەروون. بریتی یە لەخەفەت خواردن: فیسار کەس هەر[هەناسەهەڵ ئەکێشێ]

(هەناف) با . هەناو .

(هەناو) هێزوتەوانایی .

(هەنجن) شتی ووردی جنراو، [هەنجن هەنجن] شتی زۆر ووردی جنراو .

(هەنجنین) جنین و وورد کردنی شت بەسەر یەکا .

(هەنجووجك) د. ناوکی هەرمێ .

(هەنجیر) مێیوەیەکی خرری نەرمی زەرد یا مۆری شیرینە . درەختی هەنجیر .

(هەنجیران) کاتی کەرمەی هەنجیر.

(هەنجیرباوا) د. مۆز .

(هەنجیرەوەرە) هـ. باڵندەیەکە لە چۆلەکە کەورەترە هەنجیر ئەخوات

( هەند ) هێند .

(هەندرێشە) گیایەکی بەهاریی یە لە پێچك ئەچێ بەڵام ئەم لقی زۆرە کە پێی ئەڵێن قووڕادە .

( هەندە ) هێند .

( هەندەك ) هێندێك .

(هەندێك) کەمێك لەشتێك .

(هەنسك) هەناسە بەدەم گریانەوە ، [هەنسکە هەنسك]هەنسکی یەك لەسەر یەك .

(هەنسکەبڕرکێ) هەناسەبڕرکێ .

(هەنسکەبڕرە) هەنسکەبڕرکێ .

(هەنسکەبڕرێ) هەنسکەبڕرکێ.

(هەنك) شۆخیی و گاڵتەچیتیی .

